# بگە بە کاروانی صالحان

## تا بەردەوامی ئەو ڕێگایە کاروانچی لێ نەبڕێت و کوێر نەبێتەوە

نووسینی

مامۆستا عمر توفیق الخطاط



نارین



## بگە بە کاروانی صاڵحان

تا بەردەوامی ئەو ڕێگایە کاروانچی لێ نەبڕێت و
کوێر نەبێتەوە

ناوی کتێب: بگە بە کاروانی صالحان تا بەردەوامی ئەو ڕێگایە کاروانچی لێ نەبڕێت و کوێر نەبێتەوە
نووسینی: مامۆستا عمر توفیق الخطاط
نەخشەسازی ناوەوە: محمد علی احمد
ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز
شوێنی چاپ: بەیروت ـ لوبنان
ژمارەی سپاردن:

ISBN 9953-85-227-8

نارین
بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenco.com
E-mail: nareen@nareenco.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# بگە بە کاروانی صاڵحان

## تا بەردەوامی ئەو ڕێگایە کاروانچی لێ نەبڕێتو کوێر نەبێتەوە


نووسینی

مامۆستا عمر توفیق الخطاط



ناریـن

قال مالك بن الدينار رحمـه الله

اللـهم اصـلحت الـصالحين فاصـلحنا حتى نكون صالحين

الجامع لشعب الايمان (٣٥/١١)

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله الذي أحبه الصالحون والصلاة والسلام على من قلده الصالحون فأصبحوا صالحين وعلى الله وصحبه واتباعه الصالحين اما بعد:

کاتێك مندالْ بووم تەمەنم (٨–٩) سالآن بوو باوکم خۆشی دەویستمو لەگەڵ خۆی دەیبردم بۆ شوێنان، کاتێك هاورێیەکی لێی دەپرسی: ئەمە کوڕی خۆتە؟ باوکم دەیووت بەڵێ، ئەویش دەیووت: خوا صاڵحی بکات إنشاء الله!

من هەر لەو کاتەوە ئەو وشەیەم زۆر خۆش ویست، بەڵام ماناکەیم نەدەزانی بۆیە لە باوکم دەپرسی: باوکە گیان یانی چی دەڵێن خوا صاڵحی بکات؟ ئەویش پێدەکەنیو دەیووت پێم: کوڕم ئەوە دوعایەکی خێری زۆر گەورەیەو ئەگەر یەکێ خوا بۆی بکاتو منداڵەکەی صالح بێت دەبێتە کوڕێکی گوێڕایەڵ بۆ خواو باوكو دایكو مامۆستاکانیو لە خۆی گەورەتر!!

ئیتر لەو ساتە وەختەوە.. هەوڵم دەدا بەو جۆرە بم تا ئەو نازناوە گەورەیە بە نسیبی خۆم بکەم، هەرچەندە کە گەورە بووم بۆم دەرکەوت کە ڕێگای صاڵحان بەو جۆرەش ئاسان نیە کە بتوانم بەو پێناسە کورتەی باوکم بگەمو هەوڵو تێکۆشانی شەوو ڕۆژو ڕۆژوی قرچەی هاوینو شەونوێژی شەوە ساردەکانو قورئان خوێندنو زیکری بەردەوامو خۆپاراستن لە گوناهی گەورەو بچووکی دەوێ..

بەڵام هەرچۆنێك بێت ـــ صالّحانم زۆر خۆش دەویستو حەزم بە بیستنو لەبەركردنی وتەكانیان هەبوو پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: (المرء مع من أحب)واتە مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستانیدا حەشر دەكرێت لە قیامەتداو منیش بەو هیوایە بووم.

منیش وەك ئیمامی شافعیم لێ هات كە خۆشم دەویستن بەڵام لەوان نەبووم وەك دەفەرمووێت:

| | |
|---|---|
| أحب الصالحين ولست منهم | لعلي انال بهم شفاعة |
| واكره من كان بضاعته المعاصي | ولو كنا سوياً في البضاعة |

خوشكانو برایانی هاوبڕوام، من لەم كارەمدا مەبەستم ئەوە نەبووە وەك نووسەرێك بەرهەمەكانم زۆر بكەمو خۆم بە گەلانی موسڵمان بناسێنم! نەخێر!

بەڵكو خۆم هەستم دەكرد كە نەخۆشم! نەخۆشی جەستەیی نا، نەخۆشی جەستەیی ئاسانە، بەڵكو نەخۆشی ئیمانی، نەخۆشی بەندایەتی، نەخۆشی باوەڕ لاوازیو دڵ مردوویی، بۆیە ئەم كارەم وەك چارەسەرێكی دڵی خۆمو بۆ خۆم نووسیو هەموو جارێك دەچوومە حزووری صالّحان لە مەشهەدێكی كورتدا لە دیوەخانە ئیمانیەكەیان دەمامەوە هەستم دەكرد برینەكانی دڵم وردە وردە گۆشتەوژوو دەهێننەوەو سارێژ دەبن!!

ئیتر لەو ڕۆژە بە دوا عەشقیان بووم.. زۆر حەزم دەكرد بەردەوام لە لایان بم بەڵام شایانی كۆڕو كاروانیان نەبووم.. چونكە نەخۆش بووم.. نوێژم دەكرد چێژی نەبوو! زیكرم دەكرد تامی نەبوو! قورئانم دەخوێند دڵم ڕەق بوو هەستو هەناوی نەئەهەژاندم، و شەونوێژم بۆ نەدەكرا! ڕۆژووی سوننەتم بۆ نەدەگیرا! كەسوكارو هاوڕێكانم دەمردنو لەگەڵ تەرمەكەیاندا دەڕۆیشتم بەڵام دڵم ڕانەدەچڵەكاو لە مردن نەدەترسام!.

پێغەمبەری خوام خۆشدەویست (ﷺ) بەڵام ئامادە نەبووم هەموو فەرموودەكانی جێبەجێ بكەم!

بە کورتی هیچ پەرستش‌و لەگەڵ خوادا ژیانم هیچ تام‌و چێژێکی نەبوو..

بۆیە بۆ یەکەم جار کتێبی نووسەری مەزن‌و خواناس ابن جەوزیم بینی بە ناوی (صفة الصفوة)و دانیشتم خوێندمەوەو هەستم کرد چاوی پڕکردم لە ئاو! هەستم کرد حەز بە خواپەرستی‌و بەندایەتی دەکەم! چێژ لە هاتوچۆی مزگەوت‌و نوێژی بە کۆمەڵ وەردەگرم!

هەستم کرد من کۆمەڵێك هاوڕێی نوێم دۆزیوەتەوە کە زۆر جیاوازن لە هاوڕێکانی چواردەورم! ئەو هاوڕێیانەم هەیان بوو چەندان سەدە لەمەوبەر مردبوون، بۆیە حەزم کرد لە چاپی بدەم تا ئەم ڕابوونە ئیسلامیە جوانەی بە جوهدو ناڕەحەتی هەموو لایەك هاتۆتە کایەوەو زانای خواناس‌و صالحانی لێ دروست ببێت‌و کاروانی موبارەکی صالحان لە کوردستانەوە سەرهەڵبداتەوەو تیشك‌و ڕووناکیەکەی هەموو نیشتمانی عەرەبی‌و وڵاتی فارس‌و گشت جیهان بگرێتەوە – إنشاء الله–.

ئەم کارەی من زۆر کەمە! خزمەتێکی زۆر بچووکە.. بەڵام ئەگەر خوای گەورەو – عز وجل – بەرەکەتی تێ بخات دڵنیام دەورێکی زۆر گەورەی دەبێت‌و ڕۆڵێکی موعجیزەیی دەبینێت.. وەك کاری کردە خۆم‌و دووبارە زیندووی کردمەوەو گیانێکی کردەوە بە بەرمدا..

داواکارم لە هەموو خوێنەرێکی بەڕێزم.. خۆشەویستم.. لە هەر ئاستێکدا بن ئەگەر ئەم کتێبەیان خوێندەوەو سوودیان لێ وەرگرت بە ئازایەتی منی نەزانن بەڵکو داوایان لێ دەکەم دەستەکانیان بەرز بکەنەوە بۆ لای خواو دوعایەکی خێرم بۆ بکەن کە لە سزای سەختی خۆی بمانپارێزێت‌و بە ڕەحم‌و بەزەیی خۆی لە ساحەی مەحشەردا لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)و صالحاندا حەشرم بکات لەگەڵ هەموو خوشکان‌و برایانی موسڵمانمدا..

هەروەها داوایەكی برایانەم هەیە لێیان كە ئەم كتێبە بۆ خێزانو كوڕو كچەكانیانو خوشكو براو باوكو دایكیان بخوێننەوە چونكە هەست دەكەم تۆوی صالّح بوونی تێدا چێنراوەو كاریگەری خۆی دەبێت إنشاء الله.

لە كۆتاییدا زۆر زۆر سوپاسی برای بەڕێزو خۆشەویستم دەكەم كاك فائق خاوەنی كتێبخانەی نارین لە هەولێر كە هەستا بە پێشكەشكردنی دەورەیەكی تەواوی (الجامع لشعب الایمان)ی ئیمام بەیهەقیو لەم كارەمدا سودێكی گەورەم لێ وەرگرت — فجزاه الله بألف خیر —.

عمر توفیق الخطاط
١٠ی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٣٠
٢٠٠٩/٩/١/هەڵەبجە
مزگەوتی فیردەوس

# بەشی یەکەم

# ئەو پێنج خاڵەی صاڵحانی پێ ناسراوە و بە (دأب الصالحین) ناوبراوە:

١- (ذکر) و یادکردنی خوای ـ عزوجل ـ بە بەردەوامی.
٢- گریان و فرمێسك ڕشتن لە ترسی خوا و نەهامەتیەکانی قیامەت.
٣- خۆشەویستی قورئان و خوێندنەوەی بە بەردەوامی.
٤- شەونوێژ، بەچێژترین بەندایەتی خوای ـ عز وجل ـ ە.
٥- ڕۆژووی سوننەت و ژیانی بەردەوامی لە خزمەت ڕۆژوودا.

# یەکەم

## (ذکر) و یادکردنی خوای ـ عزوجل ـ بە بەردەوامی

لە ژیانی دنیاماندا هەموو کەسێك زیکر دەکات.. دەوڵەمەندەکان هەمیشە زیکر و یادی پرۆژە بەرهەم هێنەکانیان دەکەن و هەردەم قەرزەکانیان حسێب دەکەن کە لە لای خەڵکیە، وە هەمیشە دەرگای قاسەکانیان دەکەنەوە و بە دزی هەژارانەوە پارەکانیان دەژمێرن و بۆنی دەکەن!!

جۆرێکی تر لە خەڵکی زیکر و یادی خۆشەویستەکانیان دەکەن و هەمیشە خۆیان دەکەن بە قوربانیان و وێنەکانیان دەخەنە سەر چاویان و شەوانە بە یادی ئەوانەوە خەو دەچێتە چاوەکانیان و کاتێك قسەیان لەگەڵدا بکەیت بە دەم وەڵامت دەدەنەوە بەڵام بە دڵ لە لای ئەوانن و ئاگایان لای تۆ نییە!!

ئەم زیکرانە و چەندان زیکری تریش وەك زیکری دایك بۆ کۆرپەی لەدەستچووی.. هەموویان زیکرن! بەڵام هیچ یەکێك لەو زیکرانە شایانی ئەوە نییە کە ئەو هەموو کاتەی بۆ بکوژرێت و دونیا هەرچۆنێ ببێت دەڕوات، چ بە دەوڵەمەندی، چ بە هەژاری...

برای گەنج.. هاوسەرگیری ئەوە ناهێنێت تۆ غەم و هەمو بیر و ئەندێشەت هەمووی بە هەدەر بەریت لە پێناو ژن هێناندا.. برای دەوڵەمەند پارە ئەوە ناهێنێت تۆ زیکری بکەیت! بەڵکو شایانی ئەوەیە زیکری ئەو خوایە بکەیت کە پارەکانی پێداویت وەك سوپاس کردنی.

بەڵام زیکری ڕاستەقینە و زیکری شایستە ئەوەیە کە بەردەوام دڵت لای ئەو کەسە بێت کە ئەم بوونەوەرە گەورە و فراوانەی دروست کردووە.. و ژیان و مردن بە دەستی ئەوە.. و بەڵگەی ژیری و عاقڵی و تێگەیشتنە کە — ٢٤ — سەعات لە یادتان بێت و بە دڵ و مێشکی لە لای پەروەردگارەکەی بێت..

دەی کەواتە شایانی ئەوەن کە خوایش لێیان ڕازی بێت و پاداشتی زۆر گەورەی بۆ ئامادە کردبن.

* وەك دەفەرمووێت: ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الاحزاب: ٣٥). واتە: ئەو پیاو و ژنانەی کە زۆر و لە ڕادە بەدەر یادی خوا دەکەن:خوایش لە پاداشتیاندا لێخۆش بوون و پاداشتی زۆر گەورەی بۆ ئامادە کردوون.

لە ڕۆژی ترسناکی حەشردا.. ئەوانە بێ خەمن.. خۆر لێیان نادات.. لە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگاردا شانیان لێ داهێلاوە و سەیری ئەو خەڵکە داماوەی گۆڕەپانەکە دەکەن.. وەك پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ) دەفەرمووێت: ((سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل الا ظله، وذكر في اخرهن ((ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه))،[1] واتە: لە ڕۆژێکدا کەسێك سێبەری نییە کە بچێتە ژێریەوە و لە گەرمای خۆری ئەو ڕۆژە ناهەموارە خۆی بپارێزێت.. ئا لەو کاتەدا خوای –عز وجل– حەوت کۆمەڵ دەست نیشان دەکات و لە ڕێزەکان دەیانهێنێتە دەرەوە بەرەو سێبەری عەرشی ئەعلا دەیانبات دەی خۆشبەختی بۆ ئێمە ئەگەر یەکێك بین لەو حەوت کۆمەڵە.. کە حەوتەمینیان کەسێکە بە پەنهانی زیکر و یادی خوا دەکات و بە ڕادەیەك چاوەکانی وەك قۆخ سوور دەبنەوەو ئاویان لێ دێتە دەرەوە و دەست دەکات بە گریان..

برای خۆشەویستم دەبێ من و تۆ چ نرخێکمان هەبێت؟ لەوانەیە جگە لە گەڕەکەکەی خۆمان کەس نەماننناسێت و باسمان نەکەن، چ جای فەرمانڕەوا و کاربەدەستە باڵاکانی وڵات! دەی بۆ شتێکت پێ نەڵێم ئەگەر بیکەیت گەورە و فەرمانڕەوای هەموو جیهان باست بکات و لە یادیا بیت ئەویش ئەوەیە تۆ زیکر و یادی ئەو بکە چ لە دڵی خۆتدا چ لەناو خەڵکیدا..

ئەمەش قسەی من نییە، بەڵکو فەرموودەی پێغەمبەرە نازدارەکەتە (ﷺ) کە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێت:

---

١ متفق عليه.

قال تعالى: ((اذا ذكرني عبدي في نفسه ذكرته في نفسي، واذا ذكرني في ملأٍ ذكرته في ملأٍ خير من ملأه)).[١]

واتە: هەر کاتێ بەندەکەم لە دڵی خۆیدا یادم بکاتەوە منیش لە دڵی خۆمدا یادی دەکەمەوە، و هەر کاتێ لەناو خەڵکدا یادم بکاتەوە منیش لە ناو کۆمەڵێکی زۆر چاکتر لەو کۆمەڵەی ئەودا یادی دەکەم.

دەی ئیتر بۆچی لەگەڵ خەڵکی بێئاگا و دوور لە یادی خوادا بژین؟! ئەی بۆچی نەچینە ڕیزی ئەو کەسانەی خوای گەورە لە قورئانەکەیدا بە: (اولوالالباب) ناوی بردوون؟ بە کارێکی زۆر ئاسان ئەویش ئەوەیە بە دانیشتنەوە و بە پێوە و بە ڕاکشانەوە و بە خەوتنەوە زیکر و یادی پەروەردگار بکەین، وەك دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾.[٢]

* ((عن عائشة (رضي الله عنها وعن ابوها) قالت: كان رسول الله يذكر الله في كل احيانه))،[٣] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو حاڵەتەکان و کاتەکاندا زیکر و یادی خوای —عز وجل— ی دەکرد، (سبحان الله) چ پێشەوایەکمان هەیە لە هەموو کەس زیاتر زیکری خوای گەورەی کردووە، ئەمەش وانەیەکە بۆ وتار خوێنان و پێشەوایانی ئوممەت کە هەموو هۆکارەکانی بەرەو خواچوون و صاڵح بوون بەکردەوە بچەسپێنن نەك تەنها بەوتەی دەم یان بەنوسین.

* خوێنەری موسڵمان، ئایە حەزدەکەیت بچیتە ڕیزی تاکانەکان ئەوانەی کەسیان پێناگات مەگەر کەسێك وەك ئەوان لەزیکری خوادا ڕۆبچێت.. دەی گوێ بگرە بۆ پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ) کە چی دەفەرمووێت کاتێك دای بە لای کێوی جومداندا

---

١ رواه مسلم.

٢ ال عمران: الاية (١٩١).

٣ رواه مسلم.

فەرمووی: ((سيروا، هذا جمدان، سبق المفرِّدون)) قالوا: وما المفرِّدون يا رسول الله؟ قال: الذاكرين الله كثيراً والذاكرات)).[1]

واتە: بکەونەڕێ ئەمە کێوی جومدانە و تاکانەکان پێش کەوتن، هاوەڵان وتیان: تاکانەکان کێن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: ئەو ژن و پیاوانەن کە زۆر و بەردەوام یاد و زیکری خوا دەکەن.

زیکر کردن زۆر هەرزانە پارەی تێ ناچێت زۆر ئاسانە دەستنوێژی ناوێت.. تەنها جوڵاندنەوەیەکی لێوەکانی دەوێت و خوای گەورەش لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێت: ((انا مع عبدي ماذكرني وتحركت بي شفتاه)).[2] واتە: من لەگەڵ بەندەکەمدا دەبم تا زیکرم بکات و لێوەکانی بە یادی منەوە بجوڵێنێت.

ئەگەر خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی خستینیە بەهەشتەوە، ئەزانی لە چ شتێکی ژیانی دنیا پەشیمانین؟ دە گوێ بگرە بۆ پێغەمبەرە نازدارەکەت (ﷺ) و بزانە چی دەفەرموێت:

* عن معاذ بن جبل (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) ((ليس يتحسر أهل الجنة الاّ على ساعة مرت بهم لم يذكروا الله فيها)).[3] واتە: خەڵکی بەهەشت خەفەت بۆ هیچ شتێکی دنیا ناخۆن کە لە دەستیان چووبێت جگە لە خەفەتیان بۆ ئەو کاتانەی کە زیکری خوایان تێدا نەکردبوو.

* ئایا هەستت بەوە کردووە کە ئەو کاتانەی زیکر و یادی خوا دەکەیت دڵت ساف دەبێتەوە و لە ژەنگ و ژیوار پاك دەبێتەوە؟

دەی فەرموو گوێ بگرە بۆ وتەی (ابو درداء) هاوەڵی بەڕێز و دڵسۆزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و زانا مەزنەکەی وڵاتی شام کە دەفەرموێت: ((ان لكل شيء جلاء وان

١ اسناده صحيح، الجامع لشعب الايمان (٢/٢٤١).

٢ اسناده حسن، الجامع لشعب (٢/٢٤٤).

٣ رجاله ثقات، الجامع لشعب الايمان (٢/٢٤٧).

جلاء القلوب ذكر الله عز وجل)).[١] واتە: هەموو شتێك سپی كردنـەوەی دەوێـت و سـپی كردنەوەی دڵیش بە زیكر و یادی خوای –عز وجل – خاوێن و سپی دەبێتەوە.

* ئایا دەزانیت زیكركردنی بـەردەوام بەڵگەیـە لەسـەر خۆشویـستنی پـەروەردگار؟ دەی گوێ بگرە بۆ (مالیكی كوڕی دینار) كەدەفەرموێت: ((علامة حـب الله دوام ذكـره، لان من احب شيئاً اكثر ذكره ))[٢] واتە: لەنیشانەی خۆشویستنی خوایە بەردەوام زیكرو یادی بكەیت، چونكە هەركەسێك هەر شتێكی خۆش بوێت بەردەوام باسی دەكات.

* (فـتح الموصـلی) یـش دەڵـێ ئەوكەسـەی بەڕاسـتی خـوای خـۆش دەوێـت بەئەندازەی چاوتروكانێك بێ ئاگا نابێت لێی وەك دەفـەرموێت:((المحـب لله لايغفـل عـن الله طرفة عين)).[٣]

* ئەگەر حەزت كرد خـوای گـەورە خۆشـییەكانی دنیـات پـێ ببەخـشێت وەك ژن و خانوو و منداڵ و ئوتومبێل و شتی تریش، ئەوە زیكری خوا زۆر بكـە لەوانـەش زیـاترت پێ دەبەخشێت وەك خوای گەورە لە فەرمودەیەكی قودسیدا فەرمویەتی: ((مـن شـغله ذكري عن مسئلتي اعطيته افضل ماعطي السائلين)).[٤]

واتە: هەركەسێ زیكر و یادكردنی من لەپاڕانەوە و داواكاری بخات ئەوە لـەداواكاران زیاتری پێ دەبخشم.

* علی كوڕی ئەبوطالیب (ڕەزای خوای لێبێـت) لەگـەڵ فـاطمـەی خێزانیـدا دەچـنە خزمەت پێغەمبەر و داوای خزمەتكارێكی لێ دەكەن، بەڵام ئەو دەفەرموێت: ئەی چۆنە شتێكی باشترتان پێ بڵێم؟ وتیان چی یە؟ فەرمووی: هەموو ڕۆژێ بەیانیان و ئێواران (٣٣) جـار سـبحان الله و (٣٣) جـار (الحمـد لله) و (٣٤) جـار (الله اكـبر) بكـەن. عـەلی فەرمووی: لەو ڕۆژە بە دوا بۆ تەنها ڕۆژێك وازم لەو زیكرانـە نـەهێناوە، و پیاوێـك پێـی وت: تەنانەت شەوی (الصفين)یش؟ عەلی فەرمووی: تەنانەت شەوی (صفين)یش.[٥]

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/٢٥٥).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/٢٣٨).

٣ صفة الصفوة (١/٤١٧).

٤ الجامع لشعب الايمان (٢/٢٩٣).

٥ حديث صحيح الجامع لشعب الايمان (٢/٣٢٤).

* ئەوەش عوثمانی کوڕی عەفانە (ڕەزای خوای لێ بێت) و ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئەگەر دڵەکان پاك و خاوێن بن لە گەرد و تەپ و تۆزی کوفر و دوڕوویی و دنیاپەرستی، ئەوە لە زیکر و یادی خوا تێر ناخوات و بەردەوام تینووی ئەو خۆراکەیە، وەك دەفەرمووێت: ((لو ان قلوبنا طهرت لن تمل من ذكر الله)).

* خوشکی خۆشەویست.. ئەتوانیت بە دەم حاجەت شۆرینەوە.. بە دەم چێشت لێنانەوە.. بە دەم جل شۆرینەوە.. بە دەم منداڵ پەروەردەکردنەوە لێوەکانت بە زیکر و یادی خوا بجوڵێنیت و نەهێڵی هەناسەکانت بەبێ هودە بڕوات.. جارێك بە سەردان چووم بۆ ماڵی برایەکی موسڵمانم و ماوەی شەو و ڕۆژێك لەوێ مامەوە و لەو ماوەیەدا شتێکی زۆر گرنگم لە خوشکێکی ئەو برایەدا بەدی کرد، کە خوازیارم لە هەموو خوشکێکی موسڵمانی تردا بەدی بکەم..

بینیم ئەو خوشکە بە دەم سفرە ڕازاندنەوە و چێشت لێنان و خواردن و ئاو ئامادەکردنەوە هەر بەدەم خۆیەوە و بە سوکی لێوەکانی دەجوڵاند و شتێکی دەوت کە من لێی حاڵی نەدەبووم.. منیش بوو بە خەفەتم و بۆیە پێش ئەوەی بگەڕێمەوە هۆی ئەوەم لە برایەکی پرسی و ئەویش وتی: ئەو خوشکەم زۆر سەیرە.. کەس ناتوانێت وەك ئەو بێت.. شەو و ڕۆژ بە دەم ئیش و کارەوە و هەموو چرکەیەکی ژیانی زیکری خوا دەکات و من کە برای ئەوم حەسودی بەو ڕەوشتە بەرزەی دەبەم و هەرچی دەکەم ناتوانم وەك ئەو بم ((ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء)).

* هەر لەسەر ئەم شێوازە پیاوێك بە میوانی لە لای زانای خواناس (ابراهیمی کوڕی ئەدهەم) مایەوە، و دەڵێت تا بەیانی چەند جار بە خەبەر هاتم دەبینم (ابراهیم) بە خەبەرە و زیکری خوا دەکات ئیتر زۆر خەفەتبار بووم بۆ حاڵی بێئاگایی خۆم و بەم ئایەتە دڵی خۆم خۆش کرد کە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾[1].

* ئەگەر خوای باڵادەست چاکەت بۆ بکات و هاوڕێیەکی (ذکر) و هەمیشە ذکر کەرت پێ ببەخشێت ئەوە چاکەی دنیا و ئاخیرەتت دەست کەوتووە و سەیری ئەم پیاوە بکە دەڕوات بۆ سەفەری حەج:ـ

---

١ صفة الصفوة (١/٤١٧).

قال مخول: جاءني بهيم يوماً فقال لي: تعلم لي رجلاً من جيرانك يرد الحج ترضاه يرافقني؟ قلت: نعم، وبعد العودة من الحج اتيت بهيماً فسلمت عليه وقلت كيف رأيت صاحبك؟ قال: كخير صاحب كثير الذكر لله عز وجل طويل التلاوة للقرآن سريع الدمعة محتمل هفوات الرفقين، جزاه الله عني خيراً.[١]

واتە: مەخول دەڵێت: بەهیم هات بۆ لام و پێی وتم: کە کەسێکی دراوسێی خۆت کە نیازی حەجکردنی هەبێت بۆم دەست نیشان بکە تا لەم سەفەرەمدا هاوڕێم بێت، دەڵێ وتم: باشە و بۆم پەیدا کرد، و پاشی گەڕانەوەی لە حەج چووم بۆ لای بەهیم و پێم وت: هاوڕێکەت چۆن بوو؟ وتی: باشترین هاوڕێ بوو، زۆر ذکر و یادی خوای دەکرد و بەردەوام قورئانی دەخوێند و فرمێسکی هەردەم حازر بوو، و ئەزیەت و ناڕەحەتی هاوڕێکانی قبووڵ دەکرد، دەی خوای گەورە لە باتی من پاداشتی بداتەوە.

* حەز دەکەیت بزانیت خوای گەورە کەی باست دەکات و ناوت دەبات؟ دەی گوێ بگرە لەو ڕووداوەی کە سابتی بەنانی بۆمان دەگێڕێتەوە و جەعفەر ڕیوایەتی کردووە:

قال جعفر: ((أنبأ ثابت المناني عن رجل من العباد انه قال يوماً لإخوانه: إني لاعلم متى يذكرني ربي عز وجل، قال: ففزعوا من ذلك وقالوا: تعلم حين يذكرك ربك؟ قال نعم، قالوا: متى؟ قال: اذا ذكرته ذكرني)).[٢]

واتە: سابتی بەنانی دەڵێت پیاوێك لە خواناسەکان بە هاوڕێکانی خۆی وت: من ئەزانم چ کاتێك پەروەردگارم باسم دەکات! و هاوڕێکانی واقیان وڕما و وتیان: ئەزانی چ کاتێك باست دەکات؟ وتی: بەڵێ، وتیان: چ کاتێك؟ وتی: هەر کاتێك من یاد و باسی ئەو بکەم ئەویش باسی من دەکات..

ئەمە سەیر نییە، چونکە خوای عز وجل لە سوڕەتی (البقرة)دا ئەمەی چەسپاندووەو فەرموویەتی: ﴿فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ﴾، واتە: یادتان دەکەم کاتێك یادم بکەن.

---

١ صفة الصفوة.

٢ صفة الصفوة لا (١٧٥/٢).

* ڕابیعەی عەدەوی سەرمەشقێکی زۆر گەورە و مەزنە بۆ سەرجەم خوشکانی موسڵمان تا چاوی لێ بکەن و لە خۆشەویستی خوا و یادکردنی و ترسان لە ڕۆژی ناهەمواری قیامەت و ئاگری دۆزەخدا وەك ئەو وابن.. هەمیشە لە ذکرکردن ماندوو نەبووە تەنانەت ئەو شتانەیشی دەیخوارد ذکری پێ دەکردن ئەوجا دەیخواردن، دەی گوێ بگرە بۆ ئەم بەسەرهاتە کورتە:

قال عبدالله بن عيسى الطحاوي: ((ارسلني ابي طلحة الى رابعة العدوية، فدخلنا عليها وبين يديها زنبيلان احدهما فيه زبيب والاخر بندق، وسألت عنها قالوا لي: انها تسبح به وتأكل منها أحياناً)).[1]

واتە: عبداللەی کوڕی عیسا دەڵێت باوکم ناردمی بۆ کارێك بۆ لای ڕابیعەی عەدەوی‌و کاتێك ڕۆیشتینە ژوورەوە بۆ لای بینیم دوو زەمیلەی لەبەردەمی خۆی داناوە یەکێکیان پڕە لە مێوژ و ئەوەی تریان فستقی تێدابوو، یەکێك لە هاوڕێکانم پێی وتم: ئەمە ذکر و تەسبیحاتی پێدەکات و هەر کاتێکیش برسی بوو لێیان دەخوات.

* ئەی شوێنکەوتووانی محمد المصطفى (ﷺ)، خوای گەورە زیکری داناوە لەبەر دوو شت یەکەم: هەموو کاتێك موسڵمان ناتوانێت نوێژ بکات یان قورئان بخوێنێت یان حەج بکات یان بە ڕۆژوو بێت یان خێر و قوربانی بکات بەڵام هەموو چرکەیەك لە چرکەکانی ژیان موسڵمان دەتوانێت ئەم کارە گەورەیە کە (ذکر)ە ئەنجامی بدات.

چونکە باخەوان بە دەم نەمام چاندنەوە.. کرێکار بە دەم بلۆك ڕاکێشانەوە.. وەستا بە دەم بلۆك دانانەوە.. دوکاندار بە دەم شت فرۆشتنەوە.. پۆلیس و ئاسایش لە شوێنی ئێشکگرتنەکانیانەوە.. ئەتوانن — لا اله الا الله — یان — استغفر الله — یان — سبحان الله — بکەن و کێشی کردەوەکانیان قورس بکەن بۆ ڕۆژی قیامەتیان..

دووەم: (ذکر) بۆ سڕینەوەی گوناهەکانە بە تایبەت گوناهە بچووکەکان و ئەو گوناهانەیشی لە نێوان بەندە و خوادا ئەنجام دراوە و — حق الناس — لەسەریان نییە.. وەك چۆن قوتابیەك خەت کوژێنەوە بەکاردەهێنێت بۆ سڕینەوەی هەڵەکانی..

---

١ صفة الصفوة لا (١١٩/٢).

موسڵمانیش – ذکر – دەکات بە تایبەت – أستغفر الله – و هاوشێوەکانی بۆ کوژاندنەوەی تاوانەکانی کە ڕۆژانە لە دەستی دەردەچێت.

* قال حذيفة – رضي الله عنه – قلت للنبي (ﷺ) اني اخاف ان يدخلني لساني النار، اني رجل ذرب اللسان على أهلي، فقال النبي (ﷺ): ((اين انت من الاستغفار؟ اني لايسغفر الله في اليوم مائة مرة)).[1]

واتە: – حذيفە – ی یەمانی (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت وتم: بە پێغەمبەر (ﷺ) من زۆر ئەترسم ئەم زمانەم بمخاتە ناو ئاگرەوە، چونکە من کەسێکم زۆر بەسەر منالەکانمدا دەقیڕێنم، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ئەی لەگەڵ ـ أستغفر الله ـ (واتە خوایە لێم خۆش بە) دا چۆنی؟ چونکە من لە ڕۆژێکدا سەدجار ـ أستغفر الله ـ دەکەم.

یوسف پێغەمبەر (علیه السلام) بزانە چۆن لە کۆڕی زیکر گەیشتووە:

* عن قيس بن عباد: ان يوسف – عليه السلام – قال: ياربا ه اذا مررت بقوم يذكرونك فأردت ان اجاوزهم فاكسر رجلي الذي تليهم حتى اجلس فأذكر معهم.[2]

واتە: (یوسف پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ڕووی دەکردە پەروەردگار و دەیفەرموو: ئەی پەروەردگارم ئەگەر دام بە لای کۆمەڵێ کەسدا زکیر و یادی تۆیان دەکرد و لام نەدایە لایان و ویستم بڕۆم ئەو قاچەم بشکێنە کە نزیکە لێیان تا نەتوانم بڕۆم و لەگەڵیاندا دانیشم و زیکری تۆ بکەم).

هەر لەبەر گەورەیی و مەزنی زیکر کردن بوو کە صاڵحان هەموو ئامۆژگاریەکانیان بۆ خەڵکانی لاواز ئەوە بوو کە بەردەوام خوایان لەبیر بێت و زیکر و یادی بکەن لە هەموو جێگایەکدا.

عن ابي مسلم الخولاني قال: ((إن رجلاً اتاه: قال له: اوصني يا أبا مسلم، قال اذكر الله تحت كل شجر و حجر، فقال: زدني، فقال اذكر الله حتى يحسبك الناس من ذكر الله مجنون)).[3]

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/٣٥٩).

٢ الزهد لأحمد بن حنبل، لا ٩٥.

٣ اسناده حسن، الجامع لشعب الايمان (٢/٣٩٢).

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت (ابی مسلم الخولانی) پێی وت: ئەی باوكی موسلم ئامۆژگاریەكم بكە، فەرمووی: لە ژێر هەموو درەختێك و هەموو بەردێكدا ذكری خوا بكە، كابرا وتی: ئامۆژگاری زیاترم بكە، فەرمووی: ئەوەندە لە ذكری خوادا ڕۆبچۆ تا هەندێ خەڵكی وابزانن شێت بویی.

هەر ذكرە دڵە قاسی و ڕەقەكان نەرم دەكاتەوە و نووری باوەڕی تێدا دروست دەبێتەوە و پاش ئەوە حەز دەكەیت كردەوەی چاك بكەیت و لە كاری خێر خۆشت نادزیتەوە، سەیری ئەم وتووێژەی نێوان حەسەنی بەسری و پیاوێكدا ڕوویداوە بكە:

* عن المعلّى بن زياد: ((ان رجلاً قال للحسن: يا أبا سعيد اشكو اليك قساوة قلبي، قال له: أدَّبه بالذكر)).[١]

واتە: پیاوێك هات بۆ لای حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و پێی وت: ئامۆژگاریم بكە، چونكە ئاه و سكاڵای دڵڕەقیم بۆ لای تۆ هێناوە، شێخ حەسەنیش پێی فەرموو: بە (ذكر) كردن نەرمی بكە و بیخوسێنە.

ماوەیەك كردبووم بە عادەت كە لە سلێمانیەوە بەرەو بەغداد دەگەڕامەوە لە ناو پاسەكەوە عەموودەكانم دەبینی بە قەراغی جادەكەدا زۆر بە خێرایی تێدەپەڕین، منیش بیرم كردەوە كە لەگەڵ هەموو عەموودێكدا (لا اله الا الله)یەك بكەم و بەو كارەیش زۆر دڵخۆش بووم چونكە بەسم بوو لە قیامەتدا یەك یەك ئەو عەموودانە شایەتیم بۆ بدەن كە بە ژمارەی ئەوان ذكری خوام كردووە.

بەڵام شەیتان ختورەیەكی ترسناكی هێنا بە خەیاڵمدا و خەریك بوو لەو تۆزە ذكرەیشم بخات، بە شێوەیەكی فێڵبازانە پێی وتم: تۆ ناتوانی وەك سەلەفی صالحی ئەم ئومەتە ذكری زۆر بكەیت و لە یادی خوادا ڕۆبچیت، و بەم ذكرە كەمەشتەوە دەچیتە ڕیزی دووڕووەكان ـــ المنافقون ـــ بۆیە هەر نەیكەیت باشە و لە باتیدا ڕۆژنامەیەك بگرە بە دەستەوە و تا بەغداد تەواوی بكە!!

پاش ماوەیەك بۆم دەركەوت كە ئەمە داوێكی ترسناكی شەیتانە بۆ منی هەژاری ناوەتەوە، بۆیە وتم شەیتان بەر نەفرەتی خوا بكەویت، كردنی كردەوەی چاكە لە

١ اسنادە حسن، هەمان سەرچاوە (٢/٣٩٦).

نــەكردنی زۆر باشــترە و ئــەو ئایەتــەیش ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، واتــە: لــەناو خەڵكیدا ذكر دەكەن بەڵام لە پەنهانیدا نایكەن.

* قال عبدالرحمن بن يزيد بن جابر، قلت لعمير بن هـانيء: ((ارى لـسانك لايفـتر مـن ذكر الله، فكم تسبح في كل يوم؟ قال: مائة الف الاّ ان تخطيء الاصابع)).[1]

واتە: عبدالرحمن ی كوڕی یزیدی كوڕی جابر دەڵێت: بە عومەیری كوڕی هانیئم وت: دەبینم زمانت لە (ذكر)ی خوا ماندوو نابێـت، ئایا لـە ڕۆژێكدا چـەندجار (سـبحان الله) دەكەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: (١٠٠) هەزار جار دەیكەم ئەگەر پەنجەكانم هەڵـەیان نەكردبێت.

* (ذكر) كردنی پەروەردگار بەڵگەیەكی گەورەیە لەسەر خۆشویـستنی پـەروەردگار چونكە مرۆڤ ئەگەر ڕقی لە كەسێك بێت نە خۆی باسی خێری دەكات نە پێشی خۆشـە هیچ كەسێك باسـی ئـەو بكـەن بـە چـاكە.. بۆیـە یادنـەكردنی پـەروەردگار بەڵگـەیـەكی گەورەیە لەسەر ئەوەی كە دڵەكە خۆشەویستی پەروەردگاری تێدا نییە و دڵی بە خوای خۆی ناكرێتەوە، با گوێ بگرین بۆ ئەو وتەیەی (حـسان)ی كـوڕی (عطیـة) (ڕەحمـەتی خوای لێ بێت) كە ئەوزاعی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت:

* ((ما عادى عبد ربه بشيء اشد عليه من أن يكره ذكره او من يذكره))[2] واتە: هیچ كەسێك دوژمنایەتی پەروەردگاری نەكردووە بە شتێك كە خوا زۆری پـێ نـاخۆش بێـت بە ئەندازەی ئەوەی كە كەسێك ناوبردنی خوای پێ ناخۆش بێت یـان پێـی ناخۆشـیش بێت لە لایدا باسی پەروەردگاری بكرێت.

كۆتـایی (ذكـر) و یـادی پـەروەردگار بـە وتەیـەكی زانـای خوانـاس – أبـا سـلیمان الدارانی– كۆتـایی پـێ دەهێـنم كـە جێگـای دڵ خۆشـیە بـۆ بـاوەڕدارە ــ ذكـر كـەر و شەونوێژكەران ــ و بە ئاگا هێنانەوەشە بۆ غافڵ و بێ ئاگایان.

ابو سلیمان الدارانی دەڵێت: لە سوجدەدا بووم ئاگام لە خۆم نەما و خەوم لێكەوت، دەبینم لە خەونمدا یەكێك لە حۆریەكان هاتو – و نووكە شەقێكی تێهەڵدام ووتـی پـێم:

[1] الجامع لشعب الايمان (٢/٤٠٢).

[2] اسناده رجاله ثقات.

خۆشەویستەکەم خەو دەچێتە چاوەکانت لە کاتێکدا پادشای هەموو جیهان بە خەبەرەو بۆ شەونوێژگەران دەڕوانێت؟ دەی کوێرایی دایەت چاوێك خەوتنی پێ خۆشتر بێت لە پاڕانەوەی پەروەردگار.

دەی هەستە، بێکاری نزیك بۆتەوە، و خۆشەویستان بە لیقای یەکتر شادبوون، دەی ئەم ڕاکشانەت یانی چی؟

خۆشەویستەکەم، بینایی چاوم، ئایا خەو دەچێتە چاوەکانت؟ لە کاتێکدا من لە ناو کەژاوەدا بۆ تۆ گۆش کراوم لە فلان کات و فلان کاتەوە؟. دەڵێ: بە خێرایی بە خەبەر هاتم و ئارەقی شەرمەزاری لەناو چاوم دەهاتە خوارەوە بە هۆی ئەو هەموو سەرزەنشتەیەوە بۆم، بەلام چێژ و شیرینی وتەکانی لە دڵ و گوێمدا دەزرنگێتەوە.[1]

---

١ ذكره ابو نعيم في (الحلية) (٩/٢٥٩).

# دووەم

## گریان و فرمێسك ڕشتن لە ترسی خوای عز وجل

خوای میهرەبان لە زۆرێ لە ئایەتەکانی قورئانی کەریمدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە گریان و فرمێسك ڕشتنی موسڵمان بەڵگەی ڕاستگۆییەتی لە ئیمانەکەیدا، خوای پەروەردگار شانازییان پێوە دەکات..

ڕوو دەکاتە سەنگەری بێباوەڕان و پێیان دەڵێت: گرنگ نییە لە لام باوەڕ دێنن یان نا، چونکە کۆمەڵێ باوەڕداری خاوەن عەقڵ و زانست لە پێش ئەوانەوە باوەڕیان هێناوە، نەك هەر باوەڕێکی ڕووکەش و سادە! بەڵکو بە جۆرێ باوەڕیان هێناوە کە کاتێك ئایەتەکانی قورئان دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا خێرا بەسەر ڕوودا دەکەون و سوژدە دەبەن و دەڵێن: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان و وتە و پەیمانەکانی خوا بێگومان دێنەدی، و دووبارە بە ڕوودا دەکەون و بە دەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە پەیتا پەیتا خشوع و ملکەچییان زیاد دەکات..

وەك دەفەرموویت: ﴿قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾﴾.[١]

* برای خۆشەویستم باوەڕداری ڕاستەقینە دڵی زۆر ناسکە، گریانی حازرە، ئەگەر باسی خوای گەورەیان لە پاڵدا بکرێت دڵیان دەترسێت و دڵیان دەلەرزێت، وەك لە سورەتی (الانفال)دا و لە ئایەتی (٢)دا دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾.

---

١ الاسراء، ئایەتی ١٠٧–١٠٩.

* زۆر ترسناکە بۆ دڵ، بۆ مێشك، بۆ چاو، کە قورئانی بەسەردا بخوێنرێتەوە و لە هەمان کاتدا دڵی پڕ نەبێت لە گریان و وەیلیش بۆ کەسێك وەك گریانی نایەت پێش بکەنێت و گاڵتە بکات!!

وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (النجم) ئایەتی (٦٠) دا دەفەرمووێت: ﴿وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ﴾.

* برای موسڵمانم ئایا ئەزانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)بەهەشت و دۆزەخی بە چاوی خۆی دیوە لە ئیسرا و میعراجدا بۆیە زۆر بە کەمی پێکەنیوە و هەمیشە خەفەتبار بووە، بۆیە هاوەڵە بەڕێزەکانی هەر بەو شێوەیە گۆش کردبوو جارێکیان وتارێکی کاریگەری پێشکەش بە هاوەڵان کرد کە ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: تا ئەو ساتە وەختە گوێم لە وتاری وانەبوو، کە فەرمووی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم (لە ناڕەحەتیەکانی ناو گۆڕ و ڕۆژی حەشر و پردی سیرات و ئاگری دۆزەخ) ئێوە بتانزانیایە زۆر بە کەمی پێکەنینتان دەهات و زۆربەی کاتەکانتان دەگریان، و هاوەڵانیش بە جۆرێ کاریگەری لێ کردن کە سەریان داخستبوو لە ژێرەوە پرمەی گریانیان دەهات، وەك بەم شێوەیە ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە:

* عن انس (رضي الله عنه) قال: خطب رسول الله (ﷺ) خطبة ماسمعت مثلها قط فقال: لو تعلمون ما اعلم لضحكتم قليلا ولبكيتم كثيرا)) قال: فغطى اصحاب رسول الله (ﷺ) وجوههم ولهم خنين).[1]

* با پێکەوە بەیانیەکی زوو لەگەڵ (ابو عمر)دا کە مەولای ئەسمای کچی ئەبی بەکر بوو، خۆمان بکەین بە ماڵی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا و بزانین وەك سەرۆك و بەرپرسەکانی لای خۆمان یان وەك خۆمان لە ناو جێگەی گەرم و نەرمدا و لە پرخەی خەودایە یان صاڵحان ئاسا بەرەو ڕووی قیبلە بە چۆکدا کەوتووە و بە چاوی پڕ لە فرمێسك و بە گریانەوە قورئانی لە باوەشدایە و بە ئاوازێکی خەمناك و کاریگەر دەوری ئایەتەکانی قورئان دەکاتەوە.

---

١ متفق عليه.

* قال (ابو عمر) مولى (اسماء بنت ابي بكر) رضي الله عنها وعن ابوها فأتيته في مجلسه الذي يصلى فيه الفجر والمصحف في حجره، و دموعه تيسل على لحيته)).[١]

یەکێ لە ڕەوشت و ئاکاری بەرزی صاڵحان ئەوەیە کە، کاتێك کەسێکی دڵسۆز ئامۆژگاریان بکات و خوای گەورە و لێپرسینەوەی ترسناکی قیامەتیان وەبیر بێنێتەوە دەست دەکەن بە گریان و ئامۆژگاریەکان کاریان تێدەکات.

دەی با پێکەوە گوێ بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز بگرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە چۆن ئامۆژگاری سلێمانی کوڕی عبدالملك دەکات کاتێك لەگەڵ سلێماندا لەسەر کێوی عەرەفە وەستابوون و خەڵکێکی زۆریش بە دەوریاندا وەستابوون و سلێمان سەرسام بوو لە زۆری عەشامەکە، و لەو کاتەدا عمر ڕووی تێکرد و پێی وت: ئەمانە ژێردەستەی تۆن و سبەینێ لە قیامەتدا بەرامبەرت دەوەستن و شکاتت لێ دەکەن لە لای خوای عز وجل، و سلێمانیش چاوەکانی پڕبوون لە ئاوو دەستی کرد بە گریان..

* (ابن کثیر) لە (البداية والنهاية)دا دەڵێت: لما وقف سليمان وعمر بعرفة جعل سليمان يعجب من كثرة الناس، فقال له عمر: هؤلاء رعيتك اليوم وهم خصماءك يوم القيامة، فبكى سليمان وقال: بالله أستعين.[٢]

ئەی برای صاڵحم، ئەزانی موسڵمانانی پێش ئێمە چەندە فرمێسکیان خۆش دەویست و چەندیان حەزکردووە چاوی خۆیان ببینن گوڵی خواردووە و سوور هەڵگەڕاوە و هۆن هۆن ئاوی پێدا دێتە خوارەوە.

برایەك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کە ژیانی پێغەمبەری خوا و هاوەڵە بەڕێزەکانی و سەلەفی صاڵحم دەخوێندەوە.. بێزم لە موسڵمانەتی و بەندایەتی خۆم دەهاتەوە.. شەوانە بیرم لە ئاگری دۆزەخ و سزا ناڕەحەتەکانی دەکردەوە.. بیرم لە گەورەیی خوای پەروەردگار دەکردەوە بەڵام هەرچیم دەکرد.. دڵە ڕەقەکەم کە وەك بەردی لێهاتبوو.. نەرم نەدەبوو.. قەترەیەك فرمێسك چیە؟! بە چاوما نەدەهاتە خوارەوە.. زۆر دەترسام دووڕوو بم و باوەڕ لە ناو دڵمدا جێگەی خۆی نەکردبێتەوە.. زۆر خەمبار

---

١ سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي لا ٤٢.

٢ البداية والنهاية (١٢/٦٨٥).

بووبووم لە خۆمم دەپرسی ئەگەر قیامەت و ناهەموارییەکانی لە دڵمدا بچەسپانایە دەی بۆچی قەترەیەك ئاو لە چاوم نایەت؟. بۆ بۆ ئەو ڕۆژەی خۆم گریانم نایەت؟!.

بەڵام خوای من و تۆ کردی و شەوێکیان قورئانم لە باوەشدا بوو دەورم دەکردەوە و هەموو ماڵەوە لە شیرینی خەودا بوون.. بیرم لە گەورەیی خوا و وتە پیرۆزەکانی دەکردەوە، لەو کاتەدا شتێکی زۆر گرنگ ڕوویدا کە ئەوەندەی هەموو دنیا دڵمی خۆش کرد... ئەویش ئەوە بوو کە چەند تکەیەك ئاو لە چاوەکانم هاتنە خوارەوە و منیش لە خۆشیاندا تکەکانم دەگرتەوە و تێر تێر ماچم دەکردن تا لە نێوان پەنجەکانم و دەممدا ون دەبوون و نەدەمان.[1]

صاڵحانی ئەم ئومەتە گەورەیەی ئیسلام ئاوابوون و ئاوا گریان و فرمێسك ڕشتنیان بە لاوە گرنگ بووە و خۆشیان ویستووە ناهەقیشیان نییە، چونکە فرمێسك ئەو پەڕی مانای ڕاستکردن و دڵسۆزییە بۆیە پیاوچاکێکی وەك (کەعب) دەڵێت: قورسایی خۆم ئاڵتونم هەبێت و هەمووی بکەم بە خێر ئەوەندەی ئەوە دڵم پێی خۆش نییە کە لە ترسی خوای عز وجل گریانم بێت. وەك دەڵێن: قال کعب: ((لأن أبكى من خشية الله أحب اليّ من أن أتصدق بوزني ذهباً)).[2]

گریان شتێکی بیدعە نییە و پیاو چاکانی ئیسلام لە عیلمی تصوفی هیندی و فارسیەوە وەریان گرتبێت بەڵکو هاوەڵانی پێغەمبەرە نازدارەکەمان (ﷺ) بە بچووکترین ئامۆژگاری گریانیان هاتووە و تا دەگێڕنەوە خەلیفە ڕاشیدی دووەم عومەری کوڕی خطاب (خوای لێ ڕازی بێت) ئەوەندە گریابوو لە ترسی خوای گەورە دوو خەتی ڕەشی لەسەر ڕوومەتی دروست بووبوون وەك ئاسەواری جۆگەی فرمێسك! یا سبحان الله! ئێمەش خۆمان بە شوێنکەوتەی قورئان دەزانین بەڵام وا دیارە ئێمە و هاوەڵان ئەرز و ئاسمان نێوانمانە وەك شاعیری گەورەی کورد مەحوی دەڵێت:

بە ناو ئێمەش ڕیجالین و ڕیجالی هم ڕیجالن هەم

بە فەجری ناو دەبەن سەد حەیفە ئەگەر صادق ئەگەر کاذب

---

١ ئەو برایەی ئەمەی بۆ باس کردم حەزی نەکرد ناوی بەرم.

٢ جامع العلوم والحکم ل ٢٢٦.

* عن عبدالله بن عيسى قال: ((كان في وجه عمر بن الخطاب خطان اسودان من البكاء)).[1]

یان ئەبو موسای ئەشعەری (خوای لێ ڕازی بێت) ئامۆژگاریمان دەکات و داوامان لێ دەکات کە بگرین بۆ خۆمان، و ئەگەر گریانیشمان نەیەت با بە زۆر خۆمان بگرێنین، و پاشان باسی ئەوەمان بۆ دەکات ئەگەر لە دنیادا نەگرین و فرمێسک نەڕێژین ئەوا لە ناو ئاگری دۆزەخدا خەڵکەکە ئەوەندە دەگرین تا ئاو لە چاویان دەبڕێت و وشك دەبێت و پاشان لە باتی فرمێسك خوێن لە چاویان دێتە دەرەوە بە جۆرێ جۆگە دروست دەکات ئەگەر کەشتی تێ بخەیت بە ئاسانی هاتوچۆی تێدەکات.

عن قسامة بن زهير قال: خطبنا أبو موسى الاشعري فقال: أيها الناس أبكو فإن لم تبكوا فتباكوا، فان اهل النار يبكون الدموع حتى تنقطع ثم يبكون الدماء حتى لو ارسلت فيها السفن لجرت.[2]

خوێنەری خۆشەویستم ئایا بیستووتە ماڵێك بە گەورە و بچووکیانەوە لە ترسی خوا پێکەوە بگرین؟ کە من ناوم ناوە (ماڵێك لە گریان)، ئەویش ماڵی خەلیفەی دادپەروەری ڕاشید عومەری کوڕی عبدالعزیزە، ئەمە چۆن بووە؟ ئەبی مودود دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز قورئانی دەخوێند گەیشتە ئەم ئایەتەی کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا﴾ (يونس: ٦١).

زۆر بە کوڵ دەستی کرد بە گریان بە جۆرێ هەموو ماڵەکە گوێیان لێ بوو، (فاطمة)ی خێزانی هات لە پاڵیدا دانیشت و وەك ئەو دەستی کرد بە گریان و هەموو کچو کوڕەکان کە لەوێ بوون دەستیان کرد بە گریان و لەو کاتەدا عبدالملك ی کوڕی هات بە ژووردا و ڕووی کردە باوکی و لێی پرسی: باوکە گیان ئەوە بۆچی دەگریت؟ و عومەریش وتی: خێرە کوڕی خۆم، باوکت ئاواتە خواز بوو نە دنیای بناسیایەی و نە

---

١ صفة الصفوة (١٤٨/١).

٢ رواه امام احمد.

دنیاش ئەوی بناسیایە، دەی وەڵڵاهی کوڕی خۆم ئەترسم لە ناو بچم، و وەڵڵاهی کوڕی شیرینم زۆر دەترسم بخرێمە نێو ئاگری دۆزەخەوە!..

یەك ئایەت خانەوادەیەك بکاتە گریان دەی قوڕ بەسەر ئێمەی بەناو شوێنکەوتەی ئەو بەرنامە ڕاست و دروست و بێ لەکەیەین، کەچی لەوانەیە لە باتی جارێك چەند جار هەموو قورئانمان خەتم کردووە بەڵام تەنها جارێك ئایەتێك نەیوەستاندوین و چەند قەترە فرمێسکێ لە چاومان بێنینە دەرەوە و هەناسەیەکی قووڵ هەڵبکێشین.

* عن أبي مودود قال: بلغني ان عمر بن عبدالعزيز قرأ ذات يوم ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا﴾، فبكى بكاء شديداً حتى سمعه اهل الدار، فجاءت فاطمة، زوجته، فجعلت تبكي لبكائه وبكى اهل الدار لبكائهما، فجاء عبدالملك فدخل عليهم وهم على تلك الحال يبكون فقال: يا أبي ما يبكيك؟ قال: خير يابني، ودّ ابوك انه لم يعرف الدنيا ولم تعرفه، والله يا بني لقد خشيت ان اهلك، والله يا بني لقد خشيت ان اكون من اهل النار)).[1]

ئەی خوشکی موسڵمانم.. ئەی هاوبیروباوەڕم... ئەی عائیشە و (فاطمة) و سمیە و نوسەیبەی ئەم سەردەمە... ئێوە بەعاطیفی و سۆزدار ناسراون... ئێوە لەبەر خوا و لە ترسی دوا ڕۆژی نادیار و ترسناك بگرین... بەچاوی خۆمان فرمێسکەکانتان ببینین.. ئەوەش نیشانەی باوەڕە.. نیشانەی تەقوایە.. نیشانەی عاقیبەت خێریتانە.. سەیری ئەم نموونەیە بکە و سەیرێکی خۆیشت بکە دڵنیام (إنشاء الله) دەگۆڕێیت و گریانت بە ئاسانی بۆ دێت.

* عن ثابت البناني قال: ان إمرأة يقال لها – بردة الصريمية – كانت تكثر البكاء حتى فسدت بصرها، فيقول لها، إتقى الله، اما تخافين على بصرك ان يذهب؟ قالت: دعوني فان أكن مع اهل النار فابعدني الله وابعد بصري، وان أكن مع اهل الجنة، فسيبدلني الله عينين خيراً من عينيّ.[2]

---

١ عمر بن عبدالعزيز، د. علي محمد الصلابي لا ١٧.

٢ صفة الصفوة (٢/٣٠).

واتــە: سـابتی بـەنانی دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: ئافرەتێـك هـەبوو نـاوی (بـوردەی سەریمیە) بوو زۆر دەگریا لە ترسی خوای – عز وجل – تـا وای لێ هـاتبوو چـاوەکانی تێك چووبوون... پێیان وت: لە خوا بترسە.. ئەی ناترسی بە تـەواوەتی چـاوەکانت لـە دەست بدەیت و کوێر ببیت؟

لە وەڵامیاندا وتی: وازم لێ بهێنن، چونکە ئەگەر ئەهلی دۆزەخ بم – پەنا بە خـوا – ئەوە خۆیشم و چاوەکانیشم لە ناو دەچن، خۆ ئەگـەر ئـەهلی بەهەشـت بم ئـەوا خـوای گەورە لەوێ دوو چاوی باشترم پێ دەبەخشێت لەمانەی خۆم جوانتر و باشترن.

خەڵکی لە ناو گەرمەی قسەی خۆش و شـۆخی کردنـی خۆیانـدا ڕۆدەچـن و هەنـدێ جار قاقای پێکەنینیان لە دوورەوە دەبیسترێت.. بەڵام صالّحان (ڕەحمەتی خوایـان لێ بێت) خەیاڵیان لە جێیەکی تـرە و دالّغـەیان لـە لای دواڕۆژە ترسـناك و ناهەموارەکـەی ڕۆژی قیامەتە.. فەرموون جارێکی تریش لە دیمەنی شـانۆ ڕاسـتەقینەکەماندا عومـەری کوڕی عبدالعزیز دەبینین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە لە ناو هاوەڵەکانیدا دانیـشتووە بە لاشە لای ئەوانە بەڵام بە دڵ و دەروون داویەتی لە شەقەی باڵ بەرەو ڕۆژی قیامەت بەرز بۆتەوە:

* عن سفيان قال: ((كان عمر بن عبدالعزيز يوماً ساكتاً واصحابه يتحـدثون، فقـالوا: مالك لا تتكلم يا أمير المؤمنين؟ قال: كنت مفكراً في أهل الجنة وكيف يتزاورون فيها، وفي أهل النار كيف يصطرخون فيها، ثم بكى)).[1]

واتە: لە سفیانەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: ڕۆژێکیـان عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز زۆر بێدەنگ بوو، لە کاتێکدا هاوڕێکانی لە ناو خۆیاندا قسە و گفـت و گۆیـان دەکـرد، بۆیـە ڕوویان تێکرد و لێیان پرسی: ئەوە چییە وا بێدەنگیت ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عومەر وتی: بیرم دەکردەوە لە بە هەشتیەکان کە چۆن سەردانی یەکتر دەکـەن و بیریـشم لـە دۆزەخییەکان دەکردەوە کە چۆن هات و هاوار و واوەیـلا دەکـەن لـە نـاو ئاگرەکـەدا.. عومەر ئەمەی وت و دەستی کرد بە گریان.

---

١ الخليفة الراشد والمصلح الكبير – عمر بن عبدالعزيز – دكتور علي الصلابي.

لەوانەیە کەسێك بڵێت: دەی ئەوە عومەری کوڕی عبدالعزیزە و کێ دەتوانێ وەك ئەو بێت ئەو کێوێك خواناسی و دنیا نەویستی بووە، بەڵام فەرموون با بچینە خزمەت منداڵێکی ١٦-١٧ ساڵە، کە چۆن چاوەکانی پڕبوون لە ئاو و گریانی بەند نەکردووە لە ترسی خوا و ترسی ڕۆژی قیامەت و شەوەکان خەوی لێ نەکەوتوو و بە دەم گریانەوە قورئانی خوێندووە لە ناو شەونوێژدا ڕۆچووە... ئەو کوڕە گەنجەیش ئەزانن کێیە؟

ئەوە (عبدالملك)ی کوڕی (عمری کوڕی عبدالعزیز)ە (ڕەحمەتی خوایش لە خۆیشیو باوکیشی با پێکەوە شەوێکی درەنگ خۆمان بکەین بە ژوورەکەیدا و بزانین لەوێ چ باسە؟

عن عاصم بن ابي بكر بن عبدالعزيز بن مروان – وهو ابن أخ عمر بن عبدالعزيز – قال: وفدت الى سليمان بن عبدالملك ومعنا عمر بن عبدالعزيز، فنزلت على ابنه عبدالملك وهو عزب، فكنت معه في بيت، فصلينا العشاء، واوى كل منا الى فراشه ثم قام عبدالملك الى المصباح فأطفأه، ثم قام يصلي، حتى ذهب بي النوم فاستيقظت فاذا هو في هذه الاية ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ ﴾[1] فبكى ثم يرجع اليها، فاذا فرغ منها فعل مثل ذلك، حتى قلت: سيقتله البكاء، فلما رأيت ذلك قلت: لا اله الا الله، والحمد لله – كالمستيقظ من النوم لاقطع ذلك عليه، فلما سمعني سكت فلم اسمع له حسا – رحمه الله –.[2]

واتە: (عاصم)ی کوڕی (ابو بکر)ی کوڕی (عبدالعزیز) کە برازای عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو دەڵێت: لەگەڵ وەفدێکدا هاتم بۆ لای سلێمانی کوڕی عبدالملك و عومەری کوڕی عبدالعزیزیشمان لەگەڵدا بوو، پاش سەردانەکە من شەو لە ماڵی عومەر ماینەوە و من و عبدالملك ی کوڕی لە ژوورێکدا خەوتین کە ژنی نەهێنابوو، پاش ئەوەی پێکەوە نوێژی عیشامان کرد و بەرەو جێگای خەوتن بەڕێ کەوتین و (عبدالملك)یش دەستی برد چراکەی کوژاندەوە و ژوورەکەی تاریك کرد و دەستی کرد بە نوێژکردن، تا ئەوەبوو چاوەکانی من چوونە خەو و خەوم لێکەوت.

---

١ الشعراء آية (٢٠٥-٢٠٧).

٢ عمر بن عبدالعزيز لا ١٤٢، دكتور علي محمد الصلابي.

پاش ماوەیەك بە خەبەر هاتم دەبینم هەر نوێژ دەكات و لەم ئایەتە پیرۆزەدایە كە دەفەرموویت: ﴿أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾﴾، مانای ئایەتەكەش ئەوەیە ((ئەی موحەممەد (ﷺ) دەبینی ئەگەر چەندان ساڵی تریش لە ژیاندا ئەو بێباوەڕانە بهێڵینەوە و پاشان گیانیان بكێشین، دەی ئایا ئەو چەند ساڵەی ڕابردوویان چ سوودیان پێ دەگەیەنێت)؟.

(عاصم) دەڵێت: بە دەم گریانەوە ئەم سێ ئایەتەی دەخوێند و هەر كە لێ دەبوویەوە خێرا دووبارە و سێ بارەی دەكردەوە تا وام لێهات وتم بە خۆم: بە خوا خۆی دەكوژێت ئەوەندە دەگری، بۆیە كە ئەوەم بینی وەك ئەوەی بزانێت بە خەبەرمو ئەو گریان و زاریەی پێ ببڕم و وتم: ((لا اله الاّ الله والحمد لله)) و كاتێك گوێی لە دەنگم بوو بێدەنگ بوو، فزەی لە خۆی بڕی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

ئەوەش مێردمنداڵێكی گەنج و موراهیقە و ئەوە ئاستی خواناسی و بەندایەتیەتی، دەی ئیتر ئێمە چۆن قسەمان وتارمان نووسینمان كاریگەری لەسەر كەس هەیە كە شەوانە دوو بەتانی پڵنگ لە خۆمان دەپێچین و دەچینە ناو قووڵایی خەوەوە و بێئاگاین و بێئاگاین لەوەی كە خواردنی ڕۆح و پتەوكەری باوەڕ لە ناو تاریكایی شەوەكاندا بە دەست دەهێنرێت و هەموو دڵۆپێك فرمێسك گەروە وشكەكان و دڵە ڕەقەكان نەرم و سازش دەكاتەوە.

دەبا ساتێكیش بچینە خزمەت یەكێكی تر لە صاڵحانی ئەم ئومەتە گەورەیە كە زانای مەزنی تابعین – سەعیدی كوڕی جوبەیرە – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – تا بۆمان دەربكەوێت شوێنكەوتووانی ئەم بەرنامە ناوازەیەی پەروەردگار هەمیشە گریانیان ئامادەیە و تەنانەت نەك لە كاتی ئامۆژگاری كردن یان بینینی یان بیستنی شتێكی ترسناك بەڵكو لە كاتی بیستنی مۆسیقا و شمشاڵدا! كە ئەمڕۆ مۆسیقا بۆ خۆشی و سەیر و سەفا و گۆرانییەكان لێ دەدرێت و كەس بیری لە لای ئەوە نییە كە گوێی لە مۆسیقا بوو دەست بكات بە گریان و شین و زاری و فرمێسك ڕشتن، بەڵكو ئەمڕۆ شەیتان لە ناو دڵەكاندا چوارمشقی داوە ناهێڵێ كەمێ بۆ خوا نەرم بن و چاوەكانیش چەند دڵۆپە فرمێسكیان لەبەر خوا لێ بێتە خوارەوە، دەی برای خۆشەویستم با من و

تۆ کەمێ خۆمان ڕاوەشێنین و هەر هیچنەبێت وەزع لە شەیتان تێك بدەین و نەهێڵین بە مورتاحی لە ناو دڵماندا نیشتەجێ بێت، فەرموو لەگەڵ ئەم نموونەیەدا:

* قال حجاج بن يوسف الثقفي – والي العراق – للعالم الصالح – سعيد بن جبير – رحمه الله – عندما قدموه امامه: هل رأيت شيئاً من اللهو؟ قال: لا أعلم،فدعا الحجاج بالعود والناي فلما ضرب بالعود والناي، بكى سعيد، قال الحجاج: ما يبكيك؟ قال: هو الحزن، ذكرتني أمراً عظيماً، اما هذه النفخة فذكرتني يوم النفخ في الصور))[1].

واتە: زانای پیاوچاك – سەعیدی کوڕی جوبەیریان هێنایە بەر دەستی حەجاجی کوڕی یوسف الثقفي کە ئەو کاتە والی عێراق بوو – کاتێك بینی لێی پرسی: تا ئێستا خۆشی و ڕابواردنت بینیوە؟ سەعید فەرمووی: وانازانم.

حجاج وتی: دەی کوڕینە کوا تیپی مۆسیقا دەی عود و نەی لێ بدەن بیکەن بە ڕۆژی خۆتان – و هەر کە مۆسیقا لێدرا سەعید دەستی کرد بە گریان، حەجاجیش بە سەرسامیەوە لێی پرسی: خێرە وا دەگریت؟ سەعید فەرمووی: خەفەتم پێ خوارد چونکە شتێکی زۆر گەورەی بیر خستمەوە، و ئەم نایەی کە لوولەك ژەنەکە فوی پێدا کرد، ڕۆژی نەفخی صوری یاد خستمەوە.

ئێمە دەمانەوێت بە باسکردنی ژیانی صاڵحان دڵەکانمان نەرم کەینەوەو چاوەکانمان ناسك کەینەوە و فرمێسکیان لێ بێنینە خوارەوە، بەڵام ئەی خودی صاڵحان کێ مامۆستایان بووە لە قوتابخانەی گریاندا؟

پێغەمبەری خوا نموونەی ڕاستەقینەیان بووە و مامۆستای گریان بووەو خۆی گریاوە بۆیە توانیویەتی خەڵکیش بکاتە گریان بۆیە نەوەکانی دوای خۆی بەرە دوای بەرە درێژەیان دەدا بە کاروانی گریان، دەی ئایا خوێنەری خۆشەویست دەزانیت کە پێشەوا سەرمەشقەکەت لە کاتی نوێژکردندا – ئەوەندە گریاوە کە لە سنگیەوە دەنگێك دەهات وەك تەپەتەپی ئاش.

---

١ من روائع القصص لا ٩٥.

* اخرج ابو داود عن مطرف عن ابيه — رضي الله عنه — قال: رأيت رسول الله (ﷺ) يصلي وفي صدره ازيز كازيز الرحى من البكاء.[١]

واتە: موتریف لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بە چاوی خۆم دیووە کە نوێژی دەکرد و لەو کاتەدا دەنگی ناڵە و گریان لە سنگیەوە دەردەچوو وەك چۆن ئاش دەنگی لێ دەردەچێت.

ئەی ئایا دەزانیت: فرمێسك ڕشتن و گریان لە ترسی خوا لە ئاگری دۆزەخ دەتپارێزێت؟ دەی کەواتە ئەم چەند دێڕەی دەربارەی گریان و فرمێسك ڕشتنی صالحان بۆم نوسیویت لەو بابەوە بۆم باس نەکردوویت کە من کەسێکی ڕوحی و صوفی و ئەهلی طریقەت بم بۆیە خۆم لەم باسە سۆفی گەریانە دەدەم، لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێزم بۆ سوفی ڕاستەقینە و ئەهلی تەریقەتە ڕاست و دروستەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) هانمان دەدات کە بگرین لەبەر خوا چونکە لە ئاگری دۆزەخ دەمانپارێزێت. دەی گوێ بگرە بۆ پێغەمبەرە نازدارەکەت کە دەربارەی گریان چی دەفەرموویت:

* قال رسول الله (ﷺ) عينان لاتمسهما النار، عين بكت من خشية الله و عين باتت تحرس في سبيل الله)).[٢]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: دوو چاو هەرگیز ئاگری دۆزەخیان بەرناکەوێت، یەکەمیان: چاوێك لە ترسی خوا گریابێت و فرمێسکی ڕشتبێت و دووەمیان: چاوێك تا بەیانی پاسەوانی و ئێشکگری گرتبێت لە ڕێگەی خوا و لە جیهاددا.

قورئان خوێندن بە گریانەوە کارێکی سوننەتە و هەموو خەلیفە ڕاشیدەکان لە نوێژدا گریاون لە قورئان خوێندندا گریاون و کاریشیان کردۆتە سەر دەروونی نوێژگەرەکان، ئەوە عومەری کوڕی خطابە (خوای لێ ڕازی بێت) و (عبدالله)ی کوڕی (شداد) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لە ڕیزی دوای دواوە بووم و لە نوێژی بەیانیدا بوو

---

١ صحيح ابو داود (٤/٩).

٢ رواه البخاري ومسلم.

دەنگی گریان دەگەشتە لای ئێمە کاتێك سورەتی یوسفی دەخوێند تا گەیشتە ئایەتی: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾.[١]

* أخرج عبدالرزاق وسعيد بن منصور وابن سعد وابن ابي شيبة والبيهقي عن عبدالله بن شداد، قال: سمعت نشيج عمر بن الخطاب وانا في اخر الصفوف في صلاة الصبح وهو يقرأ سورة يوسف حتى بلغ ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾.[٢]

ئێمە وتارەکانمان وشك و بێ گیانن و بە دڵۆپەکانی فرمێسك گریان و ئاومان نەداون‌و تەڕ و پاراومان نەکردونەتەوە بۆیە کاریگەریان نییە لەسەر دڵەکان و لە مێشك‌و دڵی بیسەراندا نەقش نابێت چونکە هەر کەسێك خۆی گریانی نەیەت هەرگیز ناتوانێت خەڵك بکاتە گریان، بەڵام زانایانی ناو هاوەڵان و تابعین و دوای ئەوانیش تا وتارێکیان داوە ڕیشی خۆیانیان خوساندووە ئەوەندە گریاون بەڵام داخەکەم ئەمڕۆ گریان بۆتە عەیبەو خەطیب ئەو کەسەیە ڕستە ڕێك بخات‌و بقیڕێنێت‌و درێژی بکاتەوە بەڵام نازانێت کە وتارەکەی وشك‌و بێ گیان‌و بێ کاریگەرە..

عن ابي هارون قال: كان يحدثنا ولحيته رش بالدموع (اي ابن مسعود الهذلي).[٣]

واتە: ئەبی هارون دەڵێت: (ابن مەسعودی هوزەلی) قسەی بۆ دەکردین و وتاری بۆ د..این، لەو کاتەدا ڕیشی تەڕ دەبوون بە فرمێسکی چاوەکانی).

خوشك و برای موسڵمانم.. نازانم بۆچی ئێمە غەمبار و دڵتەنگی ڕۆژی قیامەت نابین‌و لەو ئاکامە ترسناکە بێ خەمین!! ئەگەر باوەڕمان پێیەتی با بەهێزی کەین بە فرمێسك و خواناسی.. ئەگەر پەنا بە خوا گومانمان لەو ڕۆژە ترسناکە هەیە.. دەی با باوەڕ بێنینەوە.. و بە ڕەنجەڕۆیی نەمرین....

ئەمە ـ ئەمیری باوەڕدارانە ـ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ زۆر دەکات لە (ضرار) کە هاوڕێی ئەمیری باوەڕداران علی کوڕی ئەبو طالب بوو ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ کە وەسفێکی وردی علی کوڕی طالیبی بۆ بکات، بەڵام (ضرار)

١ سورة يوسف آية (٨٦).

٢ حياة الصحابة (٣/٤٤٧).

٣ صفة الصفوة (٢/٦٥).

دەترسێت و دەڵێت: بمبەخشە لەو کارە، بەڵام موعاویە هەر سوور دەبێت لەسەر داواکاریەکەی، (ضرار)ی کوڕی (ضمرة)یش دەڵێت: خوا شاهیدە لە هەندێ هەڵوێستدا بە چاوی خۆم دیومە لە شەوێکی تاریك و دەیجوردا کە تەنها ئەستێرەیەکت بە ئاسمانەوە نەدەدی، لەناو میحرابی مزگەوتەکەدا دانیشتبوو، بە هەر دوو دەست ڕیشی خۆی گرتبوو وەك نەخۆش بەملا و لادا شانەکانی دەهاتن و دەچوون، و وەك خەفەتبارێك بە کوڵ دەگریا و دەهاتە بەرگوێم کە دەیووت:

((ئەی دنیا، ئەی دنیا... بۆ وام لێ دەکەیت، خۆشت دەوێم یان دەتەوێت پەنم پێدابدەیت؟!.. (نەیخۆیت تاڵە) بڕۆ خەڵکی تر بخەڵەتێنە من سێ بە سێکەم خستۆتە مشتت، و جارێکی تر ناتهێنمەوە، تەمەنت کورتە و ژیانت بۆگەنە و ترسناکیت گەورەیە، ئای لە تێشووی خاڵی و سەفەری دوور و درێژ و ڕیگای پڕ مەترسی ڕۆژی قیامەت.

* عن أبي صالح قال: قال معاوية بن ابي سفيان، لضرار بن ضمرة: صف لي علياً؟ قال: إعفني، قال: صفه؟ قال: واشهد بالله لقد رأيته في بعض مواقفه وقد أرخى الليل سجوفه تغارب نجومه وقد مثل في محرابه قابضاً على لحيته يتململ تململ السليم، ويبكي بكاء الحزين وكاني أسمعه وهو يقول: يادنيا يادنيا ابيّ تعرضت ام اليّ تشوقت؟ هيهات هيهات غري غيري، قد بنتك ثلاثا لارجعة لي فيك، فعمرك قصير، وعيشك حقير وخطرك كبير، اه من قلة الزاد وبعد السفر و وحشة الطريق))[١].

ئەی خوشکی بەڕێزم.. برای بەڕێزم.. وەرن با هەریەکە و لەگەڵ هاوڕێکانماندا کۆببینەوە و ماوەیەك بگرین بەڵکو خوای گەورە بێت بە دەممانەوە و بەزەیی پێماندا بێتەوە.. ئەی نابینی منداڵ ئەگەر باوك و دایکی شتیان بۆ نەکڕی.. پەنا دەبات بۆ گریان و ئەوانیش بەزەییان پێدا دێتەوە و کۆمەڵێ پێداویستی بۆ دەکڕن، گوێ بۆ ئەم نموونەیە بگرە:

عن افلح مولى محمد بن علي بن الحسين – رضي الله عنه – قال: خرجت مع محمد بن علي حاجاً فلما دخل المسجد نظر الى البيت فبكى حتى علا صوته، فقلت: بأبي انت

---

١ صفة الصفوة (١/١٦٦).

وامي ان الناس ينظرون اليك فلو رفقت بصوتك قليلا. قال: ويحك يا افلح ولِمَ لا أبكى؟ لعل الله ينظر اليّ منة برحمة فأفوز بها عنده غداً، ثم طاف بالبيت ثم جاء حتى ركع عند المقام فرفع رأسه من سجوده فإذا موضع سجوده مبتل من دموع عينيه).[١]

واتە: ئەفلەح كە مەولای (محمد)ی كوڕی (علی)ی كوڕی (حسين)ە — خوای لێ ڕازی بێت — دەڵێت: لەگەڵ محمدی كوڕی عەلی دا ڕۆیشتین بۆ حەج، كاتێك چووە ناو كەعبەوە و تەماشای كەعبەی كرد و دەستی كرد بە گریان تا هاوار و سڵای لێ بەرز بوویەوە.

منیش پێم وت: بە دایك و باوكمەوە بە قوربانت بم بەزەییەكت بە خۆتدا بێتەوەو دەنگت نزم كەرەوە چونكە خەڵكی تەماشات دەكەن. ئەویش پێی وتم: بێ قەزا بی ئەفلەح بۆچی نەگریم؟ بەڵكو خوا بە هۆی ئەو گریانەوە لام لێ بكاتەوە و ڕەحمم پێ بكات و سبەینێ لە قیامەتدا لە ڕزگاربووان بم، پاشان بە دەوری كەعبەدا تەوافی كرد پاشان لە لای موقامی ئیبراهیم دا نوێژی دابەست و كاتێ لە كڕنوش بردن هەڵسایەوە دەبینم بە فرمێسك شوێنەكەی تەڕ كردووە..

* برای عەزیزم.. ئەزانی گریان و فرمێسك باران بۆ من و تۆ باشە، چونكە ڕۆژێكی چارەنووس سازی زۆر ترسناك لەبەر دەمماندایە و یان ئەوەیە بەهەشتی بەرین دەبێتە ماڵمان (إنشاء الله) یان ئەوەیە دۆزەخ و ئاگر ماڵمان دەبێت و ئەو كاتە ڕەنجەڕۆی ڕاستەقینە ئێمەین بۆیە هەقی خۆیەتی تێر و پڕ بگرین چونكە گەڕانەوەیەكی تر نامێنێت بۆ سەر گۆی زەوی.. دەی وەرن با پێكەوە بچینە ناو شاری بەسرەوە خواناسەكەی ئەو شارە (مالیكی كوڕی دینار) بەسەر بكەینەوە بزانین چۆن و بۆچی بەردەوام گریاوە.. فەرموون:..

* عن جعفر قال: رأيت مالك بن دينار (رحمه الله) يتقنع بعباءة، ثم يقول: ((إلـه مالك.. قد علمت ساكن الجنة من ساكن النار، فأيُّ الدارين دار مالك؟ وأيُّ رجلين مالك؟ ثم يبكى)).[٢]

---

١ صفة الصفوة (١/٧٨).

٢ صفة الصفوة (٢/١٩٢).

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: مالیکی کوڕی دینارم بینی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) خۆی لە عەبایەك پێچابوویەوە و بە دەم خۆیەوە دەیووت: ئەی پەروەردگاری مالیك.. تۆ ئێستا دانیشتوانی بەهەشت و دانیشتوانی دۆزەخ دەزانیت و دەیانناسیت.. خۆزگە کام ماڵەیان دەبێتە بەشی مالیك؟ و لە ڕۆژی قیامەتدا مالیك کام پیاوانەیە؟ و پاشان بە کوڵ دەستی کرد بە گریان.

* بەڵام دەبێت هەموو لایەکمان ئەوە بزانین.. کە گریانی بە کوڵ و فرمێسك ڕشتن بە ئەندازەی کانی و سەرچەشمەکان قورسایی ئەتۆمێك سوودمان پێ ناگەیەنێت و لە سزای سەختی پەروەردگار دوورمان ناخاتەوە، ئەگەر دڵسۆزی تەواو و گوێڕایەڵی و ملکەچی و بەندایەتی ڕاستەقینەی لەگەڵدا نەبێت..

پیاوێکی مەزنی خواناسی وەك (معروف الكرخي) پیاو صاڵحەکەی گەڕەکی کەرخ لە شاری بەغدادی شارەکەی ئەبو جەعفەری (منصور)، هەموو جارێك کە دەگریا و فرمێسك لە چاوەکانی قەتیسیان دەکرد بە توندی بۆکزێکی لە خۆی دەدا و بە خۆی دەوت: ئەی نەفسەکەم تا کەی هەر دەگریت و بۆچی دەگریت؟ پیاو بە و دڵسۆز بە بۆ خوا و ئاینە پاکەکەی لە ڕزگار بووانی ڕۆژی ترسناکی قیامەت دەبیت وەك ئەم نموونە جوانە:

* عن احمد بن عبدالله بن ميمون قال: ((كان معروف الكرخي يضرب نفسه ويقول: يانفسي كم تبكين؟ أخلصي، وتخلصي)).[1]

(ابو سعيد الخران)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) یەکێکە لە قوتابییەکانی قوتابخانەی گریان و لە فرمێسك ڕژێنە خێراکان بووە، قسەیەکی زۆر جوانمان بۆ دەکات تا ئێمەش لەو قوتابخانەیەدا ناوی خۆمان تۆمار بکەین و دڵە ڕەقەکانمان کەمێ نەرم بکەین و چاومان بە گریان و فرمێسکەوە ببینین، جا هەر کەسیش چاوەکانی لە ترسی خوای گەورە و میهرەبان گریانیانی بێت و فرمێسك بڕێژن ئەوە خۆی لە خوای گەورە کڕیوەتەوە بەو دڵۆپە فرمێسکانەی‌و دەڵێت:

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٢١٢).

* قال احمد بن عبدالله: سمعت ابو سعيد الخراز يقول: اذا بكت عين الخائفين فقد كاتبوا الله بدمائهم)).[1]

صاڵحان لە دۆڵێكدا دەژین و خەڵكانی تریش لە دۆڵێكی تردا.. پیاوانی خوا حەز دەكەن گریانیان بێت و فرمێسكەكانیان دەگرن و تێر تێر ماچی دەكەنو لە كاتی گریاندا هەست بە شیرینی باوەڕ و دڵسۆزی تەواو بۆ خوا و پێغەمبەر و ئیسلامەكەی لە خۆیاندا بەدی دەكەن..

كەچی دكتۆرەكانی ڕواڵەتی لەش ڕوو دەكەنە (ثابت البناني) و پێی دەڵێن یەك شت هەیە ئەگەر بیكەیت من زەمانەتی چاك بوونەوەی چاوەكانت دەكەم، سابتیش وتی: چیە بیڵێ با بیكەم. دكتۆر وتی: واز لە گریان بێنە ئەگەر دەتەوێت چاوەكانت لە دەست نەدەیت، ثابتیش پێی وت: دكتۆر گیان – بە قوربانت بم – ئەبێت چاوێك چ خێرێكی لێ بەدی بكرێت ئەگەر نەگری و فرمێسك نەڕێژێت لە ترسی خوا و گەورەیی ڕۆژی قیامەت.

گوێ بگرە بۆ ڕیوایەتەكەی:

* قال جعفر بن سلمان اشتكى – ثابت البناني – رحمه الله – عينه، فقال له الطبيب: إضمن خصلة أضمن لك تبرأة عينيك، فقال: وماهي؟ قال: لاتبك، قال: لاخير في عين لاتبكي.

* پیاو چاكان و صاڵحان هەرچەندە خۆیان بشارنەوە و لە ناو جەرگەی شەوەكاندا لەگەڵ خوادا بژین و بە دزی خەڵكیەوە بگرین و قورئان بخوێنن و شەو نوێژ بكەن، بەڵام خوای گەورە كەشفیان دەكات بۆ دەر و دراوسێ تا خەڵكی صاڵحان بناسن و شەرمیان لێ بكەن و بیانكەن بە سەرمەشقی خۆیان و لە ئاستی بەرزی ئەوانەوە بە كەمتەرخەمی خۆیاندا بچنەوە و لەگەڵ خوادا ئاشت ببنەوە و ئەوەتا دایكی سەعیدی كوڕی علقمە (النخعی) كە دراوسێی پیاو چاك و بۆ خوا صولڵحاو (داود الطائي) بوو – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: نێوان ماڵی ئێمە و ماڵی (داود) دیوارێكی نزم بوو،

---

[1] صفة الصفوة (٢/٢٨٢).

بە درێژایی شەو گوێم لە گریان و هاواری بوو، بێدەنگ نەدەبوو. وەك لەم نموونەیەدا گوێت لێ دەبێت:

* عن ام سعيد بن علقمة النخعي قالت: كان بيننا وبين داود الطائي حائط قصير فكنت اسمع حسه عامة الليل لا يهدأ)).[1]

واتە: دایکی سەعیدی کوڕی عەلقەمەی نەخەعی دەڵێ: نێوان ماڵی ئێمەو ماڵی داودالطائي (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دیوارێکی نزم هەبوو بە درێژایی شەو گوێم لە گریانی بوو، وەستانی بۆ نەبوو.

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٩٣).

# سێیەم

## خۆشەویستی قورئان و دەورکردنەوەی بەردەوامی لە دیوانی صاڵحاندا

ئەگەر کەسێك خۆشەویستێکی هەبێت و بەڵام نەتوانێت بیبینێت و زۆر تامەزرۆی بێت.. لە ناکاوێکدا نامەیەکی جوان و ڕازاوەو پڕ لە سۆز و میهری ئەو کەسەی پێ بگات.. چی دەکات لە خۆشیاندا؟ بێگومان مژدانە بەو کەسە دەدات کە نامەکەی بۆ هێناوە و دەست خۆشی لێ دەکات.. دووەم: دەیان جار نامەکە دەخاتە سەر چاوی‌و ماچی دەکات‌و دڵی پێی شاد و کامەران دەبێت.

پاشان دەیکاتەوە و ورد ورد و دێڕ بە دێڕ دەیخوێنێتەوە و پاشان دووبارەو سێ بارەی دەکاتەوە.. لە داواکاریەکانی دەکۆڵێتەوە... بە مژدەکانی خۆشحاڵ دەبێت‌و پێدەکەنێت‌و بە هەڕەشەکانی موچڕکە بە گیانیدا دێت و دڵی لە بەری دەترسێت‌و دەلەرزێت.. شەوەکان دەیگرێت بە سنگیەوە و چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو و خەو لە چاوەکانی تۆراوە و هەر دەڵێت: تۆ بڵێی من بتوانم خاوەنی ئەم نامەیە ڕازی بکەم، گیان و دڵم بە قوربانی بێت...

خوای – عز وجل – یش لە قورئانی کەریمدا وەسفی ئەو کەسانە دەکات بە چاکە کە گوێیان لە ئایەتەکانی قورئان دەبێت دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا دڵیان بۆی دەبزوێت و دڵیان دەکرێتەوە و لەگەڵ هەموو قورئان خوێندنەوەیەکدا یان لەگەڵ هەموو قورئان بیستنێکدا چین بە چین باوەڕیان زیاد دەکات و دڵیان باوەڕی تێدەزێت.

* وەك خوای – عز وجل – دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾﴾[١].

---

١ سورة: الانفال، آية (٢).

دەی دەستم بە دامێنت – با بەم جۆرە بین لەگەڵ قورئاندا – چونکە ئەگەر وانەبین خەڵکانێکی زۆری تر هەن کە ئاوا دەژین لەگەڵ قورئاندا.. خوای – عز وجل – شانازییان پێوە دەکات و پێمان دەفەرموێت: ئەگەر بەو جۆرە جوان و شایستەیە باوەڕ دێنن بە قورئان باشە، وە ئەگەر وا نەکەن، خۆتان زەرەر دەکەن، چونکە ئێمە کۆمەڵێك بەندەی زانا و تێگەیشتووی زۆرمان هەیە کە ئەگەر ئایەتەکانمان بخوێننەوە بەسەریاندا بەسەر ڕوودا دەکەون بە دەمدا و دەگرین، و هاوار دەکەن و دەڵێن: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان و هەموو وەعد و پەیمانەکانی ڕاستن و دێنە دی.. چەناکە لە زەوی توند دەکەن و سوژدە دەبەن و پەیتا پەیتا خشوعیان زیاد دەکات.

برای قورئانیم..قورئان بخوێنە بە ئەندازەی ئەوەندەی دڵ و خەیاڵت و گوێت لە لایەتی و هەر کاتێك خەیاڵ و دڵت لە لای نەما... ئیتر قورئانەکە داخە و هەڵی بگرە.. لە کاتێکی تردا بڕۆرەوە خزمەتی تا بەر هەڕەشەی ئەو ئایەتە پیرۆزە نەکەویت کە خوای – عز وجل – لە وەسفی صالحاندا کە بە (عباد الرحمن) ناوی بردوون و بە دووریان دەگرێت لە کەسانێك کە کاتێك دەگەن بە ئایەتی قورئانی کەریم وەك کەڕ و کوێر دەدەن بە لایدا و کاریگەری تێ ناکات بەڵکو (عباد الرحمن) لەسەر ئایەتەکان دەوەستن و بیر لە ماناکانی دەکەنەوەو بیر لەو کەسەیش دەکەنەوە کە فەرموویەتی وەك لە سورەتی (الفرقان) ئایەتی (٧٣)دا: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾﴾.

کێ لە ئێمە حەز ناکات بگاتە پلە و پایەی فریشتەکان کە لە قورئاندا ناویان بە (السفرة الكرام البررة) هاتووەو لەگەڵ ئەواندا لە بەهەشتدا ژیان بەسەر بەرێت... دەی ئەوە مژدەیەکی گەورەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆ قورئان خوێنانی ئومەتەکەی تا ڕۆژی قیامەت وەك دەفەرموێت:

* عن عائشة – رضي الله عنها – قالت: قال رسول الله (ﷺ)الذي يقرأ القران وهو ماهر به مع السفرة الكرام البررة)).[١]

و هەرگیز نەڵێیت: من جوان نازانم قورئان بخوێنمەوە ئیتر چۆن بیخوێنم و هەڵە دەکەم تیایدا و تووشی گوناه دەبم.. ئەوە لە وەسوەسە و دڵەڕاوکێکانی شەیتانە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك قورئان بخوێنێتەوە تیایدا نارەحەت ببێت و بۆی نەیەت و نەزانێت بیخوێنێتەوە ئەوا دووقاتی پاداشتی ئەو کەسانەی هەیە کە بە جوانی و بە ڕەوانی دەیخوێننەوە وەك فەرموودەکە دەفەرمووێت:

((والذي يقرأ القرآن ويتمتم فيه وهو عليه شاق له اجران)).[٢]

خوشك و برای خوێنەرم.. دەخیلت بم لە دەنگ بەرزکردنەوەی لە ڕادە بەدەر خۆت دوور بگرە چونکە ئەوە زۆر بۆنی ڕیا و پامایی لێ دێت.. حەز نەکەیت خەڵکی بڵێن ماشاء الله قورئان خوێنە! بەڵکو صاڵحان هەوڵیان داوە کەس نەزانێت کە قورئان دەخوێنێت و هەرچەندە بە دەنگی بەرز قورئان خوێندن دروستە بەڵام لە ڕیا ترساون و بە ئیخلاصەوە بۆ خوا خوێندوویانە وەك ئەم نموونەیە:

* كان الربيع بن خثيم – رحمه الله – يدخل عليه الداخل وفي حجره المصحف يقرأ فيه فيغطيه.[٣]

واتە: زانای خواناس و صاڵح – ڕەبیعی کوڕی خوسەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەر کاتێك قورئان بخوێنرایە و لەو کاتەدا یەکێك خۆی بکردایە بە ژووردا بە خێرا قورئانەکەی دادەپۆشت.

هەر بەم شێوەیەی پێشتر و صاڵحانی ئەم ئومەتە بەڕێزە حەزیان نەکردووە جگە لە خوای – عز وجل – کەس بە بەندایەتی و قورئان خوێندنەکانیان بزانێت وەك هاتووە دەڵێت:

---

١ متفق عليه.

٢ متفق عليه.

٣ الجامع لشعب الايمان للبيهقي (٣٤٤/٤).

* قال وكيع: سمعت الاعمش يقول: ((استأذن رجل على ابراهيم وهو يقرأ في المصحف فغطاه فقال: لا يرى هذا انيّ اقرأ كل ساعة)).[1]

واتە: ئەعمەش دەڵێت: پیاوێك داوای یارمەتی هاتنە ژوورەوەی کرد لە ئیبراهیم النخعي و ئەویش لەو کاتەدا قورئانی دەخوێند، قورئانەکەی داپۆشت و وتی: با وا نەزانێت من هەموو وەختێك قورئان دەخوێنم.

* الحليمي — رضي الله عنه — ((وذلك لما روى ان رسول الله (ﷺ) مر بأبي بكر وهو يخافت، ومرّ بعمر وهو يجهر، فقال لأبي بكر: اني مررت بك وانت تخافت، فقال: اني أسمعُ من أُنادي، قال: ارفع شيئاً)) وقال لعمر: مررت بك وانت تجهر، قال: أطرد الشيطان وأقضُ الوسنان، قال: إخفض شيئاً، وقال في النهاية: كلكم قد اصاب)).[2]

واتە: لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە داویەتی بە لای ئەبو بەکری (صديق)دا بەبێ دەنگی قورئانی دەخوێند، دای بە لای عومەری کوڕی خەطابدا بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێندو بە ئەبو بەکری فەرموو: من دام بە لاتدا زۆر بەبێ دەنگی قورئانت دەخوێند، ئەویش وتی: من بۆ ئەو کەسەی دەخوێنم کە لە دڵی خۆمدا دەیدوێنم، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: کەمێك دەنگت بەرز بکەرەوە، و بە عومەریشی فەرموو: دام بە لاتدا بە دەنگی بەرز قورئانت دەخوێند، عومەر وتی: شەیتانی پێ ڕاو دەنێم و خەوتووانیشی پێ بەخەبەر دێنم، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: کەمێك دەنگت نرم بکەرەوە، و پاشان بە هەردووکیانی فەرموو: قورئان خوێندنی هەردووکتان دروستە.

قورئان خويندن خۆی بۆ خۆی بە دەنگی بەرز — بانگەواز کردنە و لەو ڕێگەیەوە وتەی خوا دەدەیت بە گوێی خەڵکیدا و ئەبو بەکری صديق — لە ناو کەعبەدا و بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند و خەڵکی کافر و بێباوەڕ حەزیان لێ دەکرد و دەهاتن گوێیان لێ دەگرت، بۆیە بت پەرستەکان پێیان وت: لە ناو ماڵەکەی خۆتدا قورئان بخوێنە خەریکە سەر لە ژن و مناڵەکانمان تێك دەدەیت و ئەویش لەو ڕۆژە بە دوا لە

---

١ هەمان سەرچاوە (٤/٣٤٥).

٢ المنهاج (٢/٢٣٨).

ماڵەوە دەیخوێند و خەڵکی دەهاتن و لە پەنجەرەوە گوێیان لێ دەگرت تا ئەوە بوو قورئان خوێندنی بە دەنگی بەرز لە مەککەدا لێ قەدەغە کرا.

صاڵحانی ئەم ئومەتە – ڕەحمەتی خوایان لێ بێت – ئەگەر ڕۆژێ تاقەتی قورئان خوێندنیان نەبووبێت یان بۆیان نەخوێنرابێت بە ئاسانی، ئەوە خەفەتیان پێ خواردووە و بۆ خۆیان و دڵە وشکە ڕەقەکەیان گریاون وە یەکسەر زانیویانە کە بە هۆی گوناهێکەوە کە کردوویانە وا ناتوانن قورئان بخوێننەوە. فەرموون لەگەڵ کرزی کوڕی وەبردا بن لەم نموونەیەدا:

* عن ابي داء الحفري قال: دخلت على (كزر بن وبر) – رحمه الله – فاذا هو يبكى فقيل له ما يبكيك؟ قال: انَّ بابي مغلق وان ازارى مسبل ومنعتُ جزئى ان اقرأه البارحة وما هو الاّ من ذنب أذنبته)).[1]

واتە: ئەبی داء دەڵێ: ڕۆیشتم بۆسەردانی _کرزی کوڕی وبر_ دەبینم بەکوڵ دەگری، پێیان ووت: بۆچی وادەگریت ؟ ووتی: دەرگام لێ داخراوە و شەرواڵەکەم شۆڕبوەوە و وام لێهاتووە دوێنێ نەمتوانی بەشە قورئانەکەم بخوێنمەوە و دەشزانم بەهۆی هیچ شتێکەوە نی یە جگە لەوەی کە تاوان و سەرپێچیەکم کردوە.

بۆیە برای موسڵمانم ئەگەر گوناهێکت لەدەست دەرچوو خێرا چاکەیەك بە دوایدا بکە با گوناهەکانت نەکەونە دوای یەك و زنجیرە گوناه دەورت نەدات ئەو کاتە حەز و خۆشەویستی خواناسیت تیا نامینێت و لاشەت قورس دەبێت لە ئاستی نوێژ و ڕۆژو و قورئان خوێندن و فێرکردن و هتد....

قورئان خوێندن بە پەلە پەل و بە وشکی و بەبێ خەمباری و مەحزونی و بە ئاوازی ناخۆش – کاری پیاو چاکان و صاڵحان نییە .. و صاڵحان – زۆر غەمبار دەبن کاتێك کەسێك ببینن بە پەلەپەل یان بە ئاوازی ناخۆش قورئانی پیرۆز بخوێنن و سەرزەنشتی ئەو جۆرە کەسانە دەکەن وەك ئەو خوشکە خواناس و صاڵحەی کە نەیهێشت عبدالرحمن بە پەلەپەل و بێ ورد بوونەوە قورئان بخوێنێت ئەمە چۆن بوو:

---

١ صفة الصفوة (٢/٤٩).

* عن محمد بن يحيى ابي حاتم قال: حدثني عبدالملك بن شيب عن رجلٍ من ولد ابن ابي ليلى قال: دخلت على امرأةٍ وانا اقرأ سورة (الهود)، فقالت: يا عبدالرحمن اهكذا تقرأ سورة الهود؟! والله اني لفيها منذ ستة اشهر ما فرغت من قراءتها..[١]

واتە: عبدالملك ی کوڕی شیب لە یەکێك لە نەوەکانی (ابن ابی لیلی)وە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بۆ سەردان چووم بۆ ماڵی خوشکێکی موسڵمان و کاتێك چوومە ژوورەوە بە دەم خۆمەوە سورەتی هودم دەخوێندەوە، کاتێك ئەو ئافرەتە گوێی لێ بوو سەرسام بوو لەو قورئان خوێندنە وشکەی و بە سەرسامیەوە پێی وتم: ئەی عبدالرحمن تۆ هەمیشە ئا بەو چەشنە سورەتی هود دەخوێنیت؟ (واتە بە پەلە و بەبێ ئەوەی بیر لە وشەکانی بکەیتەوە) دەی سوێند بە خوا من شەش مانگە لەو سورەتەدام هێشتا تەواوم نەکردووە و لێی دەرنەچووم..

بڕوانە ئەی برای موسڵمانم ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت لەم سەردەمەدا سیرەتی صالحان لە خۆتدا زیندوو بکەیتەوە.. ئەگەر ئەتوانی بە دەم گریانەوە قورئان بخوێنەو زۆر بیر لە وشەکانی بکەرەوە و ئەگەر لێشی تێناگەیت و زمانی عەرەبی نازانیت بەسە دڵت پڕ بێت و چاوەکانت فرمێسکیان پێدا بێتە خوارەوە هەر بەوەی بزانیت ئەم قورئانەی تۆ دەیخوێنیت وتەی بەدیهێنەری هەموو بوونەوەرە فەرموو لەگەڵ قورئان خوێندنەوەی هەندێ لە پیاو چاکان و گەورە صالحانی ئەم ئومەتەی پێغەمبەر (ﷺ):-

* عن يحيى بن عبدالرحمن قال: سمعت سعيد بن جبير – رحمه الله – يردد هذه الاية ﴿ وَٱمۡتَـٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ حتى الصبح.[٢]

واتە: یەحیای کوڕی عبدالرحمن دەڵێت: گوێم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر بوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی سورەتی یاسینی دووبارە دەکردەوە لە شەونوێژدا تا بەیانی کە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱمۡتَـٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، واتە: لە ڕۆژی

---

١ هەمان سەرچاوە.

٢ صفة الصفوة (٢/٥٠).

قیامەتدا بە تاوانباران دەوترێت بڕۆنە ئەولاوە و لە موسڵمانەکان جیا ببنەوە هەی موجریمەکان.

* عن قاسم بن ابي ايوب قال: سمعت سعيد بن جبير – رحمه الله – يردد هذه الاية ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمًا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾[1] في الصلاة بضع وعشرون مرة.[2]

واتە: قاسمی کوڕی ابی ایوب دەڵێت: گوێم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر بوو لە نوێژدا بیست و ئەوەندە جار ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمًا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾، واتە: بترسن لە ڕۆژێك کە تیادا دەگەڕێنەوە بەردەستی خوا.

مرۆڤ ئەگەر بە وردی و بە سرنجەوە بڕوانێتە مانای ئایەتەکان نەك هەر ناتوانێت بە خێرایی و پەلە پەل قورئان بخوێنێت بەڵکو لەوانەیە زیاتریش لەوە کاریگەری تێ بکات وەك ئەم نموونەیەی بەسەر سەرقافڵەی صالحانی ئیسلام – شەیبانی ڕاعی – دا هاتووە ئەوە چۆن بووە؟

* قرأ رجل على شيبان الراعي – رحمه الله – الاية: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ﴾[3] فذهب على وجهه فلم ير سنة، فبعد الحول لقيه الرجل فقال له: من أين؟ قال: من ذلك الحساب الدقيق.[4]

واتە: جارێکیان پیاوێك قورئانی دەخوێند بەسەر – شیبان الراعی – دا هەر کە گەیشتە ئایەتی ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ﴾، واتە: هەر کەسێك ئەوەندەی مسقالە زەرەیەك ((کە بە چاو نابینرێت چاکە یان گوناه بکات لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە موحاسەبەی لەسەر دەکات)) ئەوەندە کاری کردە سەر شەیبان کە بۆ ماوەی یەك ساڵ دیار نەما و خۆی ون کرد و پاش ساڵەکە دەرکەوتەوە و هەمان

---

١ سورة البقرة الآية (٢٨١).

٢ صفة الصفوة (٢/٤٩).

٣ سورة الزلزلة الآية (٧).

٤ صفة الصفوة (٢/٢٠٧).

پیاو پێی گەیشتەوە و لێی پرسی ئەوە چیت لێهات؟ هەر دیار نەماویت؟ شەیبانیش لە وەڵامدا وتی: لە ترسی ئەو لێپرسینەوە وردە!..

* صاڵحان مەبەستیان نەبووە ئایەتی زۆر بخوێنن و زوو لە خەتمەکەیان ببنەوە.. کەچی هەندێ برای موسڵمان لەڕەمەزانی پیرۆزدا زۆر بەئاسانی دەڵێت من شەش! یان هەشت خەتمم کردوە! کاتێ لە قورئان دەورکردنەوەکانی وردبومەوە دەبینم بەس بەچاو دەیخوێنێ و یەك دەقە جارێ لاپەڕەیەك هەڵدەداتەوە و دەچێتە لاپەڕەکەی تر!!

بەڵام بابچینە خزمەت پیاو صاڵحانی ئومەت ((محمدی کوڕی کعب ی قرضی)) و بزانین حەز دەکات ئابەو جۆرەی سەرەوە قورئان بخوێنێت یان حەز دەکات لێی وردبێتەوە و بگری فەرموون بابزانین چی دەڵێت:

* قال محمد بن كعب القرضي – رحمه الله – (لأن اقرأ في ليلة حتى أصبح ((إذا زلزلت الارض زلزالها)) وسورة القارعة، لا أزيد عليهما واتفكر فيهما واردّدهما احب اليّ من ان اهزّ هذا القران هزّا.[1]

واتە: محمدی کوڕی کەعبی قەرەزی –ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت حەزدەکەم شەوێك هەتا بەیانی تەنها هەردوو سورەتی –زلزال و قارعە– بخوێنم و لەوە زیاتر نەخوێنم و دوبارەیان بکەمەوە و لە ماناکانیان وردبیمەوە پێم خۆشترە لەوەی ئەم قورئانە لەم پەڕ بۆ ئەو پەڕی بهەژێنم واتە گشتی دەوربکەمەوە لەو شەوەدا–.

* ئەوەش امام غزالی یە – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – ئەم مانایە دووپات دەکاتەوە و دەفەرمووێت: هەندێ لە سەلەفی (صالح) ئەگەر سورەتێکی قورئانیان بخوێندایە و دڵ و خەیاڵیان لە لای نەبوایە دووبارەیان دەکردەوە وەك دەڵێت:

* قال الامام الغزالي (رحمه الله) كان بعض السلف اذا قرأ السورة ولم يكن قلبه فيها اعادها ثانية.[2]

---

١ صفة الصفوة (١/٩٣).

٢ موعظة المؤمنين من احياء علوم الدين ل (٨٠).

برای موسڵمانم... صاڵحانی ئەم ئوممەتە موبارەکەی ئیسلام زۆر خەمی ئەوەیان بووە کە خوای گەورە قورئانیان لێ بسەنێتەوە و لە بیریان بەرێتەوە ئیتر یان بە هۆی لاوازبوونی باوەڕیان – پەنا بە خوا – یان بە هۆی سەرقاڵ بوونیان بە کاروباری دنیایانەوە و نەیانپەرژێتە سەر قورئان خوێندن و دەورکردنەوەی، با بزانین (ابو حلال العتكى) لەم بارەیەوە چی دەفەرمووێت:

* كان ابو حلال العتكي – رحمه الله – يدعوا دائماً حتى في غمرات الموت: ((اللهمّ لاتسلبني القرآن)).[1]

واتە: زانای خواناس – ئەبو حەلالی عەتکی – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – هەموو کاتێك لە خوا دەپاڕایەوە کە قورئانی لێ نەسێنێتەوە و تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا هەر دەیوت: ئەی خوای پەروەردگارم قورئانم لێ نەسێنیتەوە و دڵم خاڵی نەکەیت لێی و خۆشەویستی قورئان لە ناو دڵمدا هەڵنەکەنیت و لای نەبەیت.

بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە واز لە ختمی قورئانی پیرۆز بهێنین بە بیانووی ئەوەی کە چەند ئایەتێکی کەم بخوێنین و بەڵام کار لە دڵ و دەروونمان بکات، بەڵکو ئەم دوو شتە زۆر جیان و دژی یەکتری نین بە جۆرێك خوێنەرێکی بەڕێز بڵێت نازانم زۆر بخوێنم یان وەك ئەو پیاو چاکانە بە ئایەتێك یان دووان تا بەیانی کیفایەت بکەم؟

لە وەڵامدا دەڵێم: هیچی تێدا نیە ئەگەر قورئان زۆر بخوێنیت لە کاتێکداو لە کاتێکی تریشدا حەز دەکەیت تا بەیانی شەو نوێژ بکەیت و تەنها یەك ئایەت دووبارە بکەرەوە..

ئەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە شەو تا نوێژی بەیانی یەك ئایەتی دووبارە کردۆتەوە بەڵام لە مەوسیمی حەجدا و لە ناو کەعبەدا لە یەك شەودا هەموو قورئانی خوێندووە لە ڕکاتی یەکەمدا جگە لە (قل هو الله) نەبێت کە لە ڕکاتی دووەمدا خوێندوویەتی. ئەمە چۆن بووە؟

---

١ صفة الصفوة (٢/١٥٢).

* عن حماد قال: ان سعيد بن جبير – رحمه الله – قرأ القرأن في الركعة الاولى في الكعبة، وقرأ في الركعة الثانية بـ(قل هو الله احد).[١]

ئەمە و ئەم چەند نموونەیەی تریش کە بۆت باسی دەکەم کە زانا صاڵحەکانی سەردەمە جیاجیاکانی دوای هاوەڵان چۆن قاچەکانیان ماندوو نەبووە و قورئانیان لە نوێژدا خوێندووە تەنانەت ئەوەندە زۆریان خوێندووە لەوانەیە هەندێ موسڵمانی ئەم سەردەمە سەری سوور بمێنێت و سەرسام ببێت و لە خۆی بپرسێت: تۆ بڵێی ڕاست بێ.. لە یەك مانگدا (٣-١٠) خەتمیان کردبێت؟!

بەڵێ ئەمە ڕاستە چونکە ئەگەر لەو ڕووانگەیەوە سەیریان بکەین کە چاك لە قورئان حاڵی بووبوون و بە باشی خوای خۆیانیان ناسیووە و دڵ و دەروونیان لەم دنیا فانیە پچڕاندووە و بەستوویانە بە قیامەتەوە و عەرشی ئەعلاوە.

وەك کەسێك کە زۆر خۆگربێت و هەموو ناڕەحەتی و سەرما و گەرمایەك قبووڵ بکات لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا شتێکی زۆر ئاساییە و باوەڕی پێ دەکەین، دەی صاڵحانیش دڵ و دەروونیان بە خوای خولقێنەریان و بە ڕۆژی قیامەت و بەهەشتەوە بەستراوە و ئاساییە کە لەو پێناوەدا زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ بە ڕۆژوو بووبن و هەمیشە قورئانیان خوێندبێت.

* قال ابو الاشهب: كان ابو رجاء العطاردي يختم بنا في رمضان كل عشرة ايام.[٢]

واتە: ئەبو ڕەجای عەتاردی لە مانگی ڕەمەزاندا (١٠) ڕۆژ جارێك خەتمێکی قورئانی پێ دەکردین، واتە: سێ ڕۆژ جارێك خەتمێکی تەواو کردووە، بەڵام لەوانەیە لە هەمان کاتیشدا بە یەك ئایەتی کاریگەر یان بە زنجیرە ئایەتێکی کاریگەر و لە دوو ڕکاتدا شەوێکی تا بەیانی بەسەر بردبێت چونکە قورئان خوێندن و گریان و کارلێکردن زیاتر لە کاتە تەنهایی و چۆڵەکاندا ڕوودەدات و بە دووریش دەبێت لە هەموو ڕیاکاری و ڕووپامایيەك.

---

١ صفة الصفوة (٢/٥٠).

٢ صفة الصفوة (٢/١٤٥).

ئەی ئەو خوشك و برایانەم كە ئەمانەوێت كۆمەڵە ورزشێكی قورس بكەین لە بواری صالح بووندا لە سەرەتاوە نارەحەت و لەوانەیە لە لایەن نەفسی (الأمارة بالسوء)و شەیتانی – مرۆڤ و جنۆكەوە – بەربەستی زۆرت بۆ دروست بكەن و نەهێڵن بە ئاسانی ممارەسەی ئەو وەرزشە گرنگانە بكەیت.

دەی وەرە سەیری ئەو ڕووداوە بكە كە (ابن الجوزی) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەگێڕێتەوە لە عوروەی كوڕی زوبێرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) بزانە ڕێگای صالح بوون زۆر قورسە و دەبێت هیچ هۆكارێكی گەورە و بچووك نەبێتە هۆی واز هێنان و فەوتانی خەڵ بە خەڵی ئەو وەرزشە گرنگانە لە ژیانتدا ئەمە چۆن بووە؟

* قال ابن الجوزي – رحمه الله – كان عروة بن الزبير يقرأ ربع القرآن كل يوم نظراً في المصحف، ويقوم به الليل، فما تركه الاّ ليلة قطعت رجله ثم عاود من الليلة المقبلة.[1]

واتە: (ابن الجوزی) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عوروەی كوڕی زوبێری كوڕی عەوام (خوایان لێ ڕازی بێت) خۆی وا ڕاهێنابوو بەردەوام ڕۆژانە یەك لەسەر چواری هەموو قورئانی لە ناو قورئانەكەدا دەخوێندەوە و لە كاتی شەویشدا و لە شەو نوێژدا بە لەبەر دەیووتەوە.. و ئەم ڕەوشتە گەورە و نارەحەتەی واز لێ نەهێناوە مەگەر ئەو شەوە نەبێت كە قاچەكەیان بڕیەوە و لە شەوی داهاتوودا بەردەوام بوویەوە لەسەری.

خوشكی صالیحە و برای صالحم... خوێندن و خەتم كردنی قورئان هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تا ئەمڕۆ گرنگی و قورساییەكی لە دڵ و دەروونی موسڵمانەكاندا هەبووە، تەنانەت پێغەمبەرمان (ﷺ)– وەفدی گەورە هاتوون بۆلای ئەو كەمێ دواكەوتووە لێیان و فەرموویەتی: حەزم نەكردوە–حیزبەكەم تەواو نەكەم و بە ناتەواوی بەجێی بهێڵم.

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) ڕوودەكاتە هاوەڵان و ڕێگای ئەوەشیان بۆ دادەنێ كەئەگەر شەو بۆیان نەكرا بەشەو قورئانەكەیان بخوێنن با لە ڕۆژدا لە دەستتان دەرنەچێت و بەسەریا نەڕۆن و بیخوێنن...

---

[1] صفة الصفوة (٦٢/١).

هەروەها کاتێك لە قورئان خوێندندا دەگەیشتە خەتم کردنی، هەموو ئەندامانی خێزانەکەی کۆدەکردەوە و فەرمانی پێدەدان کاتێك گەیشتنە کۆتایی (الله اکبر) بکەن، دووعای خێر زۆر بکەن چونکە دوعا لە کاتی خەتمی قورئاندا گیرایە.

* عن الثابت البناني، عن انس (رضي الله عنه) انه كان اذا جمع القرآن جمع اهله.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێ بێت) هەر کاتێك لە قورئان خوێندندا بگەیشتایەتە خەتم و کۆتایی، هەموو ئەندامانی خێزانەکەی خۆی کۆدەکردەوە بۆ ئەوەی (الله اکبر) بکەن و لە کاتی دوعاکەشیدا (امین) بکەن.

* اخبر شعبة عن الحكم قال: ارسل مجاهد وعبد بن ابي لبابة (اليّ) وقالا: انما ارسلنا اليك انا نريد ان نختم القران، وكان يقال ان الدعاء يستجاب عند ختم القرآن فلما فرغوا من ختمه دعوا بدعوات.[1]

واتە: شوعبە لە حەکەمەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەردوو زانا و پایە بەرز – مجاهد و عبدی کوڕی (ابی لبابە) ناردیان بە دوامدا و پێیان وتم: ناردوومانە بە دواتدا چونکە دەمانەوێت قورئان خەتم بکەین، و دەڵێن لە کاتی خەتم کردنی قورئاندا دوعا گیرایە، و کاتێك لێبوونەوە لە خەتمەکە پێکەوە لە خوای گەورە دەپاڕانەوە و دوعای خێریان دەکرد.

هەردوو چاوەکەم خوێنەری خۆشەویستم.. بەردەوام کاتەکان بە هەل بزانە و ئەگەر یەك سوڕەتی کورتیشت خوێندبێت – بێ قورئان مەبە.. ئەوەش سەرەتایەکە لە سەر وەرزشی – صالح بوون و بەرەو خوا چوون..

ڕۆژەکانی تەمەنت وەك چرکەی سەعات بە خێرایی تێ دەپەڕێت ئەوەی کە شانازی پێوە بکەیت قورئان خوێندنەکانتە، ئەوەی کە بە تەمای پاداشتی یەك ئایەت بە دە خێر و پاداشت بێت، ئایا تۆ یەکێ لە پێشەوایانی صالحین بە ناوی – عبدالله ی کوڕی ئیدریس – دەناسیت؟ ئەو پیاوە بەرزە زۆر شانازی کردووە بەو ژمارە زۆرەی خەتمەکانی ژیان و گەیشتۆتە ئاستێکی بەرزی وا لە ناڕەحەتی و نەهامەتیەکانی

---

[1] الجامع لشعب الايمان للبيهقي (٤/٢٢٧).

قیامەتی خۆی بێ خەم بوو تەنانەت گوێ بگرە لێی کە چۆن بە خەتمەکانیەوە شانازی دەکات و دڵی کچەکەی خۆش دەکات بەوەی کە پێویست بە گریان و شیوەن ناکات بۆی ئەو چوار هەزار جار قورئانی خەتم کردووە؟

* قال حسيم بن عمرو العنقري: لما نزل بعبدالله بن ادريس الموت، بكت ابنته، فقال: لا تبكي فقد ختمتُ القران في هذا البيت اربع الاف ختمة.[1]

واتە: حەسیمی کوڕی عومەری عەنقەری دەڵێت: کاتێك مردنی عبدالله ی کوڕی ئیدریس هاتە پێشەوە و لە سەرەمەرگدا بوو، کچەکەی دەستی کرد بە گریان و هاوار و فرمێسك ڕشتن، لەو کاتەدا عبدالله ی خواناس و قورئان خوێن بە هۆش خۆی هاتەوە و ڕووی کردە کچە شیرینەکەی و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وت: مەگری باوکت پێویستی بە گریان نییە، ئا لەم ماڵەدا چوار هەزار جار قورئانی پیرۆزم خەتم کردووە و لەم پەڕ بۆ ئەو پەڕی قورئانم خوێندۆتەوە..

یاألله.. ئەم دینە پاکە.. ئەم قورئانە پاراوە بەڕێزە.. چۆن دڵ و دەروونەکان نەرم دەکات و کاریگەری بەجێ دێڵێت لەسەر دڵەکان.. تەنانەت هەندێ لە پێشەوا و سەرمەشقەکانی صاڵحانی ئومەتی ئیسلام، ئایەتە ترسێنەرەکانی قورئان وا کاری تێکردبوون کە لە کاتی نوێژدا و لە کاتی قورئان خوێندندا گیانیان دەرچووە و مردوون، ئەمەی بەسەر (زراری کوڕی اوفى) هاتووە چۆن بووە؟

* عن بهز بن حكيم قال: صلى بنا زرار بن اوفى في مسجد بني قشير، فقرأ الاية: ((فاذا نقر في الناقور)).[2] فخرَّ ميتاً فحمل الى داره فكنت فيمن حمله الى داره.

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەڵێت: جارێکیان زیراری کوڕی ئەوفا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە مزگەوتی بەنی قوشەیر بەرنوێژی بۆ دەکردین و لە قورئان خوێندنەکەیدا گەیشتە ئەم ئایەتە: ((فاذا نقر في الناقور))، واتە: بیر لەو کاتە بکەنەوە کە فوو دەکرێت بە نەفخی صوردا و هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی دەمردن.

---

١ صفة الصفوة (١١٢/٢).

٢ سورة المدثر (٨).

لەو کاتەدا زیرار کەوت بە لا و خەڵکەکە نوێژیان بڕی و پەلاماریان دا دەبینن مردووە، و منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی کە هەڵمانگرت و بردمانەوە بۆ ماڵەکەی خۆی (خوا لێی خۆش بێت).

دەبێت موسڵمان ئا بەو جۆرە لە مانا و واتاکانی قورئان تێ بگەن.. خۆ ئەگەر گیانیشمان دەرنەچێت بە بیستنی ئەو ئایەتە ترسێنەرە ترسناکانەی کە باسی ڕۆژی قیامەت و سزای سەختی خوایی دەکات لەناو ئاگری جەهەنەمدا، دەی با خەفەتبارمان بکات و دڵمان ڕابچەڵەکێنێت و بەرەو چاکە و خێرخوازی بمانبات و لە گوناە و خەراپەکاری و سەرپێچی دوورمان بخاتەوە.

ئەوەش چوارەمین خەلیفەی ڕاشیدی پێغەمبەرەکەمانە – علی کوڕی ئەبو طالب (خوا لێی ڕازی بێت) ئامۆژگاریمان دەکات بەوەی کە خێر نییە لە قورئان خوێندنێکدا کە بیر لێ نەکردنەوە و وردبوونەوەی بە دوادا نەیەت و کاریگەری لەسەر دڵ و دەروونەکان بەجێ نەهێڵێت، و ئایا لەو بارەیەوە چیمان پێ دەفەرموێت؟:

* قال علي بن ابي طالب (رضي الله عنه): (لا خير في عبادة لا فقه فيها ولا في قراءة لا تدبر فيها)).[1]

واتە: علی کوڕی ئەبو طالب (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: خێر و چاکە نییە لە عیبادەت و خواناسییەکدا کە لە فقه و شارەزاییەوە نەبێت، و خێریش نییە لە قورئان خوێندنێکدا کە وردبوونەوە و بیر لێ کردنەوەی بە دوانا نەیەت.

ئەگەر بمانەوێت بچینە ناو گوڵزار و دیوەخانی بۆن خۆشی صاڵحانەوە دەبێت لە قورئان خوێندندا ماندوو ببین و خۆمان بڕەنجێنین و ئەشکەنجە بخۆین و کەمێك زیاتر لە نوێژدا بمێنینەوە و ئایەتی زیاتر بخوێنین تا وردە وردە نەفسی سەرکەشمان ڕا بهێنین لەسەر قوربانیدان و ماندووبوون لە قورئان خوێندندا ئەو کاتە شایستەی ئەوە دەبین کە بچینە لیستی سپی صاڵحانەوە و خوای گەورەیش لێمان ڕازی ببێت و لە ناو فریشتەکانیدا شانازیمان پێوە بکات.

---

[1] موعظة المؤمنين من احياء علوم الدين ل ٧٩.

طلق ی کوڕی حبیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چێژی وەرگرتووە لەوەی لە نوێـژدا ئەوەندە قورئان بخوێنێت کە پشتی بکاتە ئێش لەو پێناوەدا.

سبحان الله، حەز لـەوە دەکـات لـە پێنـاوی قورئانـدا لـە نوێـژدا ئەوەنـدە بـە پێـوە بوەستێت پشتی بکات ئێش ئەمە چۆن بووە؟:

* كان طلق بن حبيب الغزي يقول: اني لأحب ان اقوم لله حتى يشتكي ظهري، فيقوم فيبتديء بالقران حتى يبلغ سورة الحجر ثم يركع.[1]

واتـە: پیاوچـاك و خوانـاس (طلـق ی کـوڕی حبیبـی غـەزی) دەیـووت: مـن زۆر زۆر حەزدەکەم لە حوزوری خوادا و لە نوێژدا ئەوەندە بوەستم و قورئان بخـوێنم تـا پـشتم دەکاتە ئێش، و ئەو پیاوە مەزنە دەچووە ناو شـەونوێژ و دەسـتی دەکـرد بـە قورئـان خوێندن تا دەگەیشتە سورەتی (الحجر) کە بە تەواوەتی پشتی دەیکردە ئـێش ئـەوجا دەڕۆیشت بە ڕکوعدا.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٧٣).

# چوارەم

## شەو نوێژ... ئەی بەچێژترین و قورسترین بەندایەتی:

شەونوێژ، دوو بڕگەی سادەیە یەکەمیان – شەو – دووەمیان – نوێژ – یەکەمیان کاتێکی زۆر کش و مات و بێدەنگە نە گاڵە گاڵ و نە قیرەقیری خەڵکی و نە دەنگی ئوتومبێل و نە دەنگی کارگە جیاجیاکان.. نە دەنگی چۆلەکە و باڵندەکان.. هەموو خەڵکی لە خری خەودان و کەس بە خەبەر نییە..

بەڵام دەستەیەك لە بەندەکانی پەروەردگار وەك من و تۆ مرۆڤن حەزیان لە حەوانەوەیە، حەزیان لە خەوە، بەڵام ئاخۆ دەبێت شەونوێژ چ تامێکی خۆشی لە ناو خۆدا حەشاردابێت وا ئەم پێرە صاڵحە خەو لە چاوەکانیان دەتۆرێنن و وجود بۆ حەوانەوە و جێگەی نەرم و گەرم دانانێن...

بە ئەسپایی نەبادا ماڵەوە بە خەبەر بێن لەسەرخۆ کێلۆنی دەرگاکە دەجولێنن و دەچن بۆ دەستشوری و دەستنوێژێکی پاك دەگرن و هەر بەو ئاسپاییەوە دەگەڕێنەوە ژوورەکەی خۆیان و گڵۆپەکان دەکوژێننەوە و پێخەف دەپێچنەوە و بەرماڵەکەی دادەخات و دەچێتە دنیای شەونوێژەوە...

شەونوێژ – بەندایەتییەکی زۆر قورس و ناڕەحەتە – کەم کەس پێی دەوێرێت –و ئەو کەسانەی کە شەونوێژ دەکەن لە نیوە شەودا و لەناو جێگەی گەرم و نەرم دێنە دەرەوە و دەست نوێژێکی جوان دەشۆن و دێنە سەر بەرماڵ و بە دەم گریانەوە قورئان دەخوێنن و – ئەوانە خوای –عز وجل– نیازی گەورەی پێیان هەیە و بۆ کاری گەورە و گران ئەو وەرزشە قورسەیان پێ دەکات..

نابینی خوا – عز وجل – ڕوو دەکاتە پێغەمبەرەکەی و پێی دەفەرموێت:

* ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحۡمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾.[1]

---

١ سورة (الاسراء) الآية ٧٩.

واتە: لە ناو شەوەکاندا بەردەوام قورئـان بخوێنـە چـونکە زۆر باشـە بـۆت و خێـرت دەگات چونکە لەوانەیە خوا کارێکی گەورەی پێت هەبێت و ئامادەسازیت بۆ بکات بـۆ ئەوکارە، کەواتە ((المقام المحمود)) بۆ هەموو موسڵمانێك نی یە، بۆ ئەوانە نـی یـە کـە بڕیاریان داوە لە دوای نوێژە فەرزەکان هیچ سونەتێك نەکەن و لـە دوای ڕەمـەزان هـیچ ڕۆژێك بە ڕۆژو نەبن و خەوی خۆشیش لە خۆیان تێك نەدەن.

پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) بـە خـۆڕایی نەگەیشتە پلـەی – مقامـاً محمـودا – کـە هەموو بیناسێت و لە سەردەمی خۆیدا لەگەڵ پلە و مەقامی پێغەمبەرایەتیدا، سەرۆکی سـەرجەم وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئیـسلام بـوو، ئـەوە (١٤٣٠) سـاڵ تێپـەڕیوە کەچـی شوێنکەوتووانی لە زۆربووندان و پووکانەوەی بەسەردا نایەت، ورد بەرەوە بزانـە چـۆن بووە لە شەوە تاریك و ساردەکاندا:

* عن عائشة (رضي الله عنها وعن ابيها) قالت: كان النبي يقوم من الليل حتى تتفطّر قدماه، فقلت له: لمَ تصنع هذا يا رسول الله وقد غفر الله لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر؟ قال: افلا اكون عبداً شكورا؟[1]

واتە: دایکی باوەڕداران – عائیشەی کچی ئەبو بەکری (صـدیق) – خـوا لـە خـۆی و بـاوکی ڕازی بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەنـدە شـەونێژی کردبـوو، بـە پێـوە وەستابوو – ژێر پێکانی ئاوسابوون، و منیش پێم وت: بۆچی وا دەکەیت بە خۆت ئەی پێغەمبەری خـوا، خـۆ خـوا لـە هـەموو گوناهـەکانی پێشوویش و داهاتوویـشت خـۆش بـووە؟ لـە وەڵامـدا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: دەی کەواتـە ئـەی بەندەیـەکی سوپاسگوزار نەبم؟! واتە لەسەر ئەو بەخششە گەورەیەی بە سەرمەوەیە؟

پێغەمبەرمان (ﷺ) چـاك دەیزانـی کـە ئـەو ڕێبـازە گـەورە و قـورس و گرانەی کـە گرتوویانەتە بەر ئەوە دەخوازێت کە شوێنکەوتووانی خۆیان پڕ چەك بکـەن بـە چـەکی تـەقوا و خواناسـی و شـەونوێژ چـونکە ئـەرکی داهـاتووی هـاوەڵانیش لـە ئـەرکی ئـەو سووکتر نابێت و بگرە ئەرکی ئەوان لە پاش مردنـی پێغەمبەرەکـەیان قورسـتر دەبێـت

---

١ رياض الصالحين لا ٢٦٩. متفق عليه.

چونکە پانتایی بەرپرسیارێتیان بەرفراوانتر دەبێت لەگەڵ فراوان بوونی سنووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئیسلام.

بۆیە هەموو جارێك هانی هاوەڵانی دەدا کە فرسەتەکانی شەو لە دەست نەدەن و بە خەو نەیبەنە سەر و تەنانەت هەندێ کات خۆی دەچوو دەیدا لە دەرگا و بە خەبەری دەهێنانەوە بۆ شەونوێژکردن.

* عن علي بن ابي طالب (رضي الله عنه) ان النبي (ﷺ) طرقه وفاطمة ليلاً، فقال: (الا تصلّيان؟).[1]

واتە: علی کوڕی ئەبو طالب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) شەوی درەنگ دەهات بۆ ماڵمان و دەیدا لە دەرگاکە و بە هێمنی و لەسەرخۆوە دەیفەرموو پێمان: (ئایا هەڵناسن نوێژ بکەن، واتە هەستن بۆ شەونوێژ).

هەروەها بە هەموو شێوازێك هانی تەنانەت منداڵ و لاوانی هاوەڵانی دەدا تا لە چێژو لەزەتی شەونوێژ بێبەش نەبن، سەیری ئەم شێوازە جوانە بکە لە بواری دەروون ناسیدا و بنەماکانی شێوازی ئاخافتنی جوانی لێ وەربگرە:

عن سالم بن عبدالله بن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) عن ابيه: ان رسول الله (ﷺ) قال: ((نعم الرجل عبدالله لو كان يصلى بالليل)) قال سالم: فكان عبدالله بعد ذلك لا ينام من الليل الاّ قليلاً.[2]

واتە: سالمی کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (خوایان لێ ڕازی بێت) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا فەرمووی پێی: عبدالله باشترین پیاوە ئەگەر هاتوو شەونوێژیشی بکردایە.

سالم دەڵێت: لەو ڕۆژە بە دوا عبدالله — باوکم — شەو نەدەخەوت و هەر شەونوێژی دەکرد مەگەر زۆر بە کەمی.

هەروەها هانی هاوەڵە شیرینەکانی خۆی دەدا تا بەردەوام لە خزمەت شەونوێژدا بن و نەکەن بەینا و بەین ئەنجامی بدەن واتە: ماوەیەك بیکەن بە گەرمی و ماوەیەکیش

---

1 هەمان سەرچاوە لا ٢٦٩ متفق عليه.

2 متفق عليه.

وازی لێ بهێنن.. چونکە ئەوە خۆراکی گیان و دڵە نابێت لێی ببڕێت چونکە هەر کاتێك لێی بڕا ئەوە دڵی دەمرێتو دەچێتە ڕیزی بێ ئاگاو غافڵان وەك بە عبدالله ی فەرموو:

* عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله (ﷺ) يا عبدالله لا تكن مثل فلان، كان يقوم الليل فترك قيام الليل.[١]

واتە: ئەی عبدالله – گیان – نەکەی هەرگیز وەك فلان کەس وابیت، کە ماوەیەك – بە گەرمی – شەونوێژی دەکردو کەچی پاش ماوەیەك شەونوێژی واز لێ هێنا.

ئەو کارەیشی کە بە داخەوە ئەمڕۆ زۆرینەی خوشكو برا موسڵمانەکانمانی تێکەوتووەو وازی لێ ناهێنن – واتە شەو دەخەون تا بەیانی بە خەبەر نایەنەوە مەگەر بۆ نوێژی بەیانی – کارێکی زۆر ترسناکە بۆ سەر دڵو دەروونو بیروباوەڕ..

هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرمان (ﷺ) بە گشتیو بە ژنو پیاوو منداڵو پیرەوە شەونوێژیان نەفەوتاوە مەگەر بە دەگمەنو زۆر بە کەمی یان نەخۆش بووبن.. بۆیە جارێکیان باسی پیاوێکیان کرد لە لای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کە شەونوێژ ناکاتو تا بەیانی تەخت لێی دەخەوێت – وەك خۆمانو ئەم ڕۆژگارە – با بزانین لە وەڵامدا دەربارەی ئەو پیاوە چی فەرموو:

* عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: ذكر عند النبي (ﷺ) رجل نام ليلة حتى الصبح قال: ذاك رجل بال الشيطان في اذنيه او قال في اذنه.[٢]

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لە حزوری پێغەمبەردا (ﷺ) باسی پیاوێك کرا شەو دەخەوێتو تا بەیانی بە خەبەر نایەتەوە، واتە: هەڵناستێت بۆ شەونوێژکردن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوە کەسێکە شەیتان میزی کردۆتە ناو هەردوو گوێیەوە یان میزی کردۆتە گوێیەوە.

ئای پێشەواکەم.. ئەی ڕزگارکەری مرۆڤایەتی – پێغەمبەری ئیسلام .. خۆزگە ئەگەر ئەمڕۆ لە ناوماندا بووایە چی دەگووت بە ملیۆنەها موسڵمان، هەیە تەنها شەوێك لە هەموو تەمەنیاندا شەونوێژ ناکەن دەبێت شەیتان بە دەبەو بەرمیلو تەنکەر میز

---

١ رياض الصالحين لا ٢٧٠. متفق عليه.

٢ متفق عليه في رياض الصالحين لا ٢٧٠.

بکاتـە گوێـچکەکانیانەوە خـوا پـەنامان بـدات لـەو کەسـانەی شـەیتان میـز دەکاتـە گوێچکەکانیانەوە.

ئەم دینە پاکەی ئیسلام — بە دوای دەستەو تاقمێکدا دەگەڕێت — کە نوێنەرایـەتی بکات — کە بە ڕاستیو بە پاکیو وەکو خۆی هەڵی بگرن.. ئەگەر لاپـەڕەکانی قورئـان هەڵبدەینەوە دەبینین هاوەڵە بەڕێزەکانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ) کە هـەموویان لـە — صالحانن — زۆر نرخی ئەم دینە پاکەیان دەزانی بۆیە بە هـەموو جۆرێك هـەوڵیان داوە خوا لە خۆیـان ڕازی بکـەنو بەهەشـتی نـەبڕاوە بەدەسـت بێـنن ئـیتر بە ڕۆژ بـەڕۆژوو بوونو بە شەو لە شەونوێژدا بوونو دەم بە ذیکـرو فیکـرو چـاو بـە گریـان بـوون بۆیـە خوای گەورە ئاستی بەرز کردنەوە بۆ پلەی (عباد الرحمن) کە پلەیـەکی هێنـدە بـەرزە کە کەس پێی ناگات مەگەر ئەو کەسانە نەبێت کە مەرجەکانیان تێدا بێتەدی یەکێ لەو مەرجانە شەونوێژەو بە پێی بەرزیی پلەی (عباد الرحمن) مەرجەکانیشی قورسن:

* قـــال تعـــالى: ﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴿٦٣﴾ وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴿٦٤﴾ ﴾[1].

واتە: بەندە ڕاستەقینەکانی پەروەردگار ئەو کەسانەی لەسەرخۆو هێمنانەن بەسـەر زەویدا تێ دەپەڕنو هەر کاتێك نەفامان بە هەڵەشەیی قسەیان لەگەڵ بکەن ئەمان هەر دەڵـێن — سـلامون عەلـەیکوم —و ئـەو کەسانەشـی کـە شـەوەکان خـەو لـە چـاویان دەتۆرێننو بەردەوام خەریکی سوژدەو کوڕنوش بردننو غەرقی ناو شەونوێژ بوون.

خوشـکی بـەڕێزم هـەرگیز مـەڵێ سـەردەمەکەی خـراپ بـووەو خواخوامانـە نوێـژە فەرزەکانیشمان بـۆ بکرێـتو ئـاخر زەمانـە.. نـەء، وامـەڵێ... تـا ڕۆژی دوایـی هـەموو سەردەمێك پیاوی خۆی هەیەو تۆش هاوەڵانی بـەڕێزیت بـەڵام چـەرخی بیسـتو یـەکی پێغەمبەری خوایت.. با منیشو تۆش بەو ڕوحیەتەوە لەگەڵ خوا بژین.

---

١ الفرقان: الآية (٦٣–٦٤).

ئا لەم سەردەمەی کە تۆ بە ئاخر زەمانی تێدەگەیتو شەیتان خەریکە پشتت سارد دەکاتەوە دەی هەر لە کوردستانێکی بچووکی وەك ئەم هەرێمەی خۆماندا سەدانو هەزاران کەس هەن – سوپاس بۆ خوا – شەونوێژ دەکەن..

شاری سلێمانی کە هەندێ کەس بە ڕواڵەت بە شارێکی دوور لە خوای تێ دەگەن بەڵام وا نییە بەڵکو ئەمڕۆ ئەوانەی جلو بەرگی ئیسلامی ناپۆشنو شەوانیش تا بەیانی پرخەی خەویان ڕۆژە ڕێیەك دەڕواتو ویسکی لە سەلاجەکانیاندا هەیە – پەنا بە خوا – ئەوانە لەبەر چاونو دیارنو ئیعلامیان بەهێزە..

بەڵام دڵنیات دەکەم کە لە پشتی پەردەوە (عباد الرحمن)ێك هەیە لەو شارەدا کە بە ڕۆژ بە ڕۆژونو بە شەویش شەونوێژ دەکەن من خۆم لە ماڵێك شەو مامەوە ئافرەتەکە نەخوێندەوار بوو کەچی لە منی دەپرسی چ کاتێکی شەو بۆ شەونوێژو چەند ڕکات نوێژ سوننەتە بکرێت لە شەونوێژدا؟.. منیش بۆم ڕوون کردەوەو لە دڵی خۆمدا سوپاسی خوام کرد کە ڕێچکەی صالحان لە کوردستاندا ڕۆشنەو ماوەو هەر دەشمێنێت انشاء الله.

* قال الله – عز وجل: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾.[١]

مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەزانیت؟ ئەی ئەزانی چ مژدەیەکی خۆشی لەناو خۆدا حەشارداوە؟ با پێکەوە ماناکەی بزانین، دەفەرموێت: ((ڕاکشانیان لە خۆیان حەرام کردووە لەناو جێگەکانیاندا و هەر نوێژ دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە کە لە دۆزەخ بیانپارێزێت و بە بەهەشتیان شاد بکات و لە پارە و سامانیان خێر و خێرات دەکەن* هیچ کەس نازانێت چ دڵخۆشکەری و چاو و دڵ ڕۆشنییەك لە پێشوازیاندایە، ئەمەش پاداشتی کردەوەی خۆیانە لە دنیادا – واتە – شەوانە خەویان لە چاوەکانیان دەتۆراند و ڕۆژانەش ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو بە بۆنەی ڕۆژو گرتنەوە..

---

١ السجدة: الآية (١٦–١٧).

خوشك و برا هاوبیرەکانم.. ئایا دەزانن ئەم چەند ئایەت و فەرموودانە چ شۆڕشێکیان لە ناو دڵ و دەروون و مێشکی بەرەکانی دوای هاوەڵاندا دروست کرد؟ شۆڕشێکی وا کە بوو بە هۆی ئەوەی ئاگری تێ بەردان و لە خەوی غەفڵەت بە ئاگای هێنانەوە و وای لێ کردن لە هەندێ حاڵاتدا لە پێشی هاوەڵە بەرزەکانی پێغەمبەری خواوە بوون (ﷺ)، دەی با سەردانێکی – دیوەخانە بۆن خۆش و بەچێژەکەی صاڵحان بکەین و بە چاوی خۆمان ببینین کە چۆن گەوهەر و مەرجانی قورئان و فەرموودە بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە سەیریان کردووە و بە جوانیش جێبەجێیان کردوون:

صاڵحان حەز ناکەن بمرن چونکە لە شەونوێژیان دەبڕێت:

* لما احتضر عامر بن عبدالله، بكى، فقيل له: ((اتجزع من الموت وتبكي؟ فقال: مالي لا أبكي ومن احق بذلك مني؟ والله لا أجزع من الموت ولا حرصا على دنياكم ولكني ابكي على ظمأ الهواجر وقيام ليل الشتاء)).[1]

واتە: زانای خواناس و صاڵح – عامری کوڕی عبدالله – (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە سەرەمەرگدا و پێش ئەوەی بمرێت خەڵکی بە چواردەوریدا دانیشتبوون و خەفەتیان بۆ دەخوارد، لە ناکاو دەستی کرد بە گریانێکی بە کوڵ.. خەڵکەکەی چواردەوری سەرسام بوون چونکە عاملی خواناسیان بەو جۆرە نەناسیبوو کە لە مردن بترسێت، بۆیە لێیان پرسی: ئایا لە مردن دەترسیت وا دەگریت؟

ئەی برایان، ئاش لە خەیاڵێکە و ئاشەوانیش لە خەیاڵێکی تر، صاڵحان بۆچی دەگرین و خەڵکیش چۆنی لێك ئەداتەوە، بۆیە عاملی پیاوچاك لە وەڵامدا پێی وتن: بۆچی نەگریم؟ کێ لە من شایانترە بە گریان؟ بەڵام سوێند بە خوا گریانەکەم لە ترسی مردن نییە، و بەجێهێشتنی دنیاکەشتان نییە.. دەی دەبێ بۆچی بێت؟

فەرمووی: بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم چونکە ئیتر تینوویێتی ڕۆژووی ڕۆژە گەرمەکان و شەونوێژی شەوە سارد و درێژەکانی زستانم لە دەست دەچێت!.

---

١ صفة الصفوة (١٣٣/٣).

* عن اسحاق بن اسماعيل قال: اخبرنا سفيان قال: ((اخبرونی عن (عمرو بن قيس)، قال: مارفعت رأسي بليل الاّ رأيت موسى بن عائشة قائما يصلي)).[1]

واتە: ئیسحاقی کوڕی ئیسماعیل دەڵێت: سوفیان بۆی گێڕاینەوە کە دەیووت: دەربارەی (عەمری کوڕی قەیس) بۆیان باس کردووم کە دەیووت: هیچ شەوێك لە خەو بە خەبەر نەهاتووم و مەگەر (موسای کوڕی عائیشە)م بینیوە و نوێژی کردووە.. ئەو پیاوە صاڵحانە ئاوا ژیاون بۆ ئومەتی ئیسلام ژیان و بەسەرهاتیان پاراستووە بۆمان و لێیانەوە نەشوەی صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون وەردەگرین.

* اخرج احمد بن مروان المالكي عن ابي اسحاق: قال: ((قال هرقل لقواده: فما بالكم تنهزمون؟ قال شيخ من عظمائهم: من اجل انهم يقومون الليل و يصومون النهار)).[2]

واتە: ئەبی ئیسحاق دەڵێت: پاشای ڕۆم – هرقل – ڕووی کردە سەرکردەکانی سوپاکەی بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسین: چیتان لێ قەوماوە لە هەموو جەنگەکانتاندا لەگەڵ سوپای موسڵمانانداندا تێك دەشکێن؟ پیاوێکی بە ساڵاچوو لە سەرکردەکان – وتی پێی: هۆکەی ئەوەیە کە سەربازەکانی ئەوان لەگەڵ خوا ڕاست دەکەن و بە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبن و شەوەکانیش ناخەون شەونوێژ دەکەن..

ڕاستەکات شەونوێژ و ڕۆژو سەرجەم بەندایەتیەکانی تر دەبنە هۆی ڕەزامەندی خواو دەرکردنی ناوبانگی جوان لەناو خەڵکیدا و سەرکەوتنی موسڵمان بەسەر دوژمنانی خوادا و لەم بەسەرهاتەی پێشووەوە – صلاح الدين الايوبى –م بیرکەوتەوە کە چۆن سەرکەوتنی سوپای باوەڕی بەستەوە بە ڕاستکردنی لەگەڵ خوادا و شەونوێژ و قورئان خوێندنی بەردەوام لە لایەن سەربازەکانییەوە.

* في ليلة ممطرة وباردة خرج الناصر – صلاح الدين الايوبي – يتفقد احوال جنده في المعسكر، فرح فرحاً شديداً عندما سمع بعضهم يصلي في خيمته وبعضهم يقرأ القرآن جهرة، وبعضهم يذكرون الله تعالى.

---

١ حياة الصحابة (٥٩/٢).

٢ حياة الصحابة (٥٩/٢).

ولكن عندما مرّ بخيمة ساكتة خامدة فاقترب منها فرأى أن صاحبها غارقة في النـوم، فقال قولته المشهورة: ((من هنا تأتي الهزيمة)).[١]

واتە: مێژوونووسەکان لە ژیاننامەی (صلاح الدين الايوبی) دا تۆماریان کردووە کە شەوانە لە دوای نیوەی شەو لەگەڵ پاسەوانەکەیدا دەهاتە دەرەوە و بە ناو سەربازگەکەیدا دەگەڕا بۆ بەسەرکردنەوەی حاڵ و هەواڵی سەربازەکانی، لە شەوێکی باراناویدا وەك جاران سەربازگەکەی دەپشکنی و دای بە لای هەندێ چادردا گوێی لە هاژەی دەنگی قورئان خوێندن و شەونوێژ دەهات و هەندێکی تر بە دەنگی بەرز ذیکرو یادی خوایان دەکرد، زۆر خۆشحاڵ بوو ئیتر دڵنیا بوو لەوەی خوای گەورە سەرکەوتن دەنێرێت.

بەڵام هەر کە دای بە لای خێوەتێکی تردا دەبینێ کش و مات و بێدەنگە کاتێك نزیك بوویەوە بینی خاوەنەکەی لە خەوێکی قووڵدایە بۆیە دڵی تەنگ بوو و تی: ئا لێرەوە شکستی و دۆڕاندن دەست پێدەکات، واتە لەگەڵ خوا ڕاست بکە و خوایش سەرکەوتنت خەڵات دەکات.

ئەگەر ئێمە نەخۆشی شەکرە یان فشاری خوێنمان هەبێت.. خێرا خەمی خۆمان دەخۆین و چەندان عیادە و دکتۆر دەگەڕێین تا چارەسەری خۆمان بکەین.. بەڵام کاتێك دڵمان نەخۆش دەبێت و باوەڕمان لاواز دەبێت هەوڵ نادەین هۆکارەکانی بزانین‌و پاشتر خۆمانی لێ ڕزگار بکەین، شێخ حەسەنی بەسری — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — نیشانەیەکی داناوە بۆ بەسەرکردنەوەی دڵ بزانین چی یە؟:

* قال الحسن البـصري — رحمـه الله — ((تفقد الحلاوة في ثلاثـة اشياء: في الصلاة والقراءة والذكر، فان وجدت ذلك فامض وابشر، وإلاّ فاعلم ان بابك مغلق فعالج فتحه)).[٢]

واتە: حەسەنی بەسرەیی — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — دەفەرمووێت: چێژ و شیرینی و خۆشی لە سێ شتدا بەدی بکە ئەو سیانەش یەکەم: کاتی نوێژکردن، دووەم: کاتی قورئان خوێندن، سێ یەم: کاتی ذیکر کردن، ئەگەر لەو سێ حاڵەتەدا

---

١ صلاح الدين الايوبي.

٢ الزهد للحسن البصري لا ٧٩ لە کتێبی (ابو بكر الصديق) للصلابی لا ١٩٨ وەرگیراوە.

هەستت بە چێژ و خۆشی کرد ئەوە مژدەت لێ بێت خاوەنی دڵ و گیان و باوەڕی بتەویتو بەردەوام بە لەسەریان. بەڵام ئەگەر لەو سێ شتەدا بەدیت نەکرد و نوێژ و قورئان خوێندن و ذیکرەکانت بێ تام و بێ چێژ و خۆشی بوون و بە زۆر لە کۆڵی خۆت دەکردنەو و وەك بارێك سەیرت دەکردن بەسەر شانتەوە و دەتویست زوو لە کۆڵ خۆتی بکەیتەوە، ئەوە گریان و واوەیلات دەوێت و دەرگاکانت لەسەر داخراون و هەوڵ بدە بیانکەیتەوە و چارەسەریان بکەیت، دە گوێ بگرە بۆ یەکێ لە صاڵحان کە چی دەفەرمووێت:

* يقول الثابت البناني: ((ماشيء أجده في قلبي ألذُّ عندي من قيام الليل)).[1]

واتە: (ثابت البناني) — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — دەفەرمووێت: هیچ شتێك لە ناو دڵمدا شك نابەم لە شەونوێژ بە تامتر و بەچێژتر بێت لە لام.

تەنانەت بۆ ئەوەی خەو نەیان باتەوەو بە خەبەر بن‌و چاویان نەچێتە خەو هاتوون هۆکاری تازەیان بەکارهێناوە بۆ نموونە سەیری خوشکی صاڵح و خواناس (معاذة العدوية) بکە — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — بزانە چی دەکات بۆ ئەوەی خەوی لێ نەکەوێت و بەردەوام شەونوێژ بکات:

قال محمد بن فضيل: حدثنا ابي قال: ((كانت — معاذة العدوية — رحمها الله — اذا جاء البرد — اي الشتاء — لبست ثياب الرقاق، حتى يمنعها البرد من النوم عن قيام الليل)).[2]

واتە: محمدی کوڕی فضیل دەڵێ: باوکم بۆی گێڕاینەوەو وتی: ئافرەتێکی خواناس هەبوو بە ناوی (معاذة العدوية) — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — هەر کە وەرزی زستان دەهاتو سەرماو سۆڵە دەستی پێ دەکرد، دەچوو جلوبەرگی تەنکی هاوینەی لەبەر دەکرد بۆ ئەوەی لە سەرماندا خەوی لێ نەکەوێت و خەوەکەی بزڕێت. دەی سا ڕەحمەتی خواتان لێ بێت ئەی دەستە خوشکە صاڵحەکانی فاطمەو خدیجەو عائشەو سومەییە و نوسەیبەی کچی کەعب — کە توانیوتانە بە ناڕەحەتکردن و ڕەنجاندنی

---

١ صفة الصفوة (٢/١٧٦).

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو (٢/١٩)..

خۆتـان خـوای – عـز وجـل – لـە خۆتـان ڕازی بکـەن و نەخـشە و پرۆگـرامێکیش بـۆ نەوەکانی داهاتووی ئیسلام بکێشن لە بواری بەندایـەتی و بـەرەو خـوا چـوون و صـاڵح بووندا.

هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز شەونوێژیان نەفەوتاوە ئیتر لە ماڵی خۆیان بووبن یان میوان بووبن لە ماڵان یان لە سەفەردا بووبن دەی با گـوێ بگـرین بـۆ زانـای وڵاتـی شـام (أبـو درداء) – خـوا لێـی ڕازی بێـت – ئەمـەش بـۆ ئـەوەی لـە سـزای گـۆڕو تاریکیەکەی ڕزگاریان بێت وەك دەفەرموویێت:

* قال أبو درداء: ((صلوا ركعتين في ظلم الليل لظلمة القبور)).[1]

واتـە: هاوەڵی زانا و شارەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ)(أبـو درداء) دەفـەرموویێت: دوو ڕکات شەونوێژ لە تاریکایی شەودا ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی لە تاریکـایی گـۆڕدا فریاتـان بکەوێت.

* كان علي بن الحسين بن علي – رضي الله عـنهم – لا يـدع صـلاة الليـل في الحـضر والسفر.[2]

واتە: عەلی کوڕی حسین ی کوڕی عەلی – خوایان لێ ڕازی بێت – هـەرگیز شەونوێژی واز لێ نەهێناوە نە لە ماڵەوە و نە لە سەفەردا.

* عن عبدالله بن ابي مليكة قال: ((صحبت ابن عباس – رضي الله عنه – من مكة الى المدينة فكان اذا نزل قام شطر الليل يرتل ويكثر في ذلك التسبيح)).[3]

واتـە: (عبـدالله)ی کـوڕی (ئـەبی مولەیکـە) دەڵێـت: لـە شـاری مەکـەوە هاوڕێیـەتی (عبدالله)ی کوڕی عباسم کرد بۆ شاری مەدینە، شەوانە لە هەر جێگایەك لامان بدایە بـۆ حەوانەوە لە نیوەی شەودا بە خەبەر دەهـات و دەسـتی دەکـرد بـە قورئـان خوێنـدنو تەسبیحاتی زۆری دەکرد.

١ جامع العلوم والحكم ل ٢٠٦.

٢ صفة الصفوة (١/٦٨).

٣ صفة الصفوة (١/٣٨٣).

دیسانەوە خوشکێکی سەرمەشقی تریش باس دەکەین کە چۆن چووەتە ڕیزی صاڵحان؟

* قال وكيع بن جراح: ((كانت ام علي والحسن إبني صالح بن حي – تقوم ثلث الليل)).[١]

واتە: وەکیعی کوڕی جیراح دەڵێت: دایکی عەلی و حەسەن، و خێزانی صاڵحی کوڕی (حيّ) بەردەوام یەك لەسەر سێی شەو شەونوێژی کردووە.

(سبحان الله) چەندە خۆشە لە ماڵەوە ئەندامانی تری خێزانەکە هاوکار و یارمەتی دەر و هاندەرت بن لە کاری خواناسیدا و ڕۆژووت لەگەڵدا بگرن و شەونوێژت لەگەڵ بکەن، سەیری ئەم نموونەیە بکە و بزانە چۆن صاڵحان خەڵکانی چواردەوریشیان بەشداری گەشتی شەوانەی بەرەو خواچوون کردووە..

* عن اشعث بن عبدالرحمن بن زيد عن ابيه قال: ((كان زبيد – اليامي– رحمه الله – قد قسم علينا الليل اثلاثا، ثلثاً عليه، وثلثاً على أخي، فكان زبيد يقوم ثلثه ثم يضر بني – فاذا رأى مني كسلاً قال: نم يابنيّ فانا أقوم عنك، ثم يجيء الى أخي فيضربه برجله فاذا رأى منه كسلاً قال: نم يابنيّ فانا اقوم عنك قال: فيقوم حتى يصبح)).[٢]

واتە: ئەشعەسی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی زەید لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: زانای خواناس‌و صاڵحی بە ناوبانگ – زبيد اليامى – (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) شەوەکانی لەگەڵ من‌و براکەمدا کردبوو بە سێ بەشەوە و هەریەکەمان بەشی خۆی تەواو دەکرد و پاشان ئەوەی دوای خۆی بە خەبەر دەکردەوە و خۆی دەخەوتەوە تا بەیانی.

بەڵام زبيد هەر کاتێك بەشە شەوەکەی خۆی شەونوێژی تەواو بکردایە، ئیتر دەهات بۆ لای من و نوکە شەقێکی ناسکی لێ دەدام و ئەگەر قورسی و تەمەڵی تێدا بەدی بکردمایە دەیفەرموو: دە قەیناکە بخەوە و هەڵمەسەوە من لە باتی تۆیش بەشە شەونوێژەکەت دەکەم.

---

١ صفة الصفوة (٦٣/٢).

٢ صفة الصفوة (٦٣/٢).

پاش ئەوەی ماوەکەی منیشی تەواو دەکرد دەچوو بەرەو جێگای براکەم بە هەمان شێوە نووکە شەقێکی لەویش دەدا و دەیفەرموو: هەستە بۆ شەونوێژەکەت، و ئەگەر ئەویش وەکو من تەمەڵیەکی تێدا بەدی بکردایە پێی دەفەرموو: دە قەیناکا تۆش وەکو براکەت بخەوەرەوە من لە باتی تۆیش نوێژەکە دەکەم و بەو جۆرە هەتا بەیانی نەدەخەوت و شەونوێژی دەکرد..

ئەوەندەی صاڵحین لە ڕێگەی شەونوێژەوە ڕوویان نورین و جوان دەبێت و لە لای یەکە بە یەکەی گەڕەکەکەی ناسراو و خۆشەویست دەبن لە هیچ ڕێگەیەکی دنیایی وەك دەوڵەمەندی یان دەسەڵاتدارییەوە دەست ناکەوێت..

سەیری پیاوێکی تری مەزن بکە لە بواری شەونوێژ و صاڵح بووندا و بزانە تا چەندێ شەونوێژی کردووە و ئەهلی دێ چۆن شایەتییەکی بۆ دەدەن؟

* قال بقية: خرجنا الى (ابي بكر بن ابي مريم) نسمع منه في ضيعته، وكانت كثيرة الزيتون، فخرج علينا (نبطي) من أهلها فقال لي: ((من تريدون؟ فقلنا: نريد ابابكر بن ابي مريم، فقال: الشيخ؟ فقلنا: نعم، فقال: مافي هذه القرية شجرة من زيتون الاّ وقد قام اليها ليلة جمعاء)).[1]

واتە: (بقیە) دەڵێت: لە ماڵ دەرچووین بە نیازی ئەوەی سەردانی (ابوبکر)ی کوڕی ئەبو مریم بکەین، تا زانستی لێ وەربگرین لە ماڵەکەی خۆیداو دەوروبەری ماڵیان زەیتونێکی زۆری لێ بوو، لە ڕێگا پیاوێکی (نبطي)مان پێگەیشت و پرسیاری لێ کردین: خێرە، بۆ لای کێ هاتوون؟ ئێمەش وتمان: بۆ خزمەتی مامۆستا ئەبوبکر هاتووین، وتی: جەنابی مامۆستا؟ وتمان: بەڵێ، وتی: لەم لادێیەدا یەك بن زەیتوون نییە کە جەنابی مامۆستا یەك شەو تا بەیانی لە بنیدا شەونوێژی نەکردبێت.

صاڵحان – ڕەحمەتی خوایان لێ بێت – هەر بە خۆیانەوە نەوەستاون بەڵکو هانی چواردەورەکەیان داوە بۆ شەونوێژ کردنو سەرزەنشتی قوتابی و کەس و کاریان دەکرد ئەگەر کەمتەرخەمی و تەمەڵی و سستیان لێوە بەدی بکردایە، ئەوە زانا مەزنەکەی عێراقە و قوتابیە دڵسۆزەکەی ئیمام شافعییە و بزانین چی بە مێوانەکەی دەڵێت؟

---

١ صفة الصفوة (٢/١٥٣).

* عن ابي عصمة بن عصام البيهقي قال: بت ليلة عند أحمد بن حنبل –رحمه الله– فجاء بالماء فوضعه، فلما أصبح نظر في الماء فاذا هو كما كان، فقال: ((سبحان الله رجل يطلب العلم لا يكون له ورد بالليل)).[1]

واتە: ئەبی عصمەی کوڕی عصام البیهقی دەڵێت: بە مەبەستی زانست و زانیاری وەرگرتن لە مامۆستا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نزیك بوویبوومەوە و دەرسی پێ دەگوتم‌و هەندێ کات لە لای دەمامەوە و لە ماڵی ئەوان دەخەوتم، شەوێکیان لە ماڵیان مامەوە و جێگەیان بۆ داخستم و مامۆستایش پێش خەوتن ئاوی دەستنوێژ گرتنی هێنا و لە پاڵمدا داینا.

بەڵام من خەوتم و بەیانی کە هەستاین بۆ نوێژی بەیانی مامۆستا سەیرێکی ئاوەکەی کرد – دەبینێ بە کارم نەهێناوە وەك خۆی ماوەتەوە – سەری سوڕما و وەك بڵێی پێی ناخۆش بوو کە شەونوێژم نەکردووە تا بەیانی خەوتووم – بۆیە بە دەم خۆیەوە وتی: (سبحان الله) کەسێك هەوڵی زانست و زانیاری بدات چۆن دەبێت وێردی شەونوێژی نەبێت؟!!.

* زانای گەورە و لە خواترسی ئیسلام (طاوس)یش سەرسام بووە لە کەسێك لە کاتی سەحەردا خەوتبێت، ئەمە چۆن بووە؟

* عن مسمر بن رجل قال: اتى طاوسُ رجلاً في السحر، فقالوا: وهو نائم، فقال: ماكنت ارى ان احداً ينام في السحر!!.[2]

واتە: زانای پایە بەرزی ئیسلام مامۆستا(طاوس) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – جارێکیان بۆ کارێکی زۆر پێویست لە کاتی شەودا دەڕوات بۆ ماڵی هاوڕێیەکی و کاتێ لە دەرگا دەدات پێی دەڵێن خەوتووە با بۆت هەڵسێنین، (طاوس)یس زۆر سەرسام بووە لە خۆیەوە دەیڕوانیە موسڵمانان و وای دەزانی هەموان لە کاتی صەبای صالحاندا بە خەبەرن و لەگەڵ خوای خۆشەویستیاندا لە ڕاز و گفت و گۆدان – بۆیە

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٢٣).

٢ صفة الصفوة (٢/٥٠).

فەرمووی: من هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کە هیچ کەسێك لە کاتی سەحەردا خەوتبێت.

عاصمی کوڕی ئەبی نجود – خزمەتکارە مەزنەکەی قرائاتەکانی قورئانی کەریم دەربارەی بەرەیەك قسەمان بۆ دەکات کە شەویان خستبووە خزمەتی شەونوێژەوە و بە جۆرێکی تایبەت دەیانڕوانی بۆی:–

* عن عاصم بن ابي النجود قال: ((أدركت أقواماً كانوا يتخذون هذا الليل جملاً)).

واتە: عاصم ی کوڕی –ابی النجود– دەڵێت: گەیشتووم بە کەسانێکی خواناس و صاڵحی وا کە ئەم شەوە تاریکەیان کردبوو بە حوشتری خۆیان و بەکاریان دەهێنا بۆ چوونە خزمەت پەروەردگار و شەونوێژکردن تیایدا.

برای خوێنەری – گەنج و خوێن گەرم – بە تەما مەبە لە تەمەنی (٤٠ و ٥٠) ساڵیو بەرەو ژوورتر خۆت یەکلایی بکەیتەوە بۆ شەونوێژ و خواپەرستی کردن! نەخێر تەمەنی لاوی ببەخشە بە خوا چونکە پارەی چاك دەکات و لەو کاتەدا جەستەت مۆدیلی بەرزە و نرخی زیاترە و پێغەمبەری سەروەرمان فەرموویەتی: ((ان الله يباهي ملائكته بالشاب العابد))، واتە: خوای گەورە شانازی دەکات بەسەر فریشتەکانیدا بە گەنجی خواپەرست و شەونوێژگەرو سەیری (احمدی کوڕی حنبل بکە بزانە لە کەیەوە شەونوێژی کردووە؟

* عن ابراهيم بن شمس قال: ((كنت اعرف احمد بن حنبل – رحمه الله – وهو غلام يحيى الليل)).[1]

واتە: ئیبراهیمی کوڕی شەمس دەڵێت: من لە کاتی منداڵیەوە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەناسم و هەر بە منداڵی شەونوێژی کردووە.

ئای خوشکانی موسڵمانم – مژدەتان لێ بێت – کە مێژووی خواناسی و صاڵحانی ئوممەتی ئیسلام پڕیەتی لە ئافرەتانی خواناس کە پێشبڕکێی پیاوانیان کردووە لەو بوارەدا و لە هەندێ کاتیشدا لە پێش پیاوانیشەوە بوون ئەوەش بە هۆی ئەو هەستە ناسك و سۆزە زۆرەی خوا – عز وجل – پێی داون..

---

١ صفة الصفوة (٢/١٢٧).

ئەوەش دیسان خواناسێکی وڵاتی بەحرەینە و بە هاتنی شەو خۆشحاڵ دەبوو چونکە کاتێکی چاکە و کەس نایەت لێت تێك بدات چونکە خەڵکی دوو جۆرن و هیچ جۆرێکیان سەر لە شەونوێژ و قورئان خوێندنی تێك نادات. جۆری یەکەم شەونوێژگەران ئەوە مەشغوڵی خۆیانن و جۆری خەواڵووەکان ئەوانیش لە پرخەی خەودان و سەر لە کەس نادەن و سەر لە شەونوێژی کەس تێك نادەن. بزانین (حەنیفە)ی خواناس چۆن پێشوازی لە شەو دەکات؟:-

* عن مسمع بن عاصم قال: ((كانت بالبحرين إمرأة عابدة يقال لها منيفة، -رحمها الله- فكانت تفرح بقدوم الليل من اجل قيام الليل، وكانت إذا هجم الليل عليها قالت: بخ بخ يا نفس قد جاء سرور المؤمن)).[1]

واتە: مەسمەعی کوڕی عاصم دەڵێت: ئافرەتێك هەبوو لە ژنە خواناس و صالحەکانی بەحرەین و (مەنیفە)ی کچی (أبي طارق)یان پێ دەگوت، و زۆر خۆشحاڵ دەبوو بە هاتنی شەو ئەمەش بە خاتری شەونوێژ کردن، و هەر کاتێك شەو هێرشی دەهێنا و ڕۆژی ڕووناکی ڕادەماڵی ئەم خوشکە دەیووت: بەه، بەه، شادی باوەڕداران هات.

خوشکێکی صاڵحی تر کە سەرمەشقە بۆ خوشکانی سەرپۆش لەسەری ئەمڕۆمان، ئەویش (مونیرە) خانی سدوسیە زۆر دەترسا لە هاتنی شەو و دەیچواند بە تاریکی ڕۆژی قیامەت و نەیدەویرا بخەوێت تیایدا ئەمە چۆن بووە؟

* حدثنا ابوبكر القرشي قال: ((حدثني محمد بن الحسين قال: حدثني عبدالله بن محمد ابي الاسود قال: حدثني رجل من سدوس كانت لنا عجوز في الحيّ لم ندركها نحن، أدركها أشياخنا يقال لها (منيرة السدوسية) فكانت تقول - إذا جاء الليل - : قد جاء الهول قد جاء الخوف ما أشبه هذا بيوم القيامة، ثم تقوم فلا تزال تصلي حتى الصبح)).[2]

---

١ صفة الصفوة (٦٨/٣).

٢ صفة الصفوة (٣١٥/٢).

واتە: ئەبو بەکری قورەیشی بۆی باس کردین و دەیوت: موحەممەدی کوڕی حسین بۆی باس کردین و دەیوت: عبدالله ی کوڕی محمدی ابی الاسود بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێکی سدوسی بۆی گێڕامەوە و دەیوت: لە گەڕەکەکەماندا پیرەژنێك هەبوو — ئێمە نەمانبینی بەڵکو باوباپیرانمان دیویانە کە هەر کاتێك شەو دابهاتایە و تاریکی باڵی بکێشایە بەسەر دنیادا دەیوت: ترس و نارەحەتی هاتەوە، دڵەڕاوکێ هاتەوە و پڕاوپڕ لە ڕۆژی قیامەت دەکات و ئیتر خەو لە چاوەکانی دەتۆرا و هەڵدەسا و دەستی دەکرد بە شەنوێژ هەتا بانگی بەیانی...

ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی مونیرە، بە ڕاستی وایە شەو تاڵ و تاریك و ناشیرینەو پڕاوپڕ دەڵێی بۆ چوونە خزمەت پەروەردگار کراوە و دەڵێی بۆ شەونوێژ پەردەی ڕەشی داداوەتەوە.

برای خوێنەر... با پێش ئەوەی لە باسی شەونوێژ بچینە دەرەوە.. لەوانەیە بڵێیت خەریکە شێت دەبمو.. ئەدەمە کەژ.. هەرچی دەکەم ناتوانم شەو بە خەبەر بێمو دەستنوێژێك بگرم و بچمە سەر بەرماڵ و چەند ڕکاتێ نوێژ بکەم!!

کە باسی ئەو خوشك و برا صاڵحانە دەخوێنمەوە خۆمم لەبەرچاو دەکەوێت و بێ نرخی خۆمم بۆ دەردەکەوێت.. بەڵام چارم چییە؟ نازانم چی بکەم؟ چۆن وام لێ بێت حەز لە شەونوێژ بکەم و چێژ و شیرینیەکەی بچێتە بن دانمەوە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەچینە دەرمانخانەیەکی شاری بەسرە، وە لە عیادەی دکتۆرێکی پسپۆڕ لەم بوارەدا لا دەدەین بزانین چیمان بۆ دەنووسێت؟

* عن مبارك بن فضالة قال: سمعت الحسن البصري وقال له شاب: أعياني قيام الليل، قال له: قيدتك خطاياك، وقال له: إذا لم تقدر على قيام الليل ولا صيام النهار فاعلم انك محروم، قد كبلتك الخطايا والذنوب.[١]

واتە: موبارەکی کوڕی فوزالە دەڵێت: لە لای حەسەنی بەسریدا بووم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) گەنجێك هات و پێی وت: هەرچی دەکەم ناتوانم شەونوێژ بکەم، ئەویش پێی فەرموو: گوناه کردن و تاوان و سەرپێچییەکانت کۆت و زنجیریان کردووی توانای

١ الزهد للحسن البصري لا ١٤٦

قوربانیدان و بۆ خوا ژیانت تێدا نەماوە، و پاشان پێی وت: ئەگەر هەوڵتدا شەونوێژ بکەیت و ڕۆژووی سوننەت بگریت بەڵام نەتدەتوانی ئەوە بە ئاشکرا بزانەکە بێ بەشیت لە چوونە ژوورەوە بۆ مواجەهەی پەروەردگارو گوناه قاچ و دەستیان کەلەپچەو کۆتو زنجیر کردوویت.

پیاوێکی تریش هەمان دەردی خۆی بۆ شێخ حەسەن دەربڕی و بزانین گەورەمان چ وەڵامێکی دابێتەوە و چ دەرمانێکی بۆ نوسیبێت؟

* قال له رجل: يا أبا سعيد، أعياني قيام الليل، فما أطيقه، فقال: ياابن أخي، أستغفر الله وتب اليه، فانها علاقة سوء، وان الرجل ليُذنِب الذنب فيحرم به قيام الليل.[1]

واتە: پیاوێکی دەردەدار – کە دەردەکەی ئەوە بوو دەستی دەکرد بە شەونوێژ بەڵام نەیئەتوانی بەردەوام بێت و وازی لێ دەهێنا، هات بۆ لای سەرمەشقی شەونوێژانی سەردەمی خۆی و حاڵی خۆی تێگەیاند و ئەویش پێی وت: ئەی برازای خۆم، داوای لێبوردن لە خوا بکە و پەشیمانی بۆ دەربڕە، ئەوە نیشانەیەکی خراپی و عاقیبەت شەڕییە، وتیشی: پیاو کە گوناهێك ئەنجام دەدات لە چێژ و خۆشی شەونوێژ بێ بەش دەکرێت.

ئێستا هۆکاری پێشکەوتوو و چاك هاتوونەتە ئاراوە وەك (موبایل) کە هەر کاتێکی شەو بمانەوێت بە خەبەر بێین خەبەرمان دەکاتەوە و شەونوێژمان لە ناوجەرگەی شەودا دەست دەکەوێت و عومەری کوڕی خەطاب (خوای لێ ڕازی بێت) حەزی لە شەونوێژی ناو جەرگەی شەو کردووە.[2]

جاران صاڵحانی پێشەوایانمان چاوەڕوانی کەڵەشێر بوون هەڵیان بسێنێت لە خەو، ئەگەر شەوێك نەیخوێندبێت خەبەریان نەبۆتەوە و شەونوێژی ئەو شەوەیان لە دەست دەرچووە وەك ئەوەی بەسەر سەعیدی کوڕی جوبەیر هات (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەمە چۆن بووە؟

١ عمر بن عبدالعزيز – دكتور علي الصلابي لا (١٩٨).

٢ صفة الصفوة (١/١٤٩).

* عن أصبغ بن يزيد الواسطي قال: كان لسعيد بن جبير – رحمه الله – ديك كان يقوم الليل بصياحه، قال: فلم يصح ليلة من الليالي حتى أصبح، فلم يصل سعيد تلك الليلة، فشق عليه فقال: ماله قطع الله صوته؟ قال: فما سمع لها صوت بعدها فقالت له أمه: يا بنيّ لا تدع على شيء بعدها.[1]

واتە: ئەسبەغی کوڕی یەزیدی واستی دەڵێت: سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کەڵەشێرێکی هەبوو بە خوێندنی لە خەو هەڵیدەساند بۆ شەونوێژ، شەوێکیان قەدەری خوا وابوو کەڵەشێرەکە نەیخوێندو بەو هۆیەوە سەعید سەرمەشقی نوێژگەران بە خەبەر نەهات ئەو شەوەی لە دەست دەرچوو، زۆر خەفەتی پێ خوارد دوعایەکی لە کەڵەشێرەکە کرد پێی وت: بۆچی ئەم شەو دەنگت نەبوو خوا دەنگت ببڕێت، دەڵێت لەو ڕۆژە بە دوا ئەو کەڵەشێرە نەیخوێند و دەنگی نەما، دایکیشی وتی: کوڕی خۆم – هەرچی سەیر دەکەم دوعات گیرایە – توخوا ئیتر دوعا لە هیچ شتێك مەکە.

خێزانێکی شەونوێژگەر، چەند خۆشە ژن و پیاو هاندەری یەك بن لە وەرزشە ڕووحیەکاندا کە بەرەو خوا بیانبات و پێکەوە بە ڕۆژو بن و پێکەوە شەونوێژ بکەن و پێکەوە قورئان دەور بکەنەوە بڕوانە با سەرێك لە ماڵی ئەبو هورەیرەوە بدەین (خوای لێ ڕازی بێت) و بە چاوی خۆمان ئەمە ببینین بزانین شتی وا دەبێت؟

* عن عثمان النهدي قال: تضيَّفتُ ابا هريرة سبعاً، فكان هو وامراته وخادمه يتعقبون الليل اثلاثاً، يصلي هذا ثم يوقظ هذا.[2]

واتە: عوسمانی نەهدی دەڵێت: حەوت ڕۆژ میوانداری هاوەڵی شیرینی پێغەمبەری خوام کرد (ﷺ) ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) خۆیو خێزانەکەی و خزمەتکارەکەی شەویان کردبوو بە سێ بەشەوە و هەریەکەیان بەشەکەی خۆی تەواو دەکرد دەخەوتەوە و کەسی دووەمی هەڵدەساند بۆ شەونوێژ و ئەویش لە پاش خۆی کەسی سێیەمی بە خەبەر دەکردەوە.

---

١ صفة الصفوة (١/١٨٨٠).

٢ صفة الصفوة (١/١٣٥).

# پێنجەم

## ڕۆژووی سوننەت و ژیان لە خزمەت توێنێتی و برسێتیدا

چەند جوان و شایستەن ئەو کۆمەڵە هۆکار و کردەوانەی ئەم ئیسلامە عەزیزە بۆی دیاری کردووین تا هەر کاتێ پێیان هەستین و ئەنجامیان بدەین و لەگەڵیاندا بژین پلە و قۆناغەکان دەبڕین و ئاستمان بەرز دەبێتەوە بۆ ئەوەی ببینە – عباد الرحمن – و بگەینە کاروانی موبارەکی صالحان و لەگەڵیاندا بەرەو خوا و ڕزگاری ڕۆژی قیامەت بڕۆین..

صالحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) و ئێمەش خوا بمانخاتە ناو کاروانیانەوە – جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەوان و سەرجەم موسڵمانانی تردا، ئەو جیاوازیەش لە ڕۆژودا بەدی دەکرێت خەڵکی لە ساڵێکدا تەنها مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژو دەبن مەگەر کەمێکیان نەبێت ڕۆژوی عەرەفە و ڕۆژوی عاشورا بە ڕۆژو دەبن.

بەڵام صالحان وا نین، بەڵکو سەیری ڕەنگیان بکە دەزانیت شوێنەواری ڕۆژوویان پێوە دیارە ڕەنگی موبارەکیان زەرد هەڵگەڕاوە لە ڕۆژە گەرمەکانی هاویندا بە ڕۆژو دەبن و گوێ بە توێنێتی و گەرما و برسێتی نادەن..

یەکێك لە بەندایەتی و پەرستشە مەزنەکانە کە خوای (عز وجل) لەسەر هەموو ئاینێکی فەرز کردووە و دوایین ئاینیش ئاینی پیرۆزی ئیسلامە کە دەفەرموێت:

* قال الله – سبحانه وتعالى – ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ ﴾[1].

---

١ سورة البقرة: الآية (١٨٣).

واتە: ئەی کۆمەڵی باوەڕداران ڕۆژوتان لەسەر فەرز کرا وەك چۆن لەسەر هەموو ئاینەکانی پێش ئێوەش فەرزکراوە ئەمەش بۆ ئەوەیە کە تەقواتان تێدا دروست ببێتو لە خوا بترسن..

خوێنەری خۆشەویست... ڕۆژو گرتن ئەوپەڕی دڵسۆزی نواندنە بۆ خوا چونکە گەورەترین وەرزش و قورسترین کار لەگەڵ لەشماندا ئەنجامی بدەین ئەوەیە خواردن و خواردنەوەی لێ بگرینەوە.. پاشان ئەوپەڕی مانای بوونی باوەڕی پتەوی ناو دڵ دەگەیەنێت چونکە مرۆڤ دەتوانێت خەڵکی بخەڵەتێنێت و بڵێت: بە ڕۆژوم و لە پەنهانیشدا خواردن و خواردنەوە بخواتەوە و کەسیش نەزانێت بەڵام لە ترسی خوای گەورە و چاودێری بەردەوامی بۆی ئاویش لە دەمی ڕانادات دەڵێت نەبادا قومێك یان دڵۆپێك بچێتە قورگم و ڕۆژوەکەم بشکێنێت..

لەم بارەیەوە خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێت:

* عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) قال الله تعالى: كل عمل ابن ادم له الاّ الصيام فانه لي وانا اجزي به — في رواية — يترك طعامه وشرابه، وشهوته من أجلي، والصيام جنة، فاذا كان يوم صوم احدكم فلا يرفث ولا يصخب، فان سابه احد او قاتله فليقل اني صائم.[١]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: هەموو کردەوەیەکی چاکی نەوەکانی ئادەم بۆ خۆیانە.. تەنها ڕۆژو نەبێت کە بۆ منە و منیش خۆم ئەزانم چۆن پاداشتی دەدەمەوە، لەوە زیاتر لەبەر خاتری من وازی لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزواتی خۆی هێناوە، ڕۆژو قەڵغانە، و هەموو موسڵمانێك بە ڕۆژو بوو

---

١ رواه البخاري ومسلم.

گوناه و دەنگە دەنگ نەکات، هەر کەسێکیش شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێت من بەڕۆژوم و کوڕی شەڕ نیم.

نەك هەر ئەوەندە برایانی ڕۆژوەوانم... بەڵکو بۆنی ناخۆشی دەمی ڕۆژوەوان – کە خاوەنەکەیشی حەز بە بۆنی دەمی خۆی ناکات – کەچی خوا بەو گەورەیی و عەزەمەتەیەوە حەز لە بۆنی ئەو دەمە دەکات و دەفەرموێت:

* قال رسول الله (ﷺ) (والذي نفسي بيده لخلوف فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك).[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند دەخوات بەو خوایەی کە گیانی محمدی بە دەستە بۆنی گۆڕاوی دەمی ڕۆژوەوان لە لای خوای – عز وجل – خۆشترە لە بۆنی میسك و گوڵاو و عەنبەر، هۆی ئەمەیە بۆیە صاڵحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لەگەڵ ڕۆژودا دەست لە مل بوون.

خوشك و برای خوێنەری خۆشەویستم.. سەرداری صاڵحان پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورەیی و فەزڵی ڕۆژوی دەزانی و هەروەها سەرمەشقانیش دەبێت لە هەموان زیاتر خواناسی و پەرستشیان هەبێت بۆیە لە گەرمترین ڕۆژدا لە چلەی هاویندا لە گۆڕەپانی ڕێگەی جیهاددا بە ڕۆژو بووە وەك (ابو درداء) دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

* عن أبي درداء – رضي الله عنه – قال: لقد رأيتني مع النبي (ﷺ) في بعض أسفاره في اليوم الحار الشديدة الحر، حتى ان الرجل ليضع يده على رأسه من شدة الحر، وما في القوم صائم الا رسول الله (ﷺ) وعبدالله بن رواحة.[2]

---

١ هەمان سەرچاوە.

٢ صفة الصفوة (١/٢٤٨).

واتە: (ابو درداء) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لە هەندێ لە سەفەرەکانیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووم کە ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو، بە ڕادەیەك پیاو لە گەرماندا دەستی دەگرت بە تەوقی سەریەوە و لە ناو هەموو خەڵکەکەدا کەس بە ڕۆژوو نەبوو جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عبدالله ی کوڕی ڕەواحە نەبێت.

تەنها یەك ڕۆژ لەبەر خاتری خوا بە ڕۆژوو بیت (٧٠) پایز لە ئاگری دۆزەخ دوور دەکەویتەوە ئەی خۆشبەختی بۆ ئەوانەی ڕەچەی صاڵحانیان گرتووە و هەموو دوو شەممە و پێنج شەممانێك بە ڕۆژو دەبن یان سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکی عەرەبی بە ڕۆژو بن چەند پایز لە ئاگر دوور بخرێنەوە، دە سەیری ئەم فەرموودە صەحیحە بکە و ئیتر ڕاڕا مەبە خۆت بکە بە ناو دنیای صاڵحاندا و ڕۆژووی سوننەت زۆر بگرە:

* قال رسول الله (ﷺ): ما من عبد يصوم يوماً في سبيل الله الاّ باعد الله بذلك اليوم وجهه عن النار سبعين خريفاً.[١]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر بەندەیەکی خوا تەنها یەك ڕۆژ لەبەر خاتری خوا بە ڕۆژو بێت، خوای – عز وجل – حەفتا پایز واتە (٧٠ ساڵ) لە ئاگری جەهەننەم دووری دەخاتەوە، دەی خۆشبەختی بۆ موسڵمانێك کە ماوەی یەك ڕۆژ لە جەهەننەمەوە دوور بێت چ جای کەسێك کە (٧٠) پایز لە سزای خوا دوور بخرێتەوە ! !

خوایە بمانکەرە ئەهلی ڕۆژوو، خوایە لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

خوشك و برای خۆشەویستم .. کەمتەرخەمی .. خۆت بگەیەنە کاروانی صاڵحان، بەم کارە هەرزان و ئاسانە کە ڕۆژوی سوننەتە.. چونکە دەبیتە یەکێ لەوانەی لە دەرگای (الريان)ەوە دەچیتە بەهەشتەوە.. ئەزانی ئەو دەرگایە چییە؟ دەی گوێ بگرە بۆ پێشەوای صاڵحان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە چی دەفەرموێت:

---

١ متفق عليه.

* قال رسول الله (ﷺ) ان في الجنة باباً يقال له الريان يدخل منه الصائمون يوم القيامة لايدخل احد غيرهم، يقال اين الصائمون؟ فيقومون لا يدخل منه احد غيرهم، فاذا دخلوا، اغلق فلم يدخل غيرهم.[١]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی بەهەشتمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: بەهەشت دەرگایەکی هەیە ناوی — ڕەییان —ە و تایبەتە بە چوونە ژوورەوەی ڕۆژوەوانان لە ڕۆژی قیامەتدا و جگە لەوان ڕێگا نادرێت بە کەسی تر پیایدا بچێتە ژوورەوە.

کۆمەڵێ مەلائیکەت هاوار دەکەن: کوان ڕۆژوگران؟ با بێنە پێشەوە، هەموو ڕۆژوگران هەڵئەسنە سەرپێ و لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە و دوای ئەوان بە یەکجاری ئەو دەرگایە دادەخرێت و کەسی تر بۆی نیە لێوەی بڕواتە ژوورەوە... ئەوەش گەورەترین ڕێزە بۆ خوشکان و برایانی ڕۆژوگر..

برای خوێنەر تێبینی ئەوە بکە کە مرۆڤ بە گرتنی مانگی ڕەمەزان ناچێنە خانەی ڕۆژوگران، ئەگەر وابێت هەموو موسڵمانان لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە، بەڵام بە فەرموودەکە دیارە ژمارەیەکی کەمن، دەی کەس لە من و تۆ پیاوتر نییە، با خۆمان بکەین بە ئەهلی ئەو دەرگایە و هەر کەسیش ئەو دەرگایەی بۆ کرایەوە پێویستی بە دەرگاکانی تر نییە و دەچێتە ناو بەهەشتەوە.

ڕۆژە سپیەکانی هەموو مانگێکی کۆچی کە سێ ڕۆژ دەکات (١٣، ١٤، ١٥)ی هەموو مانگێکی ئیسلامی دەکا.. پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی بە ڕۆژو دەبوو، ئامۆژگاری هاوەڵانیشی دەکرد بۆ لەدەست نەدانی ئەو هەلەی هەموو مانگێك. گوێ بگرە بۆ ئەم فەرموودە جوانە لەم بارەیەوە:

* عن عبدالله بن عمر — رضي الله عنهما — ان رسول الله (ﷺ) قال: صيام ثلاثة أيام من كل شهر صوم الدهر كله.[٢]

---

١ رواه البخاري ومسلم.

٢ متفق عليه.

واتە: عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ڕۆژو گرتنی سێ ڕۆژ لە هەر مانگێك وەك ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بە ڕۆژو بووبێت.

لەوانەیە هەندێ خوشك و برا بپرسن و بڵێن: نازانین کام ڕۆژەیە چونکە ڕۆژ ژمێری کۆچی زۆر بڵاو نییە لە ناوماندا و ڕۆژ ژمێری ساڵی گاوران لە ناوماندا برەوی پێ دراوە؟ منیش دەڵێم وایە و تا ئەو ساتەی ڕۆژ ژمێری ساڵی ئیسلامی خۆمان دەکەوێتە کار، تۆ شەوانە لە حەوشەکەتانەوە سەیری مانگ بکە، و کەی خڕبوو واتە مانگی چواردە ئەوە ڕۆژی پێش تر و ڕۆژی دواتری بگرە.

هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) (خوایان لێ ڕازی بێت) بە کردەوەی بەرزی خۆیان چوونە ڕیزی صاڵحانەوە، و هەر بەوە نەچوون کە ناویان هاوەڵانە و لە غەزاکانی ئیسلامدا بەشداریان کردووە، بەڵکو بە شەو خەریکی شەونوێژ بوون و بە ڕۆژیش بە ڕۆژوو بوون، بۆ نموونە (أبو طلحة) – خوای لێ ڕازی بێت – هەرگیز ڕۆژوی نەشکاندووە مەگەر نەخۆش بووبێت یان لە سەفەرێك بووبێت وەك ئەنەس دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

* عن أنس بن مالك – رضي الله عنه – قال: ان ابا طلحة ما أفطر بعد رسول الله (ﷺ) الاّ في مرض حتى لقى الله.[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك (خوای لێ ڕازی بێت) باسی (أبو طلحة)مان بۆ دەکات و دەڵێت: لە دوای مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژوی نەشکاندووە و بەردەوام بە ڕۆژو بووە – جگە لە ڕۆژە قەدەغەکراوەکانی وەك جەژنەکان – مەگەر لەبەر نەخۆشی یان لە سەفەرێك بوایە..

ئەوەیە بە وەفایی... کێوێك لە بەوەفایی هاوەڵان دەردەخات کە لە دوای مردنی پێغەمبەرەکەیان زیاتر سوور دەبن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی و چوونە ناو کاروانی صاڵحانەوە هەتا مردن.

---

١ صفة الصفوة (١/١٤٨).

ئەی ئەو کەسەی بە نیازیت بگەیتە کاروانی صاڵحان – سلام عليكم – لەوانەیە لەو ڕێگایەدا هەموو جۆرە کەسێك بێنە ڕێگات و ساردت بکەنەوە و نەهێڵن بڕۆی و بتگرن.. بەلاّم تۆ خۆت ڕاوەشێنە و بەردەوام بە لەسەر گەشتە موبارەکەکەت و دڵنیا بە (صاڵحان) بەردەوام سەیری دوای خۆیان دەکەن بزانن خەڵکی تازە پەیوەندی بە کاروانەکەیانەوە نەکردووە..

لەوانەیە لە ناو ئەو خەڵکانەدا دۆست و خزمان و خۆشەویستانی خۆیشت هەبن و لەبەر سۆز و بەزەیی ڕێگەت لێ بگرن بەلاّم تۆش وەك – مەسروق – وەلاّمیان بدەرەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئایا دەزانی چۆن وەلاّمی دانەوە؟

* عن الشعبي – رحمه الله – غشي مسروق بن عبدالرحمن يوم صائف وهو صائم، فقالت له إبنته: أفطر، قال: ما أردت بي؟ قالت: الرفق، قال: يا بنتي انما أطلب الرفق لنفسي يوم القيامة الذي كان مقداره خمسين ألف سنة.[1]

واتە: زانای مەزنی ئیسلام – ئەبو عەمری (الشعبی) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەگێڕێتەوە کە زانای خواپەرست – مەسروقی کوڕی (عبدالرحمن) – بە ڕحمەت بێت– لە ڕۆژێکی هاوینی زۆر گەرمدا بە ڕۆژو بوو لە هۆش خۆی چوو..

کچەکەی بەزەیی پێدا هاتەوە و پێی وت: باوکە گیان –زۆر نارەحەتی– ڕۆژوەکەت بشکێنە دنیا زۆر گەرمە چلەی هاوینە!. باوکیشی سەیرێکی کرد و پێی وت: مەبەستت چییە کچی خۆم وام پێ دەڵێیت؟ وتی: تەنها ئەوەیە بەزەییم پێتدا دێتەوە.

پێشەوایش فەرمووی: کچم من زیاتر بەزەییم بە خۆمدا دێتەوە و بۆیە وای لێ دەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا تووشی نارەحەتی گەورەتر نەبێت لە ڕۆژێکدا کە (٥٠) هەزار ساڵە بە پێوە دەوەستێنرێین..

---

١ صفة الصفوة (٢/١٦).

ئەمجارەیان لەوانەیە نزیکترین کەست بەزەیی بێتەوە پیاتداو لە لایەنی دڵسۆزیەوە بتگرێت و نەهێڵێت خۆت بگەیەنیتە کاروانەکەو خاوت بکاتەوەو ئەوانیش هەرگیز بە دیار کەسەوە ناوەستن‌و بەجێت دەهێڵن..

با پێکەوە سەرێك بدەین لە ماڵی ڕۆژوو (بيت الصوم) ماڵی هاوەڵی پێغەمبەرمان (ﷺ) (ابو أمامه الباهلی) – خوای لێ ڕازی بێت – و بزانین لە چ وەختێکدا خەڵکی دەیزانی بە ڕۆژو نین و چ کاتێك بە ڕۆژوون؟

* عن رجاء بن حيوة – رحمه الله – قال: كان أبو أمامة الباهلي وامرأته وخادمه لايلقون الاّ صياماً، فاذا رأوا ناراً أو دخانا بالنهار في منزلهم عرفوا انه قد إعتراهم ضيف.[1]

واتە: وەزیرە دڵسۆزەکەی عومەری کوڕی عبدالعزیز – ڕەجائی کوڕی حەیوە دەڵێت: هەمیشە مامۆستا (أبو أمامه الباهلی) و هاوسەرەکەی و خزمەتکارەکەی بە ڕۆژو بوون، و ئەگەر نیوەڕۆیەك ئاگرێك یان دوکەڵێك لە حەوشەکەیانەوە بەرز ببوایەتەوە ئەوە خەڵکی دەیانزانی کە میوانیان هاتووە و لەبەر خاتری میوانەکە چێشت لێ دەنێن.

بۆ ئەو خوشکانەی بە نیازن پێشبڕکێی براکانیان بکەن لە گەیشتن بە کاروانی صاڵحان نموونەی دوو خوشك دەهێنمەوە کە پێشەنگن لە کاروانەکەدا و بزانین گەرماو تێنوێتی لە ڕۆژو خاوی کردونەتەوە:

* قال أبو الأحوص: كانت مولاة لابراهيم النخعي – رحمه الله – تعمد الى اليوم الشديد الحر فتصومه، فقيل لها: انك تعمدين الى اشد الايام حراً فتصومينه؟ فقالت: ان السعر اذا رخص اشتراه كل احد.[2]

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو (١/٣٧٢).

٢ صفة الصفوة (١/٢٤٨).

واتە: (ابو الاحوص) دەڵێت: زانای ناودار (ابراهيم النخعي) کەنیزەکێکی هەبوو.. ئەم کەنیزەکە زۆر خوا پەرست و چاکەکار بووە – دەڵێن: چ ڕۆژێك زۆر گەرم و قرچەدار بووایە ئەو تیایدا بە ڕۆژو دەبوو – تا پاداشتی زیاتری دەست بکەوێت – لێیان پرسی: باشە هۆی چییە تۆ سەیر دەکەیت بزانی چ ڕۆژیان زۆر گەرمە ئەو ڕۆژە بە ڕۆژو دەبیت؟

لە وەڵامدا وتی: هەر شتێك نرخەکەی هەرزان بێت هەموو کەسێك دەتوانێت بیکڕێت..

(سبحان الله) کە کەنیزەکێك ئاوا تێگەیشتووە لە کاڵای گرانی خوا کە بەهەشتەو زۆر گرانە و دەبێت زیاتر خۆمانی لە پێناودا بڕەنجێنین و بە دەستی بهێنین و ئەمەش مانای فەرموودەکەی پێغەمبەرمانە (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((الا ان سلعة الله غالية، الا ان سلعة الله جنة))، واتە: شت و مەك و کاڵای پەروەردگار گرانە و شمەکی پەروەردگار بەهەشتە !.

عن محمد بن حسين قال: كانت امرأة تصوم في شدة الحر حتى يسود لونها ويتغير وجهها، فتقول لها في ذلك، فتقول: انما أدور على طول الري والشبع في الاخرة.[1]

واتە: محمدی کوڕی حسين دەڵێت: ئافرەتێك هەبوو لە ڕۆژە زۆر گەرمەکاندا بە ڕۆژو دەبوو، تا وای لێهاتبوو ڕەنگە جوانەکەی ڕوومەتی ڕەش هەڵگەڕابوو و دەم و چاوی تێك چووبوو، بۆیە لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵدا کرد، ئەویش لە وەڵامدا پێی دەگوتن: بۆیە ئەم کارە قورس و گرانە دەکەم تا لە ڕۆژی قیامەتدا بەردەوام تێر ئاو و تێر نان بم.

دەربارەی ڕۆژو گرتنی پێغەمبەرمان (ﷺ) لە ئەنەسی هاوەڵی دڵسۆزی پێغەمبەر دەپرسن چونکە لە هەمووان زیاتر شارەزا بوو بە حاڵی پێغەمبەر و (١٠) ساڵ خزمەتکاری کردووە لە دەر و لە ماڵ.

منیش لە شیعرێکمدا وتوومە:

ئەنەس دەفەرموێت بۆ ماوەی دە ساڵ — لە خزمەتیا بووم لە دەر و لە ماڵ

نە قسەی پێ وتووم نە لێشی داوم — بە فیدای ئەو بێ هێز و هەناوم

---

١ هەمان سەرچاوە (٣٨٩/٢).

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) بەم چەشنە وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە:

* عن حميد قال: سأل أنس بن مالك – رضي الله عنه – عن عبادة النبي (ﷺ) قال: كان يصوم من الشهر حتى تقول لا يفطر شيئاً.[1]

واتە: حەمید دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) پرسیاری لێ کرا دەربارەی بەرستش و خواناسی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش لە وەڵامدا ووتی: بەدرێژای مانگ بەڕۆژوو دەبوو تا وامان دەزانی هەرگیز نایشکێنێ و بەردەوام بەڕۆژوو دەبێت.

ئەم پەروەردە ناوازەیەی کە پێغەمبەرمان (ﷺ) بەکردەوە ئاراستەی هاوەڵە شیرنەکانی دەکرد کاری کردبووە سەر جەرگ و هەناوی هەموو هاوەڵان بە تایبەتی چوار یارە ڕاشیدەکە (خوایان لێ ڕازی بێت) با سەرێك لە عومەری کوڕی خەطاب بدەین (خوای لێ لاڕازی بێت) بزانین چۆن بە ڕۆژو بوو:

* عن زيد بن اسلم عن ابيه قال: كان عمر يصوم الدهر وكان زمان رماده – زمن القحط – اذا أمسى أتى بخبز قد ثرد في زيت.[2]

واتە: عومەری کوڕی خەطاب (خوای لێ لاڕازی بێت) هەموو ساڵ بە ڕۆژوو دەبوو – جگە لە ڕۆژوە حەرامەکان – و لەو ساڵە گرانیەی هات بەسەر شاری مەدینەدا بەردەوام لەگەڵ هەژارانی بێ نان و ئاودا ئەویش بەڕۆژو دەبوو، هەموو بەربانگەکانیشی بە تریتی نانە ڕەق و زەیت دەکردەوە.

مژدە بۆ عاشقانی ڕۆژو.. ئەوانەی دوو شەممە و پێنج شەممانیان نافەوتێ.. ئەوانەی سێ شەوە سپیەکەی هەموو مانگە کۆچیەکان بە ڕۆژو دەبن و یان ڕۆژوی داود پێغەمبەر (ﷺ) زیندوو دەکەنەوە کە ڕۆژی نا ڕۆژێك بە ڕۆژو بووە و گوێ بۆ ئەم مژدەیە بگرن:

* عن ثابت عن عبدالله بن رباح قال: ((يوضع الموائد يوم القيامة للصائمين فيأكلون والناس في الحساب)).[3]

---

١ اخرجه البخاري ومسلم.

٢ صفة الصفوة (١٤٧/١).

٣ الجامع لشعب الايمان (٤١٥/٦).

واتە: ثابت لە عبدالله ی کوڕی ڕیباحەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی لە ڕۆژی قیامەتدا و لە ساحەی مەحشەردا سفرەی دووروودرێژ بۆ ڕۆژوەوانان دەڕازێتەوەو دەست دەکەن بە نان خواردن و خەڵکی هێشتا بە پێوە وەستاون و چاوەڕوانی لێپرسینەوەن.

پێشەوایان و سەرمەشقەکانمان لە صالّحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ئەوەندە تامو چێژی شەونوێژ و ڕۆژوی سوننەتیان چەشتووە لە سەرەمەرگیشدا گریاون بۆ لە دەستدانی.

* حدث عبيدالله بن محمد التيمي، حدثني بعض أشياخنا: ان رجلاً من علية هذه الأمة حضرته الوفاة، فجزع جزعاً شديدا، وبكى بكاءً كثيراً، فقيل له في ذلك، قال: ما أبكي الاّ على ان يصوم الصائمون لله، ولستُ فيهم، ويصلى المصلون ولست منهم، ويذكره الذاكرون ولست منهم، فذلك الذي أبكاني.[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی محمدی تیمی دەڵێ: هەندێ لە مامۆستاکانم بۆیان گێڕامەتەوە، کە پیاوێك هەبوو لەپیاوە خواناسی و صالّحەکانی ئەم ئومەتە، و کاتێ وەختی سەرەمەرگی هات دەستی کرد بە گریانێکی زۆر و هاوار هاوارێکی لە ڕادە بەدەر ، کاتێ دەربارەی هۆی ئەو گریانەی پرسیاریان لێ کرد، لە وەڵامدا ووتی: من لە ترسی مردن نیە کە دەگریم بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە خەڵکی بۆ خوا بەڕۆژوو دەبن من لەگەڵیان نیمو خەڵکی نوێژ دەکەنو من لە گەڵیان نیم و خەڵکی ذیکر و یادی خوادەکەن و من بێبەشم لێی.. ئەوە بوو هۆی گریانەکەم.

براو خوشکانم.. نەکەن پێتان خۆش بێت خەڵکی بزانێت بەڕۆژوون .. یان پەنا بەخوا – خۆتان باسی بکەن.. و ڕۆژوەکەتان ئیخلاصی تێدا نامینێت و (ریاء)و ڕووپامایی تێدەکەوێت کە بە ڕۆژو نەبیت خۆشەویستریت لە لای خوا – تا ڕیای تێ بکەیت – دە گوێ بگرە بۆ صالّحان و بزانە چۆن حەزیان نەکردووە جگە لە خوا کەس بە بەندایەتی و ڕۆژوەکانیان بزانێت..

---

١ الجامع لشعب الايمان للبيهقي (٦/٤١٨).

* (كان احد الصالحين جالس في غرفته يصلي او يختم القران او يعلم الناس، وعندما يأتي وقت الطعام، يأتي به ابنته فتضعها أمامه وعندما تخرج، يضعه امام الهرة فتأكل منها قليلاً فتذهب، وتأتي ابنته ليعيد الصحون وبقايا الطعام تظن ان اباها اكله فتقول بالعافية يا أبي).

واتە: یەکێك لە صاڵحان – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە ژوورەکەی خۆیدا یان خەریکی نوێژ بووە یان خەریکی خەتم کردنی قورئان بووە، یان وانەی زانستی بە قوتابیان وتووەتەوە.. کە کاتی نانی نیوەڕۆ دەهات کچەکەی خواردنی بۆ دەهێنا بیخوات، ئەویش دەیفەرموو: داینێ و خۆت بڕۆ، و پاشان دایدەنا لەبەردەم پشیلەیەکداو ئەویش بەشی خۆی لێ دەخوارد و کە کچەکەی دەهاتەوە سفرەکە لاباتدەبینێت خواردوویەتی وایدەزانی باوکی خواردوویەتی دەڵێت نۆشی گیانت بێت.

دەخیلت بم – لە خێری گەورەی ڕۆژو خۆت بێبەش مەکە – چونکە ڕۆژو جێ ژوانگە و مەنزڵگەی صاڵحانە.. گوێ بگرە و بزانە یەکێك لە صاڵحان کە ناوی (بدیل العقیلي)یە لەم بارەیەوە چی دەڵێت:

* عن الوليد بن هشام عن بديل العقيلي قال: الصيام معقل العابدين.[1]

واتە: وەلیدی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە کە (بەدیل عوقەیلی) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – فەرموویەتی: ((ڕۆژوو ژوانگەی، کانگەی، سەرچاوەی خۆشی خواناسانە)).

دەی خوشك و براکانم.. دەخیلتان بم با کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی کە زۆر لە ئیسلامی عەزیزیش شارەزا نەبوو کەچی لەگەڵ ڕۆژوودا دەست لە مل بووە و خۆشی و چێژی لەو بەندایەتییە وەرگرتووە.. فەرموون لەگەڵ دوو عەرەبی دەشتەکی شواندا – کە دەتوانرێت بە پێشەوایانی صاڵحین دابنرێن.

* عن سعيد بن أبي عروبة قال: حج الحجاج فنزل بعض المياه بين المكة والمدينة، ودعا بالغذاء، فقال لحاجبه: أنظر من يتغذى معي وأسأله عن بعض الامر؟

---

١ صفة الصفوة (٣٨٩/١).

فأتوا باعراب اليه، فقال له: أغسل يدك وتغدى معي، فقال: انه دعاني من هو خير منك فاجبته، قال: ومن هو؟ قال: الله تبارك وتعالى — دعاني الى الصوم فصمت. قال: أفي هذا الحر الشديد؟ قال: نعم صمت ليوم اشد حراً من هذا اليوم.

قال له: أفطر وصم غداً، قال: ان ضمنت لي البقاء الى الغد. قال: ليس لي ذلك، قال: فكيف تسألني عاجلاً بأجل لا تقدر عليه، قال: انه طعام طيب، قال: لم تطبه انت ولا الطباخ انما طيبته العافية.

واتە: حەجاجی کوڕی یوسف (الثقفي) لە سەفەری حەجدا بوو لە نێوان مەککە و مەدینەدا لەسەر کانی و ئاوێکدا لایدا بۆ حەوانەوە، و داوای خواردنی کرد، و پاشان بە پاسەوانەکەی خۆی وت: بڕۆ کەسێکم لەم دەوروبەرەدا بۆ بدۆزەرەوە تا لەگەڵمدا نان بخوات و هەندێ پرسیاریشی لێ بکەم.

ئەوانیش عەرەبێکی دەشتەکیان بۆ دۆزیەوە و هێنایان بۆ لای، و ئەویش پێی وت: دەستەکانت بشۆرە و نانم لەگەڵدا بخۆ، کابراکە وتی: ناخۆم، کەسێکی تر دەعوەتی کردووم کە زۆر لە تۆ باشترە، وتی: ئەو کەسە کێیە؟ وتی: خوای تەبارەك و تەعالایە بانگی کردووم بۆ ڕۆژو گرتن و منیش چووم بە دەم داواکاریەکەیەوە.

حەجاج وتی: ئا لەم ڕۆژە گەرمەدا بە ڕۆژویت؟ وتی: بەڵێ ڕۆژو دەگرم بۆ ڕۆژێکی زۆر لەم ڕۆژە گەرمتر، و پێی وت: ئەمڕۆ لەبەر من بیشکێنە و سبەینێ بەڕۆژوو بە، پیاوەکە وتی: جا تۆ دەتوانیت کەفالەتی سبەینێم بکەیت کە دەمێنم؟ حەجاج وتی: ئەوە لە دەسەڵاتی مندا نییە.. کابرایش وتی: جا ئیتر چۆن بۆ دوورێك نزیکێکم لە دەست دەدەیت.

حەجاج وتی: کورە وەرە بخۆ، خواردنەکە زۆر خۆش و بە لەزەتە. کابرا وتی: نە تۆو نە چێشت لێنەر بە لەزەتیان نەکردووە بەڵکو لەش ساغی خۆش و بە لەزەتی دەکات.

هەر بەم شێوەیە عەرەبێکی دەوار نشینی تریش بەڕۆژو بووە و بگرە وای کردووە لە پێشەوایەکی صاڵحی وەك (ڕوحی کوڕی زەنباع) بە بینینی ئەو بێز لە خۆی و خواناسیە کەمەکانی خۆی بکاتەوە. ئەمە چۆن بووە؟:ـ

* نزل – روح بن زنباع – رحمه الله – على ماء، فنزلا بين المكة والمدينة في حرٍّ شديد، فراى راعياً فقال له: هلم الى الغداء، قال: انا صائم، قال: وانك لتصوم في هذا الحر الشديد؟ قال: أفادع اياماً تذهب باطلا؟! قال روح: لقد كنت يا أعرابي ظننتُ بأيامك ان تذهب باطلاً لقد جاد بها – روح – وانشأ يقول:

لقد ضننت بأيامك يا راعِ اذا جاء بها روح بن زنباع.[1]

واتە: ڕوحی کوڕی زەنباع – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە نێوان مەکە و مەدینەدا لەسەر ئاوێك لایدا بۆ نان خواردن، و لەو کاتەدا عەرەبێکی دەشتەکی هات و بانگی کرد بۆ نان خواردن لەگەڵیدا، دەشتەکیەکە وتی: من بە ڕۆژوم! ڕوح وتی پێی: ئا لەم گەرما و قرچەی هاوینەدا بە ڕۆژویت؟ لە وەڵامدا وتی: چۆن ئەیەڵم ئەم ڕۆژانەی تەمەنم بە بێ هودە لە دەستم دەربچن.

ڕوحیش – دەست دەکات بە گریان و دەڵێت ئەی عەرەبە دەوار نشینەکە بە ڕاستی تۆ گومانت چاکە بەرامبەر ڕۆژەکانی تەمەنت و نایان فەوتێنی لە کاتێکدا ئەم (ڕوح)ی کوڕی (زەنباع)ە بێهودە بەڕێیان دەکات.

* عن حسن بن صالح عن عبدالعزيز بن رفيع قال في تفسير قوله تعالى: ﴿كلوا واشربوا هنيئاً بما أسلفتم في الايام الخالية﴾، قال: أي ايام الصوم.[2]

واتە: عبدالعزیزی کوڕی ڕەفیع لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ڕۆژانی ڕابردوو واتە ڕۆژانی بە ڕۆژو بوونتان.

---

١ الجامع لشعب الايمان (٦/٤٢٤).

٢ هەمان سەرچاوە (٦/٤٢٥).

# بەشی دووەم

# صاڵحان چۆن سەیری خۆیانیان کردووە؟

## لە شەش جێباسدا:

١- خۆیانیان بە دڵ نەبووە:

٢- خۆیانیان لە پلە و پایە و شورەت پاراستووە:

٣- خۆیانیان بە نزم سەیرکردووە:

٤- خۆیانیان لە (بیدعە)کاری پاراستووە:

٥- خۆیانیان لە (ڕیا)کاری پاراستووە:

٦-خۆیانیان لە غەیبەت پاراستووە:

# یەکەم

## صاڵحان خۆیانیان بەدڵ نەبووە!

مرۆڤی موسڵمان – بەوپەڕی توانا هەوڵی ئەوە دەدات گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار بێت و خۆی لە حەرام و قەدەغەکراوەکانیشی بپارێزێت، کە خەڵکی لە دوورەوە بۆی دەڕوانن بە چاوێکی زۆر قورس و ڕێزەوە سەیری دەکەن.

بەڵام ئەو خۆی خۆی باش دەناسێت.. خۆی نرخی خۆی باش دەزانێت، کە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ خەڵکانی تردا تا لە ڕۆژی قیامەتدا کارت وەردەگرێتەوە ئەو کاتە شایانی ئەوەیە خۆی هەڵبنێت و کارتەکەی بەرزبکاتەوە و بڵێ سەیرکەن! سەیرکەن! من چ خواناسێك بووم لە دنیا.. ئای کە شەونوێژ و ڕۆژو و خواپەرستی زۆرم بووە.. سەیرکەن چ پیاوێکی مەزن بووم کەچی ئێوە نەتاندەناسیم خۆیشم نەمزانیووە شایانی ئەم پلە بەرزەم هەرچەندە گومانم بوو کە خوا پاداشتی کردەوە چاکەکانم دەداتەوە وەك لە قورئاندا هاتووە:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾﴾.[1]

واتە: هەر کەسێك – خوا بۆی بکات – و لە ڕۆژی قیامەتدا نامەی کردەوەکانی بدەن بە دەستی ڕاستیەوە – کە لە ساحەی مەحشەردا – هەر کەسێ کارتەکەی درا بە دەستی ڕاستیەوە – ئەوە دەرچووە و هەر کەسیش درا بە دەستی چەپیەوە – خوا بمانپارێزێت ئەوە لە تاقیکردنەوەکانی ژیانی دنیایدا کەوتووە و هەموو خەڵکی بەو کارەدا دەزانن کێ دەرچووە و کێش کەوتووە..

جا دەرچووەکە بە هەموو دەنگی هاوار دەکات و ڕوودەکاتە ئەو ملیارەها کەسەی لە ساحەی مەحشەردا بە ڕووت و قووتی وەستاون و چاوەڕێی لێپرسینەوەن و پێیان

---

١ الحاقة: الآية (١٩، ٢٠).

دەڵێت ئەها نمرەکانم چەند بەرزن، دە سەیری کەن.. دە بیخوێننەوە من خۆم گومانم دەبرد کە ئاکامەکەم بەم ئەنجامە جوانە دەگات.. بەڵام گشتی خەمی خۆیەتی و یەك کەس نییە بیپەرژێت نمرەکانی بخوێنێتەوە..

خـوای – عـز وجـل – پێمـان دەفـەرمووێت کەسـتان بـە نوێـژ و ڕۆژو و خواپەرستیەکانتانەوە نەنازن بەسەر خەڵکیدا – کێ دەڵێ دڵتان خاوێن بۆتەوە و شایانی لێبوردنی پەروەردگاری جیهانن؟! ئاخر خۆ هێشتا کارت نەدراوەتەوە کێ دەڵێ لێتان وەرگیراوە وەك دەفەرمووێت:

* قال الله تعالى: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾.[1]

واتە: خوای – عز وجل – دەفەرمووێت: ئەی موسڵمانان خۆتان بە چاك و پاك و بەرز و لە خواترس مەزانن – کە ئەوە دەبێتە هۆی لەخۆبایی بوون بەڵکو تەنها خوا خۆی دەزانێت کێ پاك و لە خواترسە..

گوێ بگرە بۆ ئەم وتو وێژە ناسکەی نێوان دایکمان عائشە (ڕەزای خوای لێ بێت) و پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان (ﷺ) کە چۆن چەند مەفهومێك بۆ خێزانی ڕۆشن دەکاتەوە، کاتێ کە دەپرسێت لێی و دەڵێت: ئایا ئەو کەسانەی کە گوناهبارن و دزیو شتی تر دەکەن ئەو ئایەتە دەیانگرێتەوە کە دەفەرمووێت:

عن عائشة – رضي الله عنها – فقالت: سألت رسول الله (ﷺ) عن اية: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، فقلت: أهم الذين يشربون الخمر ويزنون ويسرقون؟ قال: لا يا إبنة الصديق ولكنهم الذين يصومون ويصلون ويتصدقون ويخافون ان لا يتقبل منهم اولئك يسارعون في الخيرات))[2]

واتە: عائشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام پرسی (ﷺ) دەربارەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێت: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، واتە ئەوانەی

---

١ سورة النجم: الآية (٣٢).

٢ رواه الترمذي والحاكم و قال صحيح الاسناد.

پێشبڕکێی یەکتری دەکەن لە کاری چاکەدا، ئایا مەبەستی ئەو کەسانەیە ئارەق دەخۆنەوەو داوێن پیسی و دزی دەکەن؟

پێغەمبەر (ﷺ) لە وەلامدا پێی فەرموو: نا، ئەی کچی (صدیق) بەڵکو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ڕۆژو دەگرن و نوێژ دەکەن و پارە دەبەخشن و کەچی لە هەمان کاتدا ترسی ئەوەیان هەیە خوا لێیان وەرنەگرێت و ڕەنجەڕۆبن ئەوانە لە پێشبڕکێی کاری چاکەدان.

ئەی ئەو خوشکەم.. ئەی ئەو برایەم کە دەتەوێت.. بگەیتە کاروانی صالّحان – خوا کۆمەکت بێت – بەلام دەخیلت بم کاتێك دەستت کرد بە وەرزشە قورسەکانی گەیشتن بەو ئامانجە زۆر خۆشەویست دەبیت لە ناو خەڵکیدا – بەلام نەکەیت خۆت بە صالّح و پیاوچاك لە قەڵەم بدەیت – ئەوە بەرەو دواوە دەتگەڕێنێتەوە..

تۆ (١٠) سالّ لەسەر یەك شەونوێژ بکەیت لەوانەیە نەگەیتە ئاستی خواناسێکی پایە بەرزی وەك حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەی گوێ بگرە و بزانە چۆن سەیری خۆی دەکات و چۆن وەسفی خۆی دەکات بۆ فەرەزدەقی شاعیر؟:

* فلما مات نوار بنت أعين – أمرأة فرزدق – كانت قد اوصت ان يصلي عليها حسن البصري، فشهدها أعيان أهل البصرة مع الحسن، والحسن على بغلته، وفرزدق على بعيره فسار، فقال الحسن للفرزدق: ماذا يقول الناس؟ قال: يقولون: شهد الجنازة اليوم خير الناس – يعنونك – وشر الناس يعنونني، فقال له: يا أبا فراس لستُ بخير الناس وليس انت بشر الناس).[1]

واتە: کاتێك خێزانی فەرەزدەقی شاعیر مرد کە ناوی (نەواری کچی ئەعیون) بوو پێش مردنی وەسیەتی کردبوو کە زانای بەسرە (حسن البصری) نوێژی بەسەرەوە بکات – بۆیە هەموو پیاو ماقولانی بەسرە لەگەلّ ئیمام حسن دا بەشداری بە خاك سپاردنەکەیان کرد، و حەسەن (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە سواری ئێسترەکەیەوە و فەرەزدەقیش بە سواری حوشترەکەیەوە پێکەوە دەڕۆیشتن، و لە ڕێگادا حەسەن پرسیاری کرد لە فەرەزدەق و وتی: ئایا ئەو خەڵکە لە ناو خۆیاندا چی دەڵێن؟

---

١ عمر بن عبدالعزیز – للصلابي لا ١٩٩.

فەرەزدەق وتی: قوربان دەڵێن ئەمڕۆ چاکترین کەسی بەسرە – مەبەستیان تۆیە – و خراپترین خەڵکی بەسرە – مەبەستیان منە – لەگەڵ ئەم جەنازەیەدان، حەسەن ڕووی تێکرد و فەرمووی: نە من چاکترین کەسم و نە تۆش خراپترین کەسیت..

ئەمە ئەو پیاوە خواناسە مەزنەیە کە گەوهەرێك بوو لە ئیسلامدا دەدرەوشایەوە کەچی ئاوا بە خۆی دەڵێت خۆزگە هەر بەوەوە بوەستایە، نا بەڵکو لە چاو زانایان و خواناسانی پێشووی ئوممەتدا خۆی بە پلەی دز زانیووە، ئەمە چۆن بووە؟

* عن یوسف بن أسباط قال: مکث الحسن البصري – رحمه الله – ثلاثین سنة لم یضحك و ثلاثین سنة لم یمزح قال: مع ذلك قال عن نفسه: لقد أدرکت أقواماً ما انا عندهم الاّ اللّص).[1]

واتە: یوسفی کوڕی ئەسبات دەڵێت: حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ پێ نەدەکەنی و ماوەی (٣٠) ساڵ گاڵتە و گەپ و شۆخی نەکردووە کەچی لەگەڵ ئەو خواناسی و چاکییەیدا بە خۆی دەڵێت: من کاتی خۆی پیاو چاکانێکی وام بینیووە کە من ئێستا لە چاو ئەواندا وەك (دز) وام!

یاران وەرن با ئیمام حەسەن بەجێبهێڵین و بچینە خزمەت (السري السقطي) لە عێراقو بزانین چیمان پێ دەڵێت و چۆن سەیری خۆمان بکەین؟

* قال الجنید البغدادي: ((سمعت (السري السقطي) – رحمه الله – یقول: ما أحب ان اموت من حیث اعرف اخاف ان لا تقبلني الأرض فافتضح)).[2]

واتە: خواناس و صاڵحی ئوممەت – جونەیدی بەغدادی – دەڵێت: خۆم گوێم لێ بوو کە مامۆستا (السري السقطي) – بە ڕەحمەت بێی – دەیفەرموو: حەز ناکەم لە جێیەکدا بمرم کە خەڵکی بمناسن و گۆڕەکەم بزانن چونکە زۆر ئەترسم گۆڕ نەمگرێتە خۆی و فڕێم بداتە دەرەوە و ئابڕووم بچێت.

با صاڵحەکەی عێراق بەجێ بهێڵین و بچینە خزمەت – محمدی کوڕی واسع (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و بزانین چۆن سەیری خۆی دەکات لە کاتێکدا کە

---

١ صفة الصفوة (٣/١٥٦).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٢٤٥).

موسڵمانان بە دەستە دەستە دەهاتنە خزمەتی و بە بینینی و بە گوفتاری چین چین باوەڕیان زیادی دەکرد و وانەی صالح بوون و بەرەو خوا چوون فێر دەبوون کەچی گوێ بگرە بە خۆی چی دەڵێت؟ و بزانە تۆش چۆن سەیری خۆت دەکەیت؟!.

* عن يونس قال: سمعت محمد بن واسع – رحمه الله – يقول: ((لو كان يوجد للذنوب ريح ماقدرتم ان تدنوا مني من نتن ريحي)).[1]

واتە: یونس دەڵێت: لە –محمدی کوڕی واسع– م بیست (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: ئەگەر گوناھ بۆنی هەبووایە، کەستان نەتاندەتوانی لێم نزیك ببنەوە لەبەر زۆری گوناهەکانی من..

بڕای خۆشەویستم.. خوشکی بەڕێزم.. تۆ هەرگیز ڕوویداوە کە تووشی ناڕەحەتییەك بێیت و بڵێیت لەوانەیە بە هۆی سەرپێچییەکی خۆمەوە بوو بێت... یان لە شوێنێکدا سووکایەتی و بێ ڕێزیان بەرامبەر نواندی یەکسەر بە خۆتا چوو بیتەوە و وتبێتت وا دیارە گوناهێکم کردووە وا خوا ئەم سوك و سەلیمانەی زاڵ کردووە بەسەرمدا؟. دەی گوێ بگرە بۆ وەکیعی کوڕی جەڕاح – مامۆستا دڵسۆزەکەی ئیمام شافعی بزانە لەم بارەیە چ وانەیەکمان فێر دەکات و چۆن سەیری خۆی دەکات؟!

* عن احمد بن محمد قال: اخبرني بعض أصحابنا عن وكيع بن الجراح – رحمه الله – قال: أغلظ رجل مع وكيع بن الجراح، فدخل وكيع بيتاً فعفر وجهه في التراب ثم خرج الى الرجل، فقال: زد وكيعاً بذنبه فلولاه ما سلط عليه.[2]

واتە: ئەحمەدی کوڕی محمد دەڵێت: هەندێ لە هاوڕێکانمان دەربارەی وەکیعی کوڕی جەڕاح بۆیان باس کردووین کە جارێکیان پیاوێك زۆر پیس دادەبەزێتە سەر وەکیعی کوڕی جەڕاح و قسەی سووکی زۆری پێ دەڵێت.. وەکیعیش خۆی کرد بە ماڵێکدا و خۆڵی کرد بە دەم و چاوی خۆیدا و پاشان هاتە دەرەوە بۆ لای پیاوەکە و پێی وت: دەی زیاتر قسە بە وەکیع بڵێ دیارە لەبەر گوناهباریەتی، و ئەگەر گوناهەکانی نەبووایە تۆ ئاوا پێت نەدەوێرا و زاڵ نەدەبووی بەسەریدا.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٨٠).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/١١٣).

براکەم، خوشکەکەم.. لەم ڕێگایەدا کە تۆ گرتووتەتە بەر و دەتەوێت هەڵسوکەوتی بەرزی صاڵحان زیندوو بکەیتەوە.. لە ناو خەڵکدا زۆر خۆشەویست دەبیت و لە ڕادەبەدەر ڕێزت دەگرن و بە گەورە سەیرت دەکەن..دەخیلت بم تۆ هێشتا لە دوای کاروانەکەوەیت و لە خۆت بایی نەبیت و فوو نەکەیتە خۆت.. بەڵکو گوێ بگرە بۆ ( ابن عمر) (خوای لێ ڕازی بێت) بزانە بە چ شێوەیەکی جوان‌و پەروەردەیی وەڵامی کابرا عێراقییەکە دەداتەوە و خۆی لەو ئاستە نزمتر دەکاتەوە کە ئەو پیاوە ویستی بەرزی بکاتەوە و تۆش لە خولی صالح بووندا زۆر ئاگات لێی بێت؟:

* عن أبي الوازع قال: قلت لإبن عمر – رضي الله عنهما – لايزال الناس بخير ما أبقاك الله لهم، قال: فغضب ابن عمر وقال: انّي لأحسبك عراقياً ومايدريك ما يغلق عليه ابن أمك بابه.[١]

واتە: (ابی الوازع) دەڵێت: جارێکیان بە (ابن عمر)م ووت: خەڵکی وەزعیان لە باشیدایە تا خوا تۆیان لەناو بهێڵێت! (ابن عمر) – خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێت – زۆر ناڕەحەت و تورە بوو بە بیستنی ئەو وتەیە و پێی ناخۆش بوو بۆیە پێی وت: من وا ئەزانم تۆ عێراقیت و عێراقیش لە خۆیانەوە بێ بەڵگە قسە دەکەن – ئەگینا تۆ چوزانیت ئەم کورەی دایکت – مەبەستی خۆی بوو – چووە ئەودیوی دەرگای حەوشەکەی ماڵەوەیان چی دەکات و چی ناکات!

لەگەڵ خواپەرستی و شەونوێژ و ڕۆژوی سوننەت و قورئان خوێندن و ذیکر و کاری چاکەکارییەکاندا هەر ترسی ئەوەت هەبێت کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەر دەمی خوای جیهانیاندا دەوەستیت و کێ دەڵێ ئەو کردەوانەت ئەوەندە ئیخلاصیان تێدابووە کە لێت وەرگیرابن و ڕزگار بوویت، چونکە گوێ بگرە بۆ (ابن مسعود) (خوای لێ ڕازی بێت) بزانە لە بەرامبەر قسەی ئەو پیاوەدا کە وتی: من پێم خۆش نییە لە (أصحاب الیمین) بم بەڵکو پێم خۆشە لە (مقربین) بم واتە زۆر لە خواوە نزیك بم!:

* عن مسروق قال: قال رجل عند عبدالله بن مسعود – رضي الله عنه – ما احب ان اكون من اصحاب اليمين بل اكون من المقربين احب اليّ، قال عبدالله بن مسعود لكن هاهنا رجل ود انه مات لا يبعث ـ يعني نفسه ـ).[١]

---

١ صفة الصفوة (٢٦٣/١).

واتە: مەسروق دەڵێت: پیاوێك لە لای هاوەڵی شیرینی پێغەمبەرمان (ﷺ) عبدالله ی کوڕی مەسعود — دانیشتبوو وتی: من پێم خۆش نییە کە لە بەهەشتدا لە پلەی — اصحاب الیمین —دا بم، بەڵکو پێم خۆشترە کە لە ڕیزی زۆر نزیکەکانی خودا بم کە (مقربین)ن، بەڵام قوتابیەکەی قوتابخانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جۆرێکی تر تێگەیشتووە لە ڕۆژی سەختی قیامەت، بۆیە هەر لەوێدا دەڵێت: بەڵام ئا لێرەدا پیاوێك هەیە — مەبەستی خۆی بوو — حەز دەکات کە مرد ئیتر زیندوو نەکرێتەوە و لەبەردەمی لێپرسینەوەی خوادا ڕانەوەستێنرێت.

صاڵحان زۆر حەزیان بە ناوی زل و دێی وێران نییە، و حەز ناکەن بە ناوی گەورە بانگیان بکەیت.. ئایا تۆش وایت؟ دەی هەر کاتێك من و تۆش وامان لێهات ئەوە کەوتووینەتە سەر ڕێگای کاروانی صاڵحان و لەوانەیە ڕۆژێك بیانگرینەوە و لەگەڵ خۆیان بمانبەن..

دە سەیری (شەعبی) بکە — (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و بزانە لەگەڵ ئەوەی کە دەریایەکی قووڵ بووە لە زانست و فەتوادا کەچی خۆی بە زانا نازانێت ئەمە چۆن بووە؟

* قال الشعبي — رحمه الله — انا لسنا بالفقهاء، ولكنا سمعنا الحديث فرويناه ولكن العلماء من اذا علم عمل.[2]

واتە: عامیری کوڕی شراحبیل الشعبی کە ئەستێرەیەکی گەشاوەی سەردەمی خۆی بووە لە زاناییدا کەم وێنە بووە و زانستی عائشە و ابن عمر و سعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەمری کوڕی عاصی هەڵگرتبوو. کەچی دەربارەی خۆی دەڵێت: ئێمە زانا و فیقهزان نین، بەڵکو ئێمە هەندێ فەرموودەمان بیستووە و پاشان بۆ ئێوەمان گێڕاوەتەوە، بەڵام زانای ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە زانیاریەکیان وەرگرت یەکسەر بە کردەوە کاری پێ دەکەن.

---

١ هەمان سەرچاوە (١/٢١٣).

٢ عمر بن عبدالعزيز للصلابي لا ١٧٦.

لە کاروانی صالّح بووندا دەبێت هەردەم بڕۆینە خزمەت گەورەی باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز و بتوانین ئەو وانە قورس و وەرزشە ناڕەحەتە ئەنجام بدەین و وامان لێ بێت گومانی ئەوە بکەین کە خراپین و خۆمان بە پۆخڵەوات بزانین لە چاو پیاوچاکان و خواناسە مەزنەکانی مێژووی دوور و درێژی ئیسلامدا.

با پێکەوە گوێ بگرین بۆ ئەو گفت و گۆیەی نێوان خەلیفەی نوێخواز و موزاحیمی هاوکاریدا کە چۆن عومەر دەترسێت لە خراپەکارانی ناو شاری مەدینە بێت؟!:

* خرج عمر بن عبدالعزيز – رحمه الله – من المدينة المنورة وهو يبكي ومعه خادمه مزاحم، فالتفت الى مزاحم وقال: يا مزاحم نخشى ان نكون ممن نفت المدينة، ويشير الى قول رسول الله (ﷺ): ((الا وان المدينة كالكير يخرج الخبث، لاتقوم الساعة حتى تنفي المدينة شرارها، كما تنفي الكير خبث الحديد)).[1]

واتە: عومەری کوڕی عبدالعزیز و موزاحیم ی هاوڕێی لە شاری مەدینە دەرچوون بەرەو دیمەشقی پایتەختی خیلافەتی ئومەویەکان و لە قەراغی شاردا لای کردەوە بە لای مەدینەی پڕ لە نوردا و بە موزاحیمی وت: زۆر ئەترسم لەو کەسانە بین ـ من و تۆ ـ کە مەدینە توڕیان دەداتە دەرەوە لەبەر خراپیان، مەبەستی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەفەرمووێت: شاری مەدینە وەك کورەی ئاسنگەر وایە و پۆخڵەوات فڕێ دەداتە دەرەوە، چونکە قیامەت نایەت تا مەدینە خراپەکارانی دەرنەداتە دەرەوە وەك چۆن کورەی ئاسن پۆخڵەواتی ئاسنەکان فڕێ دەداتە دەرەوە.

ئەی شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی ڕێبازەکەی محمد (ﷺ) ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت خۆت صالّح بیت.. خێزانەکەت صالّح بێت و کچ و کوڕەکانت و خوشك و براکانت صالّح دەربچن.. خوا یارمەتی دەرت بێت مادەم نیەتت وایە..

یەکێك لە نیشانەکانی ئەوەی کە لە کاروانی صالّحان نزیك بویتەوە و خەریکی دەچیتە ناویانەوە – انشاء الله – ئەگەر بگەیتە ئەو ئاستەی کە پێت ناخۆش بێت و خەفەتبار بیت ئەگەر گوناهێکت لە دەست دەرچوو، تاوانێك، سەرپێچیەکی

---

[1] هەمان سەرچاوە لا ٢٦.

پەروەردگارت ئەنجام دا.. بە دەم و چاوی خەمبارتەوە دیار بێت و خەڵکی لە دوورەوە هەست بکەن کە هەڵەیەکت ئەنجام داوە و خەفەتی پێ دەخۆیت و پێکەنین و قسەی خۆشت بۆ نایەت تا تەوبەیەکی ڕاستەقینەی لەسەر نەکەیت و چەندان کردەوەی جوانی بکەیت بە شوێنیدا..

ئایا چی دەکەیت کاتێك نەزەرێکی حەرام یان غەیبەتێك یان دڵی عاجزکردنی کەسێك یان پەنا بە خوا نوێژێکت بفەوتێت.. پێی خەفەتبار بوویت؟ دەی ئەوە نیشانەیەکی زۆر چاکە:–

* عن عبدالواحد قال: أتينا إمرأة متعبدة في ناحية البصرة لنسلم عليها، فقيل لنا: لا تصلون اليها، قلنا: ولم ذاك؟ قالوا: قد اغْلِقَت عليها الباب منذ ثلاث تبكي قلنا: ولم ذاك؟ قالوا: قتلت نملة)).[١]

واتە: (عبدالواحد) دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانمدا چووین بۆ سەردانی ئافرەتێکی خواناس لە گەڕەکێکی شاری بەسرە تا سڵاوی لێ بکەین ـ و هەواڵی بزانین پێیان وتین: مەڕۆن، چونکە ناتوانن ببینن، وتمان: بۆچی ناتوانین؟ وتیان: ماوەی سێ ڕۆژە دەرگای لەسەر خۆی داخستووە و هەر دەگری. وتمان: ئاخر بۆچی وای بە خۆی کردووە؟ وتیان: چونکە مێروولەیەکی کوشتووە.

صاڵحان – لە هەموو سەردەمێکدا نموونە و سەرمەشق بوون – بۆ خەڵکە خواناسە ئاساییەکان و لە سەرووی هەموو صاڵحانەوە، پێغەمبەران کە هەموو قۆناغەکانی صاڵح بوونیان بڕیووە و هەموو صاڵحانی دوای ئەوان لەوانەوە تیشکیان وەرگرتووە، ئەوە یوسف پێغەمبەرە (عليه السلام) لە لای فیرعەونی میسر – ئەمین حەوتەبی لاو –دا خۆی بەوە نازانێت کە زۆر بێتاوانە و لە گوڵ بەرینتره – هەرچەندە وایش بووە – و نایەوێت خەڵکی تاوانبار بکات لەسەر حیسابی پاکی خۆی نا بەڵکو نیازێکی تری هەبوو وەك لە قورئاندا هاتووە:

---

١ صفة الصفوة (٣/٤١).

* قال الله تعالى على لسان يوسف: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾﴾.[١]

واتە: پاش ئەوەی کە یوسف – علیه السلام – هەرچۆنێك بوو هەلی بۆ هەڵکەوت تا پاکی و بێ تاوانی خۆی بۆ هەموو گەلی میسر بسەلمێنێت و بەس، نەك مەبەستی ناوزڕاندن و لەکەدارکردنی کەسی تر، لەم هەواڵەیدا و وتی: خۆ ئەوە نەبێت من خۆم بێ تاوان بزانم و هەمووان بە تاوانبار، بەڵکو نەفس شایەنی بەرگریکردن نییە لێی بەڵکو نەفس هەمیشە لەگەڵ خراپەدایە مەگەر کەسێك خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی ڕەحمی پێبکات و دەروونی ژێرباری چاکەکاری بکات.

ئەوە پێغەمبەری ئیسلامە (ﷺ) و ڕۆژێکیان ژنێك لەماڵیان نانی دەخوارد و شەرم و هەیبەتی لە پێغەمبەری خوا دەکرد و دەستەکانی دەلەرزی و خاوەخاو نانی بۆ دەخورا و پێغەمبەر هەستی بەم وەزعەی ئەم خوشکە میوانە کرد با بزانین چی پێ دەفەرمووێت تا ئاسایی بکاتەوە و بێتەوە سەرخۆی و نەترسێت:

* قال رسول الله (ﷺ) لها: (إهدئي من روعك انما انا ابن إمرأةٍ كانت تاكل القديد).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی کردە ئەو ژنە و پێی فەرموو: ترس و لەرز لەسەر خۆت لابە من کێم؟ جگە لەوەی کە من کوڕی ئەو ژنەم کە کاتی خۆی لە مەککەدا تریتی دەخوارد!..

برای صاڵحم.. لە هەر ئاستێکی زانستیدای، زۆر ئاسایی بێت لە لات ئەگەر لە مەسەلەیەکدا شارەزا نەبوویت هیچ شەرم مەکە و بڵێ نایزانم و هەرچەندە دەروونت پێی ناخۆشە و ئەو هەر حەزی لەوەیە کە خەڵکی نەزانێت بەوەی هیچ نازانێت.. بەو کارە سەختە دەچیتە سەر سکەی صاڵحان و بەرەو ڕوویان دەڕۆیت و هەر کاتێکیش مەرجی صاڵح بوونت تێدا هاتەدی بۆیان نییە وەرت نەگرن و ڕەدت ناکەنەوە، دەی چاك دڵ و گوێ بدە بە زانای مەزنی ئیسلام و پیاو صاڵحی سەردەمی تابعین – مالکی کوڕی ئەنەس – ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە چۆن بەو پرسیارکەرەی وت: نایزانم و شارەزاییم لەو بوارەدا نییە؟!

---

[١] سورة يوسف: الآية (٥٣).

* عن ابن المهدي قال: سأل رجل مالكاً عن مسألة، فقال: لا أحسنها، فقال الرجل: ان ضربت اليك كذا وكذا لأسألك عنها، فقال له مالك: فاذا رجعت الى مكانك و موضعك فأخبرهم اني قلت لا أحسنها).[١]

واتە: (ابن المهدی) دەڵێت: پیاوێك پرسیارێكی شەرعی كرد لە مالك و ئیمامیش فەرمووی: وەڵامی ئەو پرسیارەی تۆ باش نازانم!. پیاوەكەش وتی: لە فلان و فلان شوێنی دوورەوە هاتوومەتە خزمەتی تۆ بۆ ئەو پرسیارە كەچی تۆ بە ئاسانی دەڵێیت نایزانم، ئیمامیش ڕووی تێكرد و لەسەرخۆ پێی فەرموو: دەی زۆر باشە ئەگەر گەڕایتەوە بۆ وڵات و شارەكەی خۆت بڵێ كە من وتوومە باش نایزانم.

وشەی نازانم بۆ وەڵامی ئەو شتانەی كە شارەزاییت نییە تیایدا لە لای گێل و گەوارو خەڵكە سادەكە كەمێك پێی دەشكێیت بەڵام ئەوە هیچ نییە لە چاو ئەو شەخصیەتە گەورەیەی كە لە لای زانایان بە چاوی قورس سەیر دەكرێیت.

دووبارە دەتانبەمەوە خزمەتی (عبدالله ی كوڕی مەسعود) ڕەزای خوای لێ بێت و بزانین چۆن بۆ خۆی ڕوانیوە لە كاتێكدا كە مامۆستای شاری كوفە بووە و سەدان زانا لەسەر دەستی ئەو پەروەردەكراون كەچی گوێ بگرە بە خۆی دەڵێ چی؟ ئیتر بزانم من و تۆ كە دەمانەوێت وەرزشی قورسی صاڵح بوون جێبەجێ بكەین بە خۆمان چی بڵێین؟:

* عن حارث بن سويد قال: قال عبدالله بن مسعود – رضي الله عنه – ((لو تعلمون ما أعلم من نفسي لحثيتم على رأسي التراب)).[٢]

واتە: حارث ی كوڕی سوەید دەڵێت: عبدالله ی كوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: (( ئەگەر وەك خۆم بتانناسیمایە خۆڵتان دەكرد بە سەرمدا!)) ئەی خوات لێ ڕازی بێت ئەی هاوەڵە نازدارەكەی پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) تۆ هەموو ژیانت بەخشی بە خوا و ژیان لە خزمەت پێغەمبەر و ڕێبازە پاكەكەیدا و دەر و ماڵت خواناسی بووە كەچی ئاوا بۆ خۆت دەڕوانین، دەی ئەمەش وانەیەكی ترتانە و فێری ئێمەی گچكە صاڵحی دەكەن تا كاروانەكەتان ڕێگاكەی كوێر نەبێتەوە.

---

١ صفة الصفوة (١/١٢٠).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/١٥٣).

ئەمەش عەلی كوڕی (فضیل)ی كوڕی (عیاض).. پەروەردەكراوی دەستی باوكیەتی (فضیل)ی خواناس و موسڵمان، (فضیل)ی گەورەی صاڵحان.. صاڵحان زنجیرەی صاڵحیەت لە خۆیاندا قۆرخ ناكەن.. خۆیان لەگەڵ خوادا ڕێك ناخەن كەچی كوڕ و كچەكانیان لە ناو دەریایەك غەفلەت و بێ ئاگاییدا دەژین.. نا بەڵكو وایان لێ دەكەن كە پێشبڕكێ لەگەڵ باوكیاندا بكەن لە شەونوێژ و خواناسیدا. وەك ئەم نموونەیە:

* عن محمد بن الحسن قال: كان علي بن الفضيل بن العياض يصلي حتى يزحف الى فراشه ثم يلتفت الى ابيه فيقول: يا ابت سبقني العابدون).[1]

واتە: محمدی كوڕی حسن دەڵێت: عەلی كوڕی فوزەیل ی كوڕی عەییاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەگەڵ باوكیدا شەونوێژی دەكرد تا ئەوەندە ماندوو دەبوو كە بە سنگە خشە دەچووە ناو جێگەكەی خۆی بۆ حەوانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لایەكی دەكردەوە بۆ لای باوكی و پێی دەووت: خواناس و صاڵحان پێشم كەوتوون بابەگیان!.

سەرمەشق و گەورە صاڵحی ئیسلام — عومەری كوڕی خطاب (ڕەزای خوای لێ بێت) كاتێ دەچووە سەر مینبەر بۆ وتاری هەینی یەكەمین وشەی داننانی خۆی بوو بە لاوازی و چروكی و توند و تیژی خۆیدا و لە خوا دەپاڕایەوە ئەو ڕەوشتانەی تێدا نەمێنێت! دەی ئایا من و تۆ هەوڵی ئەوە ئەدەین ڕەوشتە نەخوازراوەكان لە خۆمان داڕنین یان داوامان كردووە لە خوا كە لە كۆڵمانی بكاتەوە:

* قال جامع بن شداد: عن ابي قال: كان اول كلام عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) حين يصعد المنبر ان قال: (اللهم اني شديد فلّيني، واني ضعيف فقوّيني، واني بخيل فسخّني).[2]

واتە: جامع ی كوڕی شەداد دەڵێت: باوكم وتی: یەكەمین وتەی عومەری كوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) كە دەچووە سەر مینبەرەكەی بۆ وتاردان دەیوت: ئەی

---

١ صفة الصفوة (١٦٥/٢).

٢ هەمان سەرچاوە (١٤٥/١).

پەروەردگارم من زۆر توند و تیژم نەرمم بکە.. و لاوازیشم بەهێزم بکە، و بەخیل و چروکم سەخی و دەست بڵاوم بکە.

ئەمەش بیشری حافیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و کاتێک زیانێک دەکات یان کەسێکی خۆشەویستی دەمرێت.. یەکسەر خۆی تاوانبار دەکات و بە خۆیدا دەچێتەوە، و ئەو کارەساتە دەبێتە چاك بوونی و بەرزبوونەوەی زیاتری ئاستی صاڵحیەتی.. نەك وەك هەندێ باوەڕ لاواز کە کاتێ تووشی زیانێك دەبن یان کەسێکی نزیکیان دەمرێت چەندان پتر و پۆ و قسەی نابەجێ دێت بە دەمیاندا و چەندان ناشکوری دەردەبڕن..

بەڵام (بشر الحافي) بە پێچەوانەوە دەکاتو وانەیەکی گەورەشمان فێر دەکات کە لە کاتی نەهامەتی و زیان و ناڕەحەتیدا چی بکەین؟ چی بڵێین؟ کە خوامان لێ نەڕەنجێت؟

* عن محمد بن يوسف الجوهري قال: سمعت بشر الحافي – رضي الله عنه – يقول – يوم مات أخته – ان العبد اذا قصر في طاعة الله سلبه الله من يؤنسه).[1]

واتە: محمدی کوڕی يوسف الجوهری دەڵێ: لە بشری حافیم بیست – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – کاتێ کە خوشکێکی مرد – وتی: ئای کە (بەندە) هەر کاتێك کەمتەرخەمی و سستی بنوێنێت خوای گەورە ئەو کەسانەی کە ئەو دڵی پێیان خۆشە لێی دەسەنێتەوە و دەمرن.

خوشکی بەڕێزم.. برای خۆشەویستم.. ڕێگای صاڵح بوون بگرەبەر.. چاوەڕوان مەکە و مەیدە دەست کاتێکی تر، و هەر لەم ساتەوە کە ئەم بابەتە گرنگە دەخوێنیتەوە تەوبە بکە و کردەوەی زۆر جوان و ڕەوشتی بەرز بنوێنە، جا لەو مەیدانەدا شتی سەیر و خۆش و سەمەرەی زۆر دەبینیت و ئەگەر پێیان زانیت کە تۆ کەوتوویتە سەر سکەی صاڵحان و خۆشیان ویستی و ئاواتیان پێ دەخواستی تۆ زیاتر بۆ خۆت بگری و بڵێ: من خۆم هەڵواسیووە بە شەمەندەفەری صاڵحاندا و هێشتا نایەڵن بچمە ژوورەوە کەچی خەڵکی حسابێکی زۆر گەورەترم بۆ دەکەن و ئەو کاتە

---

١ صفة الصفوة (١/٢١٤).

زیاتر بەخۆداچوونەوە دەکەیت و هەوڵ دەدەیت بچیتە ناو شەمەندەفەرەکە و، – انشاء الله – ئەوانیش دەستت بۆ کێش دەکەن و دەتبەنە ناو خۆیان.. با بزانین بیشری کوڕی حارث، چی کرد کاتێك سەرخۆشێك باوەشی پێداکرد و تێر ماچی کرد:

* عن محمد بن قدامة قال: لقی بشر بن حارث – رحمه الله – رجل عن سکر، فجعل یقبل ویقول: یاسیدي یا ابا نصر، وبشر لایدفعه عن نفسه، فلما ولّی تغرغرت عینا بشر وقال: رجل احب رجلاً علی خیر تهمه، لعل المحب قد نجا والمحبوب لایدري ما حاله).[١]

واتە: محمدی کوڕی قودامە دەڵێت: بیشری کوڕی حارث (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) جارێکیان سەرخۆشێك گەیشت پێی لە ڕێگایەکدا و پەلاماری دا و باوەشی پێداکرد و دەستی کرد بە ماچکردنی و بیشریش سەرسام بوو – لەو کارە – و لە خۆی دووری نەدەخستەوە – کاتێ سەرخۆشەکە بیشری بەردا و ڕۆیشت، چاوەکانی بیشر پڕبوون لە ئاو و بە دەم گریانەوە وتی: پیاوێك دێت و پیاوێکی خۆشدەوێت لەبەر گومانی چاکە، کە پێی دەبات.. کێ دەڵێ کەسی خۆشویست – کە سەرخۆشەکە بوو – لەبەر ئەو دڵە پاك و نیەتە خاڵصەی ناچێتە ڕیزی ڕزگاربووان و خۆشویستراویش – کە بیشرە – کێ دەزانێ حاڵی چۆن دەبێت لە دیوەخانی خوا؟!..

مژدەت لێ بێت ئەی بیشر و سەدان ساڵ بەسەر مردنتا تێپەڕیووە و نەوەکانی دوای خۆت و هەڵگرانی ئەو پەیامە موبارەکەی تۆ هەوڵ دەدەن چاو لە کار و گوفتار و ڕەوشتی بەرزی تۆ و هاووێنە صاڵحەکانی تۆ بکەن و تۆش – انشاءالله – حاڵت خۆش دەبێت ڕووسپی بەر دیوانی خوا دەبیت.

من دەڵێم پیاوچاکان بەوە بوونەتە سەرمەشقی کاروانی صاڵحان کە خۆیان بە دڵ نەبووە و خۆیان بە شایستەی بەهەشت و ڕەزامەندی خوا نەزانیووە و ئەمەش وای لێکردوون  کە بەردەوام لە تەعدیل کردن و ڕاست کردن و چاککردن و جوان کردنی بیروباوەڕ و کردەوەکانیاندا بن و تێر نەبن بە ذیکر و قورئان خوێندن.

وەك ئێمەی ئەم سەردەمە نەبوون کە بە نوێژە فەرزەکان و ڕۆژووی ڕەمەزانەوە خۆمان بە فضیل و مالکی ئەم سەردەمە دەزانین و لە خۆمان زۆر دڵنیاین.. بەلام با

١ هەمان سەرچاوە (١/٢١٦).

گوێ بگرین بۆ (فوزەیل) بزانین چی چفەیەك بۆ زانای پایەبەرزی (سفیانی کوڕی عیینە) دەکات؟

* عن ابي جعفر الحداء قال: سمعت فضیل بن عیاض – رحمه الله – یقول: أخذت بید سفیان (سفیان بن عیینة) في هذا الوادي فقلت له: ان كنت تظن انه بقی علی وجه الارض شر مني ومنك، فبأس ماتظن).[1]

واتە: (ابي جعفر الحداء) دەڵێ: لە (فضیل)ی کوڕی (عیاض)م بیست – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەیووت: دەستی سوفیانی کوڕی عویەینەم گرت ئا لەم دۆڵەدا و پێم وت: ئەگەر وا گومان دەبەیت کە لەسەر زەویدا کەسێك ماوە لە من و تۆ خراپتر بێت، ئەوە خراپترین گومانت بردووە و بە هەڵەداچوویت.

بۆ خوشکانی سەرپۆش بەسەریش.. با بچینەوە خزمەت دوو هەڵوێستی صالّحانەی دوو خوشکی سەرمەشقی کاروانەکەمان کاروانی صالّحان و بەرەو خوا چوون، و یەکەمیان ئافرەتێکی قولەڕەشی خەڵکی بەسرەیە و هەموو مامۆستایان و قوتابیانی قورئان سەردانیان دەکرد تا لێوەی وانەی صالّح بوون بە کردەوە ببینن وەك چۆن لە حوجرەکاندا بە نەزەری دەیانخوێند:

* عن صالح بن عبدالكریم قال: رأیت امرأة سوداء بالبصرة، والناس مجتمعون علیها، ثم قامت فدخلت داراً فدخلوا معها واحدقوا بها، فدنوت منها فقلت: یاهذه اما تخافین العجب؟ فرفعت رأسها فنظرت اليّ ثم قالت: كیف یعجب بعمله من لایدري لعله قد ردّ علیه؟).[2]

واتە: صالّح ی کوڕی عبدالكریم دەڵێ: ئافرەتێکی ڕەش پێستم بینی لە بەسرە، خەڵکی چواردەوریان لێدابوو، ئەویش خەریکی خواناسی خۆی بوو، هەر کە زانی چواردەورەیان لێ داوە، هەستا و چووە ماڵێکی ترەوە و هەموو خەڵکەکەش بە دوایدا چوونە ژوورەوە و هەر لە خواناسی و بەندایەتییەکانی ورد دەبوونەوە و چێژی ئیمانیان لێ وەردەگرت.

---

[1] صفة الصفوة (٢/١٦).

[2] صفة الصفوة (٣/٤٣).

و منیش لێی نزیك بوومەوە و پێم وت: ئایا لەوە ناترسیت غرور ڕووت تێ بکات و لەخۆت بگۆڕێیت؟ و ئافرەتەکە سەری هەڵبڕی و سەیرێکی کردم و پاشان وتی: مرۆڤ چۆن بە کردەوەیەك مەغرور دەبێت کە هێشتا نازانێت لێی وەرگیراوە یان دەدرێتەوە بە ناو چاویدا.

ئافرەتی دووەم – ئەستێرە پڕشنگدارەکەی ئاسمانی صالّحانە – کە ناوی (ڕابعە)ی (عدویە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە هەمیشە داوای لێخۆش بوونی لە خوا کردووە لەسەر ئەو بەڵێن و قسە زۆرانەی کە کردوویەتی و ڕاستی نەکردووە و نەیبردووەتە سەر و هەمیشە (أستغفرالله)ی کردووە:

* قال عباس بن الوليد: قالت رابعة العدوية – رحمها الله – (استغفر الله من قلة صدقي في قولي، استغفر الله).[1]

واتە: عەباسی کوڕی وەلید دەڵێت: ڕابیعەی عەدەویە – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەیووت: داوای لێخۆش بوون دەکەم لە خوا لەبەر کەمی ڕاستگۆییم لە قسەکانمدا و دەڵێم (أستغفر الله).

ئەگەر خەریکی کارێکی خێر بوویت و کردەوەی جوانت دەنواند – لە خۆت بایی نەبیت – بەڵکو بە پێچەوانەوە بڵێ: چەندان کاری چاکە هەیە کە هیچیانم نەکردووە و لە مندا نین، و هەوڵ بدەیت لە خۆتدا بیانهێنیتەدی، ئەمەش یونسی کوڕی عوبەید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەوەندە خۆی بە کەمتەرخەم دەزانێت کە من و تۆ هەرگیز ناوێرین وا بکەین:

* عن بشر بن الحارث قال: قال يونس بن عبيد – رحمه الله – اني لا اعرف مائة خصلة من البرّ ما فيّ منهما واحدة)[2]

واتە: بیشری کوڕی حارس دەڵێت: یونس ی کوڕی عوبەید (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: تا (١٠٠) بەش لە ڕەوشتە جوانەکان هەیە کە یەك دانەیان لە من نەهاتوونەتەدی.

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٣٣).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٢٠٧).

* عن ابراهيم بن أدهم – رحمه الله – قال: كان عطاء السليمي – رحمه الله – يمس جسده بالليل خوفاً من ذنوبه مخافة ان يكون قد مسخ).[١]

واتە: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێ: (عطاء السليمي) ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە شەوەکاندا دەستی دەهێنا بەسەر لاشەی خۆیدا، لە ترسی ئەوەی نەوەك بە هۆی گوناهبارییەوە بوو بێت بە بەراز.

ئەم عەطایەی کە ئاوا خۆی بە تاوانبار دەزانێت.. لەم بەسەرهاتەی داهاتوودا بۆت دەردەکەوێت کە تا چ ڕادەیەك لە خوا ترساوە و خەمی دوای مردنی بووە:

* قال ابو يزيد الهدادي انصرفت ذات يوم من الجمعة، فاذا عطاء السليمي وعمر بن درهم يمشيان وكان عطاء قد بكى حتى عمش... و كان عمر قد صلى حتى دبر، فقال عمر لعطاء: حتى متى نسهوا ونلعب وملك الموت في طلبنا لا يكف، قال: فصاح عطاء صيحة خرَّ مغشياً عليه فانشج موضحه، فاجتمع الناس وقعد عمر عند رأسه ثم افاق وحمل).[٢]

واتە: (ابو يزيد الهدادى) دەڵێ: جارێکیان لە نوێژی جومعە گەڕامەوە، لە ڕێگا چاوم هەڵتەقی بە عطاء السليمى و عمری کوڕی درهەم دا کە پێکەوە دەڕۆیشتن و عطاء ئەوەندە گریابوو چاوەکانی کز و کوێر بووبوو، و عمریش ئەوەندە نوێژی کردبوو پشتی کۆمابوو، عمر ڕووی کردە (عطاء) و پێی وت: تا کەی من و تۆ لە ناو هەڵەدا بژین و خەریکی گەمە و مەزاقین و بێئاگاین لەوەی (ملك الموت) بە دواماندا دەگەڕێت و وازمان لێ ناهێنێت، دەڵێ: (عطاء) یەك هاواری کرد و لە هۆش خۆی چوو، سەری دای بە زەویدا و سەری شکا و خەڵکی لێیان کۆبوونەوە و عمریش لە پاڵ سەریدا دانیشت تا بە هۆش هاتەوە و بردیانەوە بۆ ماڵ.

خوشك و برایانی بەشداربووی ئەم خولە گرنگە، خولی (صاڵح) بوون ئەم باسە زۆر زیاتر هەڵدەگرێت بەڵام بەسێ هەڵوێست و وتەی خواناسی – بەسرە – مالك ی کوڕی

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٢١).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٢٢٢).

دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم باسە دەپێچینەوە و دەچینە سەر گوڵزارێکی تری کاروانەکە:

* قال بشر بن حارث: قال رجل لمالك بن دينار: يا مرائي! قال له: متى عرفت اسمي؟ ماعرف اسمي غيرك).[١]

واتە: بیشری کوڕی حارس دەڵێت: جارێکیان پیاوێك ڕووی کردە مالکی کوڕی دینارو پێی وت: ئەی ڕیاباز!، مالیکیش سەیرێکی کرد و پێی وت: چۆن ناوی منت زانی؟ کەس ئەو ناوەم نازانێت جگە لە تۆ!.

* عن السري بن يحيى قال: (قال مالك بن دينار: لو وقفت مَلَكٌ بباب المسجد و قال: فليخرج أشر من المسجد، لبادرتكم اليه).[٢]

واتە: سەری کوڕی یەحیا دەڵێت: مالکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (ئەگەر فریشتەیەك لەبەر دەرگای مزگەوتدا بووەستێت و بڵێت: خراپترین کەستان لە مزگەوتی پەروەردگار بڕۆنە دەرەوە، من لە پێش هەمووتان دەڕۆمە دەرەوە.

* عن جعفر بن سليمان قال: سمعت مالك بن دينار – رحمه الله – يقول: اذا ذكر الصالحون فأف لي وتف.[٣]

واتە: لە جەعفەری کوڕی سولەیمانەوە دەڵێ بیستم لە مالکی کوڕی دینارەوە – ڕەحمەتی خوای لێ بێت– دەیوت: هەر کاتێك باسی پیاوچاکان و صالّحان بکرێت ئۆف لە من و تف لە من.

مەولەویش – بە ڕەحمەت بێ – لە وەسف و باسی پێغەمبەری خۆشەویستماندا دەڵێت:

یادی تۆ بکەم، یادی خۆمە پاش نوری تۆ لە کوێ وبینایی خُفّاش

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/١٩٣).

٢ صفة الصفوة (٢/١٨٩).

٣ صفة الصفوة (٣/١٨٤).

# دووەم

## خۆیان لە پلە و پایە و شورەت پاراستووە:

مامۆستایەکمان هەبوو لە بەغداد لە کاتێکدا لە کۆلێژی شەریعە دەمانخوێند، ناوی دوکتۆر خالد الجمیلی بوو، هەردوو چاوی نابینا بوو، زۆر زیرەك بوو تا وای لێهاتبوو پێیان دەووت: (طه حسین)ی عێراق..

لە یادمە هەر جارێك کورسیمان بۆ دەهێنا و داماندەنیشاند لەسەری، پێی ناخۆش بوو، گوێم لێ بوو بە دەم خۆیەوە دەیووت: (استغفر الله) واتە خوایە داوای لێخۆش بوونەکەم لەوەی خەڵکی خزمەتم دەکەن و پاشان بە دەنگی بەرز ئەم ئایەتەی دەخوێند:

* قال تعالی: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾.[1]

واتە: خۆشی و حەوانەوەی بەهەشت و ڕەزامەندی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەدەین بەو کەسانەی کە لە دونیا حەزیان لە بەرزی و پلە و پایە و شورەت و ناوی گەورە نییەو ئەگەر کرایشن بە سەرگەورە و شورەتیان پەیدا کرد فەساد و بەدڕەوشتی بڵاوناکەنەوە و دەی سەرەنجامیش هەر بۆ لە خوا ترسانە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەروەردەی هاوەڵەکانی خۆی بە جۆرێ کردبوو کە خۆیان بدزنەوە لە پلە و پایە و بەرپرسیارێتی و نەیانەوێتو، لەو بارەیەوە ڕوودەکاتە (أبو ذر الغفاري) بە سۆزێکی باوکانەوە پێی دەفەرمووێت:

قال رسول الله (ﷺ): (یا ابا عبدالرحمن لا تسأل الامارة فانها یوم القیامة ندامة).[2]

واتە: ئەی باوکی عبدالرحمان هەرگیز داوای پۆست و بەرپرسیارێتی نەکەیت چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا پەشیمانی لە دوایە..

---

١ سورة القصص: الآیة (٨٣).

٢ رواه مسلم (١٨٢٥).

لە جێگەیەکی تردا بە شێوەیەکی وردتر مەسەلەکە ڕوون دەکاتەوە و زیاتر دووریان دەخاتەوە لە حەزکردن لە پلە و پایە و هەوڵدان بۆی وەك دەفەرمووێت:

واتە: ئەگەر دەتوانیت تەنانەت ئەمیری و سەرگەورەیی دوو کەسیش نەکەیت دەی وا بکە و لە دونیادا هەوڵ بدە وەری نەگریت.

هەر ئەم پەروەردەیەی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە وای کرد لە هاوەڵان بە جۆرێ خۆیان لە بەرپرسی دەدزیەوە و پۆستی بەڕێوەبردنیان پێ خۆش نەبووە.. ئەوە سەعدی کوڕی ابی وەقاصە — خوای لێ ڕازی بێت — و پێی خۆشە لە ناو ماڵ و منداڵ و مەڕ و ماڵاتەکەیدا بژی و کەس نەیناسێت و کەس لەبەری هەڵنەسێتەوە و بەندەیەکی لە خواترسی نهێنی بێت.. و ئیتر هیچ گوێیش نادات بە هاندانی چواردەورەکەی و بۆڵەبۆڵ و گلەیی خزمەکانی لەوەی کە هەوڵی دەست خستنی پلە و پایە نادات، دەی با گوێ بگرین بۆ ئەم وتووێژە ناوازەیەی باوك و کوڕێك..

* كان سعد بن أبي وقاص — رضي الله عنه — في ابل وغنم، فاتاه ابنه عمر وانتهى اليه قال: (يا ابت أرضيت أن تكون اعرابياً في ابلك وغنمك والناس يتنازعون الملك؟، فضرب صدر عمر بيده وقال: أسكت يابنيّ، فاني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (ان الله يحب العبد التقي الخفي).[1]

واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو هاوەڵە دڵسۆز و بەغیرەتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و تاجی سەرکەوتنی جەنگی قادسیە و سەرکردەی سوپای ڕزگارکردنی عێراق — لە ناو حوشتر و مەڕ و ماڵاتەکەیدا بوو، عمری کوڕی هات بۆ لای و پێی وت: باوکە گیان، ئەوە چۆن ڕازی دەبیت وەك عەرەبێکی دەشتەکی خەریکی حوشتر بەخێوکردن و مەڕ و ماڵات بیت و خەڵکیش وا کێشمەکێشمی کورسی و دەستەڵاتیانە؟

هاوەڵی تێگەیشتووی پێغەمبەرمان (ﷺ) — سەعد — پێکەنینی دێ بەم وتانە، و دەستی دەکێشێت بە سنگی عمری کوڕیدا و پێی دەڵێت: کوڕی خۆم.. من لە

---

١ مجلة التربية الاسلامية، ژمارە (٣)ی ساڵی (١٩٨٥).

پێغەمبەری خوام بیستووە فەرموویەتی: خوای – عز وجل – بەندەیەکی لە خواترسی پەنهانی خۆش دەوێت – واتە جگە لە خوا کەس نایناسێت و شورەتی نەبێت.

ئەمەش عوسمانی کوڕی عەفانە – خەلیفەی سێیەمی پێغەمبەری خوا و ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە فریشتەکانی خوا شەرمیان لێ کردووە، ڕازی نابێت و حەز ناکات لە دوای ئەبو بەکری صدیق – خوا لێی ڕازی بێت – ببێتە خەلیفەی موسڵمانان و ئەمە چۆن بووە؟:

* قال ابن الجوزي – رحمه الله – صح عن ابي بكر الصديق انه املى على عثمان وصيته عند موته فلما بلغ الى ذكر الخليفة أغمى عليه، فكتب عثمان – عمر – فلما افاق قال: من كتبت؟ قال عمر، فقال: لو كتبت نفسك لكنت لها أهلاً).[1]

واتە: (ابن الجوزی) دەڵێ: لە ڕیوایەتی صەحیحدا هاتووە کە (ابوبکر الصدیق) لە کاتی سەرەمەرگدا وەسیەتنامەی خۆی بە عوسمان ی کوڕی عەفان نووسیووە، هەر کە گەیشتە باسی خەلیفەی دوای خۆی خەریك بوو ناوی بەرێت لە هۆش خۆی چوو، (عثمان)یش خێرا لە خۆیەوە نووسی (عمر)، و کاتێ ئەبو بەکر بە هۆش هاتەوە وتی: کێت نووسیووە؟ عثمان وتی: عومەری کوڕی خطاب، و ئەبو بەکریش پێی وت: ئەگەر ناوی خۆیشت بنووسیایە شایانی بوویت.

لە ترسی خودا نەیهێشتووە ئەم پیاوە مەزنانە شان شانێتی پلە و پایە و شورەت و کورسی بکەن و بۆ خۆیانی دەست بخەن و ئەمەش (عبدالله ی کوڕی عمری کوڕی خطاب) خوایان لێ ڕازی بێت – و لە ناو کەعبەدا و لە سوژدەدا ئەم ڕاستیە دەخاتەڕوو:

* ان نافع قال: دخل ابن عمر – رضي الله عنهما – الكعبة فسمعته وهو ساجد يقول: (قد تعلم مايمنعني من مزاحمة قريش على هذه الدنيا الاّ خوفك).[2]

واتە: نافع دەڵێت: عبدالله ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە ناو کەعبەی پیرۆزدا بوو گوێم لێی بوو لە کاتی سوژدەدا دەیووت: ئەی پەروەردگارم تۆ چاك

---

١ صفة الصفوة (١/١٦٠).

٢ صفة الصفوة (١/١٨٩).

دەزانی من لەبەر خاتری ترسی تۆیە و لە تۆ دەترسم ئەگینا هیچ شتێك ڕێم لێ ناگرێت لەوەی شانەخڕە لەگەڵ قوڕەیشدا بکەم بۆ دەستکەوتنی دنیا و پلە و پایە.

مەرج نییە صاڵحان لە هەموو کاتێکدا پلـە و پایـە و پۆسـت وەرنـەگرن، چـونکە لـە هەندێ کاتدا دەبێت وەری بگرن وەگەرنا گوناهبار دەبن چونکە کەسێکی ناشایستە لە باتی ئەوان وەری دەگرێت فەسادی و خراپەکاری لە وڵاتدا بەرپا دەکات.

بەڵام ئەگەر کەسانی شیاو و لێوەشاوە و خواناس زۆربوون، لەو حاڵەتـەدا صـاڵحان خۆیان لە بەرپرسیارێتی شاردووەتەوە، و لە کاتێکیشدا وەریـان گرتبێـت ئـەو پۆسـتە نـەیگۆڕیون و لـە خۆیـان بـایی نـەبوون بـا وتووێـژی نێـوان شیردۆشـەکان و خەلیفـەی یەکەمی ئیسلام ببیستین:

* كان ابوبكر الصديق قبل الخلافة يحلب للحي أغنامهم، فلما بويعَ له بالخلافة، قالت جارية من الحي: الان لا يحلب لنا منائح دارنا، فسمعها أبـوبكر فقـال: (لعمـري لاحلبنهـا لكم، واني لارجوا ان لا يغيرني ما دخلت فيه من خلق كنت عليه فكان يحلب لهنَّ).[١]

واتە: ئەبو بەکری (صدیق) ڕەزای خوای لێ بێت پێش ئـەوەی بیکـەن بـە خەلیفـەی موسـڵمانان هاوکـاری ژنـانی دەکـرد و مـەڕ و بزنـی لەگەڵـدا دەدۆشـین، و کـاتێ بـووە خەلیفە یەکێ لەو خانمانەی گەڕەك هاواری لێ هەستا و وتی: ئیتر مەڕەکانی گەڕەکمان لەگەڵ نادۆشێت و لە دەستمان دەرچوو، کاتێ ئەبو بەکر ئەو قسەیەی بیستەوە وتـی: بەتەمەنم بەردەوام بۆتان دەدۆشم و هیوادارم ئەو کارەی دراوەتە دەسـتم لـە ڕەوشـتە جوانەکانی پێشترم نەکات و لە پاش خیلافەتیش هەر مەڕەکانی بۆ دەدۆشین.

برای موسڵمانم – لەو ڕێگەیەدا زۆر سادە دەبیت و لە کـاتی بەرپرسـیارێتیدا سـوود لە وەرزشی صاڵحبوونەکەت دەبینیت و فیزڵی و خۆبەزلزانین نایەت بەلاتـدا و حـەز لـە لەقەب و نازناوی گەورە گەورە ناکەیت و خۆت زۆر بە خاکی و سـادە دەزانیـت – ئـای کە خەڵکی لەو کاتـەدا خۆشـیان دەوێیـت، سـەیری ئـەمیری بـاوەڕداران بکـە – عمـری کوڕی عبدالعزیز – بزانە هەڵوێستی چی بوو بەرامبەر ئەو پیاوەی کە هاتە لای بە ناوی خۆیەوە بانگی کرد:

---

١ ابوبكر الصديق – للصلابي – لا (١٣٧).

* قدم عمر بن عبدالعزيز – رحمه الله – زياد مولى ابن عياش واصحاب له، فاذن عمر له دونهم، فدخل عليه فنسي ان يسلم عليه بالخلافة، ثم ذكر فقال: السلام عليك يا امير المؤمنين، فقال له عمر: والاولى لم تضرني ثم نزل عمر عن موضع كان عليه الى الارض وقال: اني اعظم ان اكون في موضع أعلو فيه على زياد).[١]

واتە: زیاد مەولای (ابن عیاش) لەگەڵ هاوڕێکانیدا هاتن بۆ سەردانی عمری کوڕی عبدالعزیز و عمریش ڕێگایدا بە تەنها بێتە ژوورەوە و کاتێ هاتە ژوورەوە لە بیری چوو سڵاوی خیلافەتی لێ بکات و پاشان بیری کەوتەوە خێرا وتی: (السلام علیك یا امیر المؤمنین) و عمریش فەرمووی: یەکەم سڵاوت هیچ عەیبێکی نەبوو، هیچ زیانێکی نەبوو پاشان لەسەر کورسی خیلافەت دابەزیە سەر زەویەکە و وتی: من زۆر لەوە گەورەترم کە لە شوێنێکدا دابنیشم بەرزتر بێت لە ئاستی زیاد.

ئەم عمرە گەورە و مەزنە لە نەوەی عمری کوڕی خطابە و نێوانی لەگەڵ خەلیفە سولەیماندا زۆر خۆش بووە و سلیمان زۆری خۆش ویستووە، بۆیە زۆر ترسا لەوەی خەلیفە سلیمان لە سەرەمەرگدا وەسیەت بکات بە دانانی عمر بە خەلیفەی دوای خۆی!

بۆیە لەرزی لێهات و بە خێرا خۆی گەیاندە ڕەجا و ئەم وتووێژە کەوتە نێوانیان:

* قال رجاء: فلما تفرقوا جاءني عمر بن عبدالعزيز فقال: يا ابا مقدام، ان سليمان كانت لي به حرمة ومودة، وكان بي براً وملطفاً، فانا اخشى ان يكون قد أسند اليَّ من هذا الامر شيئاً، فأنشدك الله وحرمتي ومودتي الا اعلمتني ان كان ذلك حتى استعفيه الآن قبل ان ياتي حال لا اقدر فيها على ما أقدر الساعة، فقال رجاء: لا والله لا أخبرك حرفاً واحداً، قال: فذهب عمر غضبان).[٢]

واتە: ڕەجای کوڕی حەیوە – کە وەزیری زۆرێ لە خەلیفە ئومەویەکان بووەو پیاوێکی صالح و بۆ خوا ژیاو بووە – دەڵێ: دوای ئەوەی هەموو ئومەویەکانم کۆکردەوە و پێش مردنی سلیمان بەیعەتم لێ وەرگرتن بۆ ئەو کەسەی ناوی لە

---

١ عمر بن عبدالعزيز، للدكتور علي الصلابي، لا (١٥١).

٢ هەمان سەرچاوە، لا (٣٤).

وەسیەتنامەکەی سولەیماندا هاتووە و بڵاوەیان لێکرد، و یەکسەر عمری کوڕی عبدالعزیز وەك ئەوەی بڵێی دڵی خەبەری دابێت کە ناوی ئەو بێت — بۆیە بە پەلە هات بۆ لام و وتی: ئەی ئەبا میقدام، پەیوەندیەکی دۆستانە هەبووە لە نێوان من و سولەیماندا و زۆر چاك و بە بەزەیی بووە لەگەڵ مندا و زۆر دەترسم ناوی منی نووسیبێت و خیلافەتی دابێت بە سەرمدا، دەی تو ئەو خوایە و لەبەر خاتری ئەو سۆزو خۆشەویستییەی نێوانمان ئەو نهێنییەم پێ بڵێ تا کار لە کار نەترازاوە برۆم بڵێم داوای لێبوردن دەکەم و بیدە بە یەکێکی تر تا زووە و کۆچی دوایی نەکردووە و دوایی پەلەقاژە کردنم هیچ سوودی نابێت، ڕەجا دەڵێ: وتم: وەڵاهی یەك پیتت پێ ناڵێم... عمر زۆر بە تووڕەییەوە ناو چاوی دا بە یەکدا و جێی هێشتم..

(سبحان الله) تەنها موسڵمانە تێگەیشتووەکان، صالّحان، بۆ خوا صولّحاون ئەم هەڵوێستە مەردانەیان لێ دێت، ئەگینا زۆر کەس هەیە لە دیندا شارەزایە و علومی شەرعی خوێندووە بەڵام نەچووەتە ناو کاروانی صالّحانەوە بۆیە ئەگەر پۆستەکەشی لێ بسەنیتەوە — لە داخاندا — دەست لە کار دەکێشێتەوە ! !

بەڵکو لەم ڕۆژەدا هەوڵی کڕینی دەنگەکانیش دەدات و تەحالوفاتیش دەکات بۆ ئەوەی دەربچێت ! ! ! !

(ثابت)ی کوڕی (أقرم) (ڕەزای خوای لێ بێت) چاك تێگەیشتبوو لە ئیسلام بۆیە خۆی دەشاردەوە لە وەرگرتنی سەرکردەیی و لە جەنگی (مؤتة)دا و لە ناو گەرمەی تەقەتەقی شمشێردا — ئەم وانە مەزنەمان فێردەکات و ئاڵاکە دەداتە دەستی خالیدی کوڕی وەلید:

* عن ابراهيم بن يحيى بن زيد بن ثابت قال: لما كان يوم مؤتة وقتل الامراء أخذ اللواء (ثابت بن أقرم) وجعل يصيح يا للانصار! فنظر الى خالد بن الوليد فقال: خذ اللواء يا أبا سليمان، فقال خالد: لا آخذه انت احق به لك سن وقد شهدت بدراً، قال ثابت: خذ ايّها الرجل فوالله ما اخذته الاّ لك ثم قال للناس: هل اصطلحتم على خالد؟ قالوا: نعم).[1]

---

١ صفة الصفوة (١/٣٢٠).

واتە: ئیبراهیمی کوڕی یەحیای کوڕی زەیدی کوڕی ثابت دەڵێت: لە جەنگی مۆتەدا هەموو سەرکردەکانی سوپای موسڵمانان یەك لە دوای یەك شەهید بوون، تا — ثابت ی کوڕی ئەقرەم (ڕەزای خوای لێ بێت) ئاڵاکەی بەرزکردەوە و بە هەموو دەنگی هاواری کرد و وتی: ئەی باوکی سلیمان ها ئاڵاکە بگرە دەست، و خالیدیش وەری نەگرت و وتی: تۆ شایانی سەرکردەییت لەبەر تەمەنەکەت و لەبەر بەشداری کردنت لە جەنگی بەدردا.

ثابت لە وەڵامدا پێی وت: بیگرە سوێند بە خوا بۆ ئەوە هەڵم گرت بیدەم بە تۆ، و پاشان بە سەربازەکانی وت: بە سەرکردەیی خالد ڕازین؟ وتیان: بەڵێ.

کاروانی پڕ لە نووری صالْحان — شوهرەتی تیانییە — و ئەگەر دەتەوێت لە کاروانەکەدا وەربگیرێیت ئەبێ پێت ناخۆش بێت ناوبانگ دەربکەیت چونکە سەردەکێشێ بۆ غرور و لە خۆبایی بوون و ڕیابازی شوێنی دڵسۆزی و ئیخلاص دەگرێتەوە — پەنامان بە خوا — بۆیە سەیری خالیدی کوڕی مەعدان بکە و بزانە لەم بارەیەوە چ وانەیەکمان پێ دەڵێتەوە:

* عن صفوان بن عمرو قال: كان خالد بن معدان — رحمه الله — إذا عظمت حلقته قام فانصرف، قلت لصفوان: ولم كان يقوم؟ قال: كان يكره الشهرة).[1]

واتە: صەفوان ی کوڕی عەمر دەڵێت: خالیدی کوڕی مەعدان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەر کاتێ هەستی بکردایە بەوەی هەڵقەی دەرسە گشتیەکەی گەورە بووە، وازی دەهێنا لێی — واتە دەیدایە دەستی زانایەکی تر — و خۆی لە جێیەکی تر وانەی دەوتەوە — ڕاوی دەڵێ: لە سەفوانم پرسی: بۆچی وای دەکرد؟ وتی: شورەت و ناوبانگ دەرکردنی پێ ناخۆش بووە.

برای خۆشەویستم، خوشکی بەڕێزم.. تۆ هاتوویتە نێو ئەم کاروانە پڕ لە نورەی صالْحان، کەواتە پلە و پایە و شورەت و ناودەرکردن و پۆستی بەرز — چەند زاراوەیەك بن قێزت لێیان بێتەوە و هەرکەسێ لە هاوڕێکانت، خزمەکانت — بوون بە شتێکی گەورە تۆ خەفەتی بۆ بخۆ بڵێ داماوە بەرپرسیارێتیەکەی گەورەتر بووە، خوا ڕەحمی

[1] صفة الصفوة (٢/١٤٧).

پێ بکات و ئەو پۆستە نەیگۆڕێت.. و منیش سوپاس بۆ خوا — بەرپرسیارێتیم نییەو بەسمە ئەم ژیانە سادەیەی خۆم!

ئەگەر وا بکەیت ئەوە دڵنیا بە لە تاقیکردنەوەیەکی صاڵحاندا دەرچوویت و خۆت ئامادە بکە بۆ تاقیکردنەوەی قۆناغێکی تر، و ئەم وانەیەش زانای خواناس و صاڵح — سویدی کوڕی غەفلە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە وتەیەکی بچووك و چەند پیتێکی کەم — بۆمان ڕوون دەکاتەوە:

* عن عمران بن مسلم قال: كان سويد بن غفلة — رحمه الله — اذا قيل له أُعطي فلان، ولي فلان! قال: (حسبي كسرتي وملحي).[1]

واتە: عمرانی کوڕی موسلیم دەڵێ: مامۆستا سویدی کوڕی غەفلە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەر کاتێك لە پاڵیدا باسی ئەوەیان بکردایە کە فلان کەس ئەوەندەی وەرگرت! و فلان کەس بوو بە فلان شت! و فلان کەس فلان پۆستی پێ درا! (ئەم یەك زەرە هەناسەی هەڵنەدەکێشت و خەفەتی نەدەخوارد بەوەی کە بەم هیچ نەدراوەو نەشکراوە بە هیچ — بەڵکو لەسەر خۆ و هێمنانە دەیفەرموو: بەسمە من تەنها نانە ڕەق و خوێم هەبێت..

ئەمە بەهرەکەیە — حەز بە شورەت نەکردن — تەنها لە بازاڕی باوەڕداراندا دەست دەکەوێت، بە درێژایی مێژوویش موسڵمانان زۆر سوودیان لێ وەرگرتووە و زۆری لە ناکۆکیەکانیان پێ چارەسەر کردووە و ئەوە خەلیفەی پێنجەمی پێغەمبەرەکەمانە (ﷺ) کە چۆن لە گەورەترین پۆست دابەزی و وازی لێ هێنا بۆ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان.. ئەم ڕەوشتەیش زۆر مەزنە لە (حەسەنی کوڕی عەلیدا) بوو بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) وەسفێکی گەورەی دەکات:

* قال رسول الله (ﷺ) ان ابني هذا سيد، ولعل الله أن يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/١٣).

٢ رواه البخاري ژ: (٧١٠٩).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرمووێت بـە حەسـەن: ئـەم کـوڕەم سـەرکردە دەردەچێت و لەوانەیە ببێتە هۆی ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی مەزنی ناو موسڵمانان.

لاوازبوونی ئەم بەهرە گەورە پڕ لە خێرە لە خواناسان و خەمخۆرانی ئەم ئیسلامەدا لەم سـەردەمەی ئەمڕۆمانـدا و بـە چـاوی خۆمـان دیمـان سـوود وەرنـەگرتن لـەم کـارە جوانەی صاڵحان وای لێکردوون پەرتـەوازەی کـردن و هـەر کەسـە و هـەوڵی مانـەوەی خۆی دەدا لە پۆستە باڵاکەیدا.

داواکردنی شورەت و پلـە و پایـە هەڵدێرێکی سەختە و بـەران و گاکێویـەکان شـاخ شاخێنی لەگەڵ دەکەن، و کەم کەس هەیە شایستەی پلـە و پایەیـەك نـەبێت و بدرێتـە دەستی و سەرکەوتوو بووبێت لە بەرنامەی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا – ئەگەر ئەم بەهرەیەیان لە ئیسلامەوە وەرنەگرتبێت – گەورەترین پۆست و ترسناکترین پۆست بـە ئاسانی دەدەن بە کەسێك کە بچووکترین مەرجی ئەو پۆسـتەی تێدا نییـە جگـە لـەوە نەبێت کە لایەنگر و ئەنـدامی خێـری حاکمـە! و هـەر ئـەوەش وا دەکـات کـە کەسـانی شایستە لە ماڵەکانی خۆیاندا دانیـشێنراون و هیـچیان بـە دەسـت نییـە و لـە ئـەنجامی ئەوەیشە هەموو جۆرە گەندەڵیەکی ئیداری و ماڵی و سیاسی و هتد هاتۆتە کایەوە..

بـا گـوێ بگـرین بـۆ شـوعەیبی کـوڕی حـەرب – خـوای لێ ڕازی بێـت – بـزانین لـەم بارەیەوە چیمان پێ دەڵێت:

* عن عبدالله بن ايوب المخزومـي قـال: قـال شـعيب بـن حـرب: (مـن طلـب الرياسـة ناطحته الكباش، و من رضي ان يكون ذنباً ابا الله الاّ ان يجعله رأساً).[1]

واتە: هەر کەسێك هەوڵی دەستکەوتنی پلە و پایە و شورەت بدات ئـەوە بەرانـەکان شاخ شاخێنی لەگەڵدا دەکەن – جا ئایا بەرامبـەریان دەتوانێـت بوەسـتێت؟ – و هـەر کەسێك ڕازی بێت بـەوە لـە دواوەی قافڵـەوە بێـت و لای کلکەکەیـدا بێـت ئـەوە خـوای گەورە دەیباتە لای سەرەکەی و دەیکاتە سەرقافڵە.

فـەرموون بـرا و خوشـکی نـاو کاروانەکـە.. وانەیـەکی نـوێ لـە (عەلقەمـەی کـوڕی قەیس)ەوە وەربگرە کە خاوەنی کێوێك زانست و زانیاری بوو لە قورئان و فـەرموودەدا

---

[1] صفة الصفوة (٢/١٥٨).

بەڵام چووبووە ماڵەکەی خۆی و دەستی لە کاری وانە وتنەوە هەڵگرتبوو — لەم بارەیەوە قسەیان لەگەڵ کردبوو پێیان وتبوو: ئایا ئەگەر لە مزگەوت هەڵقەت دروست بکردایە و قورئان و فەرموودەت فێری خەڵکی بکردایە باشتر نەبوو؟

لە وەڵامدا وتی: پێم خۆش نییە، خەڵکی دوام بکەون و مامۆستا مامۆستا و گەورەم گەورەم ناوم ببەن و بڵێن: ئا ئەمە عەلقەمەیە! بەڵام ئەم عەلقەمەیە مەزنە لە ماڵەکەی خۆیدا ئاڵفی دەدایە مەڕ و ماڵاتەکەیان و هاوکاری ئافرەتانی ماڵەکەی دەکرد لە ئیش و کارەکانیاندا.

بێگومان وەکو پێشتر وتمان ئەمە لە کاتێکدا دروستە کە زانایانی قورئان و فەرموودە زۆر بن بەڵام ئەگەر هەر خۆی بێت لەو بوارەدا دروست نییە لە ترسی ناو دەرکردن خۆی لەو کارە گەورەیە دووربخاتەوە.

ئیسلام کە هاتووە... جۆرە پەروەردەیەکی ناوازەی فێری شوێنکەوتووانی کردووە کە لە هیچ دین و حیزب و گەلێکدا بەدی ناکرێت — ئەویش خۆشنەویستنی شورەتەو حەزنەکردنی دەرکەوتن!

بەڵکو مەلایین دۆلار خەرج دەکەن تا ناو دەربکەن، و لەوانەشە باوەڕ نەکەن کە خواناسان و صاڵحانی ئومەتی ئیسلام خۆیان لە پلە و پایە و شورەت دەدزیەوە چونکە لای ئەوان ئەوە چڵەپۆپەی گێلێتیە.. بەڵام با سەرێك بدەین لە ئیمامی شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بزانین لەم بارەیەوە چی دەڵێت کە خاوەنی دەریایەك زانستی ئیسلامییە بە تایبەت لە بواری فیقهیدا؟.

* عن ربیع بن سلیمان یقول: سمعت الشافعي یقول: وددت أن الخلق یتعلمون مني ولاینسب اليَّ منه شئ).[1]

واتە: ڕەبیعی کوڕی سولەیمان دەڵێت: لە پێشەوا شاعفیم بیست دەیووت: ئاواتەخواز بووم هەموو خەڵکی لە منەوە زانستیان وەربگرتایە و کەسیش ئەو زانست و زانیاریانەی نەدایەتە پاڵی منوباسی منی بە هیچ جۆرێك نەکردایە.

---

١ صفة الصفوة (١٦٧/١).

ئەمڕۆ جگە لە من و تۆ خۆشەویستەکەم لەگەڵ ئەوانەی ڕێڕەوی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و هاوەڵان و صالْحین دەگرنەبەر — کەسێ نەماوە کە حەز نەکات لە حکومەتەوە خۆی نزیك بێتەوە و کاربەدەستان بیناسن و مام حەمەیی بۆ بەرپرسان بکات تا بەڵکو کوڕەکەی دامەزرێنن یان کچەکەی نقلْ بکەنەوە بۆ شارەکەی خۆی یان پارچەیەك ئەرزەی بە ناڕەوا بۆ ببڕن و هەندێ کات ئامادەشە لەو پێناوەدا هەندێ کاری ناشایستەیان بۆ بکات!

بەلاّم ئەندامانی ناو کاروانی صالْحان هەر حەزیش ناکەن بەرپرسەکان ناویان بزانن! چجای بڕۆن بۆ لایان و داوای شتیان لێ بکەن سەیری خواناسەکەی یەمەن بکە — ئوەیسی قەرەنی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بارەیەوە چۆن وەلاّمی ئەمیری باوەڕداران عمری کوڕی خطاب دەداتەوە (رضي الله عنه):—

* عن أسير بن جابر قال: قال عمر بن الخطاب — رضي الله عنه — لأويس القرني — رحمه الله — أين تريد؟ قال: الكوفة: فقال: (الا اكتب لك الى عاملها فستوصى بك؟ قال: لان اكون في غبر الناس احب اليّ).[1]

واتە: ئەسیری کوڕی جابر دەڵێت: عمری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) بە ئوەیسی قەرەنی وت: بە نیازی بۆ کوێ بڕۆیت؟ وتی: بۆ کوفە دەڕۆم، پێی وت: شتێك بنووسم بۆت کە بیدەیت بە والی کوفە تا چاك بێت لەگەڵتدا و حسابی تایبەتیت بۆ بکات؟ ئەویش وتی: نا نا من ئەوەم پێ خۆشترە کە لە ڕیزی ئەو کەسانەدا بم کە لە بیری کەسدا نین و کەس نایانناسێت.

ئەمەش قوتابیەکی صالْحی مامۆستا حەسەنی بەسرییە — کە ناوی (أيوب السختياني)یە و یەکێکە لە زانا خواناسەکان و لە ماوەی ژیانیدا چل جار حەجی کردووە، یەکێك بوو لە هاوڕێ خۆشەویستەکانی یزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك لە کاتی لاویدا و دوای ئەوەی کە یزید بوو بە خەلیفەی موسڵمانان ئیتر شێخ ئەیوب لێی دوورکەوتەوە و هاوڕێیەتی نەکرد!

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٣).

لە زەمەنی جەهالەتی ئەمڕۆماندا خەڵکانی نەفس نزم خواخوایانە خزمایەتییەکی دوور، یان کۆنە هاوڕێیەتیەك یان لە پاسێکدا کاتی خۆی پێکەوە دانیشتبن.. تا دوایی خۆی پێ بەرێتە پێشەوە و هەندێ کاری ناڕەوا و فەسادی ئیداری و تێپەڕاندنی ئاستەکانیان پێ بکەن.. بزانین ایوب چی دەڵێ و بە چەند وشەیەکی کەم و لە ڕێگەی نزایکەوە ئەو موحازەرەیەمان پێشکەش دەکات:

* کان ایوب السختیاني صدیقاً لیزید بن الولید بن عبدالملك، فلما تولی یزید الخلافة قال أیوب: (اللهم إنسه ذکري).[١]

واتە: ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هاوڕێی یەزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك بوو، کاتێ یەزیدی هاوڕێی بوو بە خەلیفە، ڕووی کردە پەروەردگار و فەرمووی: ئەی پەروەردگارم ناوی منی لەبیربەرەوە.

ئەی خوشك و برای صالحم، خوا منیش و ئێوەش صالح بکات – گرنگ نەبێت لە لات لە دائیرەکەتدا بەڕێوەبەرنیت یان سەرۆکی بەش نیت یان لە قوتابخانەکەتدا بەڕێوەبەر یان جێگر نیت و لە پەرلەماندا ئەندام نیت و لە ئەنجوومەنی پارێزگایشدا ئەندام نیت! بەڵکو لەوانەشە تۆ شایانی هەموو ئەو جێگایانە بیت و لەوانەیە لە زۆربەی ئەوانەش باشتر بیت کە لەبەر چەند هۆکارێکی دنیایی دوور لە شایستەیی خرابنە ئەو جێگایانە – بەڵام پیرۆزیان بێت تا ڕۆژی خۆی و لە قیامەتدا هەزاران پرسیار و لێپرسینەوە ڕوو لەوان دەکات یەك دانەیان لە تۆ ناکرێت..

بۆیە گرنگ ئەوەیە خوامان لێ ڕازی بێت و لە گوناهەکانمان خۆش بێت ئەگینا دنیا هەرچۆنێ بێ کۆتایی دێ و قیامەت دێتە پێشەوە و لەم بارەیەوە (ابن عباس) (ڕەزای خوای لێ بێت) هاوەڵی گەنجی پێغەمبەرمان (ﷺ) وانەیەکی گرنگی پێیە بۆمان و با لە دەستی خۆمانی نەدەین و گوێی بۆ بگرین:

* عن ابي وائل قال: قال عبدالله بن عباس (رضي الله عنه): وددت ان الله غفر لي ذنباً من ذنوبي وانه لایعرف نسبي).[٢]

---

١ عمر بن عبدالعزیز، الصّلابي، لا (٢٠٤).

٢ صفة الصفوة (٢/٢١٣).

واتە: ئەبو وائل دەڵێ: (عبداللە)ی کوڕی عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئاواتەخواز بووم خوای گەورە لە گوناهێك لە گوناهەکانم خۆش بێت، ئیتر با کەس نەمناسێت و نەشزانن کوڕی کێم و لە چ بنەماڵەیەکم.

پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) نەخشەی صالح بوونی لە ڕێگای فەرموودەکانیەوە بۆ کێشاوین و صالّحانی مێژووی ئیسلام ئەو فەرموودانە کاریان کردە سەر دڵ و هەست و هەناویان و لە کۆمەڵێ گەنجی سەرگەردان و هەڵەشە و کۆمەڵێ دز و ڕێگر و جەردە هاتنە ناو ئەم کاروانەوە و توانیان مێژووی چەپەڵی پێشوویان سپی بکەنەوە و پاشتریش ببنە مامۆستا و پێشەوای ئێمە لە صالّحیەتدا.

ئەم فەرموودەی ئەبو هورەیرە بخوێنەرەوە و جوان لەبەری بکە ئیتر تامی موسڵمانەتی ڕاستەقینە دەچەژیت و بەبێ ئەوەی کەس حسابت بۆ بکات لە لای خوا حسابی گەورەت بۆ کراوە:

* عن ابي هريرة – رضي الله عنه – قال: قال رسول الله (ﷺ) ان الله – عز وجل – يحب من خلقه الاصفياء الاخفياء الابرياء الشعثة رؤسهم المغبر وجوههم، المخمصة بطونهم، الذين اذا استاذنوا على الامراء لا يؤذن لهم، واذا خطبوا المتنعمات لن ينكحوا، وان غابوا لم يفتقدوا، وان طلعوا لن يفرح بطلعتهم، وان مرضوا لم يعادوا، وان ماتوا لم يشهدوا).[1]

واتە: هاوەڵی پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرمووی: خوای (عز وجل) لە ناو هەموو دروستکراوەکانیدا بەندە خاوێنە نەناسراوە بەریئەکانی خۆش دەوێت، کە سیفەتەکانیان ئەمانەن قژی سەریان تێك ئالاوە و دەم و چاویان ڕەش هەڵگەڕاوە و سکیان چووە بە ناوا، و هەر کاتێك بیانەوێت بچنە لای بەرپرسەکان ناهێڵن و هەر کاتێ داوای کچی دەوڵەمەندەکان بکەن پێیان نادەن، و ئەگەر دیار نەمێنن کەس هەواڵیان ناپرسێت، و هەر کاتێ دەرکەوتن کەس خۆشحاڵ نییە بە هاتنیان، و هەر کاتێ نەخۆش بکەون کەس سەردانیان ناکات و هەر کاتێ بمرن کەس لەگەڵیان ناڕوات بۆ سەر قەبران.

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٢٣).

چێژ و خۆشیەكی تایبەتی هەیە برایان كە تۆ بڕوانامەت هەبێت بەڵام خەڵكی پێت نەزانن، نووسەرێكی مەزنیت بەڵام كەس ناتناسێت، عاقڵ و سیاسەتمەدارێكی گەورەیت بەڵام لە بێئاگایان وایە تۆ (قل و فل) لە یەكناكەیت..

قەیناكە با هەروا تێبگەن.. با وەك مرۆڤێكی دەروونپاكی سادە وردەوردە لەسەرخۆ بۆ نوێژەكان بەرەو مزگەوت بڕۆ.. و با لە بازاڕەكانیشدا بۆ شت كڕین سەرەبگرە و مەهێڵە بتناسنەوە و پێش هەموو خەڵكەكە شتەكە بە تۆ بدەن و توشی تاوانت بكەن و مافی ئەوانەی پێش خۆت بخۆیت!

من ماوەی (٦) مانگێك لە تاران ژیاوم و وەك نیمچە خوێندەوارێك خۆم خستبووە بەرچاو.. ئەمەندە بەچێژ بوو لە لام، كەس لەبەرم هەڵنەدەسا.. دەیانناردم بۆ سەمونخانە، و گسكی ژوورەكەشم دەدا و چێشتیشم لێ دەنا... لە كاتێكدا كە كەرەج بەجێ بهێڵم و بڕۆم بۆ میدان وەلی عەسر.. پیاوەكەی هاوڕێم كە خەڵكی ناوچەی سنە بوو پێی وتم: هەر لە سەرەتاوە دەمزانی تۆ كەسێكی نەخوێندەوار و شوان نیت و لە شەرعیشدا زۆر بە ئاگای بەڵام بە داخەوە درەنگ زانیم..

وتم: نا درەنگ نەتزانی.. زۆر باشە.. خوا كەسێكی خۆش دەوێت خۆی لە هاوڕێكانی خۆی بەرزتر نەگرێت و خۆی جیانەكاتەوە..

وەرن با بچینە خزمەت زانا و خواناسی ئیسلام عبدالله ی كوڕی موبارەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و وا لە شاری بەسرە تینویان بوو بەرەو بیرە ئاوێك ڕۆیشتن و زۆر قەرەباڵغ بوو خەڵكەكە مەجالیان نەدەدا بەو زاتە گەورەیە تا بڕواتە پێشەوە ئاو بخواتەوە و بە پاڵ دەیانكردەوە دوای دواوە! ئەمە چۆن بوو، حەسەنی بەسری بۆمان دەگێڕێتەوە:

* قال الحسن: كنت مع عبدالله بن مبارك – رحمه الله – يوماً، فأتينا على السقايا والناس يشهدون منها، فدنا منها يشرب ولم يعرفه الناس فزحموه و دفعوه فلما خرج قال لي:

(ما العيش الاّ هكذا، حيث لم نعرف ولم نوقر).[1]

---

١ صفة الصفوة (٨٩/٤).

واتە: حەسەن دەڵێت: ڕۆژێك لەگەڵ عبداللە ی کوڕی موبارەکدا بووم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە شاری بەسرەدا دەگەڕاین تا عبداللە لەبەر توێنێتی بەرەو شوێنی ئاو خواردنەوە ڕۆیشت کە لەوێ خەڵکێکی زۆر ئاویان دەخواردەوە و قەرەباڵغ بوو، دەیویست بڕواتە پێشەوە بە پاڵ دەیانبردەوە بۆ دواوە چونکە نەیاندەناسی پاڵیان پێوە دەنا و نەیاندەهێشت بە ئاسانی ئاوەکەی بخواتەوە و ئەویش ڕووی کردە حەسەن وتی: ژیان ئا بەم جۆرە خۆشە کە نەناسرێین و لەبەرمان هەڵنەسن.

هەروەها حەسەن دەڵێت:

* بيناً هو بالكوفة يقرأ عليه كتاب المناسك وانتهى الى حديث وفيه قال عبدالله وبه نأخذ، فقال: من كتب هذا من قولي؟ قلت الكتاب الذي كتبه فلم يزل يحكه بيده حتى درس ثم قال: ومن انا يكتب قولي؟!.[1]

واتە: لە کاتێکدا لە شاری کوفە بوو کتێبی ئەرکەکانی حەج لە لایدا دەخوێنرایەوە و ئەو گوێی لێ دەگرت تا گەیشتنە فەرموودەیەك و تیایدا دەیوت: ئەمەش بۆچوونی عبداللە ی کوڕی موبارەکە و ئێمەش پێمان باشە!

عبداللە وتی: کێ ئەمەی بە ناوی منەوە نوسیووە؟ وتم: نووسەری کتێبەکە و ئەوەندە نووسیویەتی! دەڵێ ئەوەندە نوسینەکەی کڕاند بە دەست تا کوژاندیەوە هەر دەیوت: ئاخر من کێم؟ تا وتەکانم بنوسرێتەوە؟!

گەورەترین مژدە بۆ هەموو ئەو برا و خوشکانەی کە کاروانی صاڵحان دەگرنە بەر و نایانەوێت ناویان دەربکەوێت و حەزیان لە پۆست و لەقەبی زل نییە، سوفیانی کوڕی عویەینە– ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەیان شتێکی گەورە و سەیر دەڵێت:

* ان اسحاق بن منيب قال: قال سفيان بن عيينة – رحمه الله – قال: لم يعرفوا حتى احبوا ان لا يعرفوا).[2]

واتە: ئیسحاقی کوڕی مونیب دەڵێ: سوفیانی کوڕی عویەینە – ڕحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێ: ئەو زانا گەورە و مەزنانەی کە لە ئیسلامدا ناسراون، نەناسراون هەتا ئەو کاتەی کە پێیان ناخۆش بووە بناسرێن.

---

١ صفة الصفوة (٤/٩٠).

٢ هەمان سەرچاوە (١/١٥٥).

زۆر کەس هەن خۆیان هیچ بوونێکیان نییە، و هیچ ڕۆڵێکی گەورەیان نییە لە بواری بانگەواز و خزمەت بە ئیسلام و بیروباوەڕە بێگەردەکەی، بەڵام خەڵکی گەورەیان دەکەن و خەبەریان بەملا و بەولادا بڵاو دەکەنەوە و خۆیشی پێی ناخۆش نییە!

بەڵام ئەوەش دوورکەوتنەوەیە لە فیقهی ڕاست و دروستی ئیسلام و لادان لە نەخشە و ڕێبازی صاڵحانە - کە بە سەلەفی صاڵح بە ناوبانگن - ئەگینا با گوێ بگرین بۆ کوڕەزاکەی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) بزانە لە سەرەمەرگدا چی بە کوڕەکەی دەڵێت و چ وەسیەتنامەیەکی بۆ دەکات کە بە ڕاستی وەسیەتنامەیە بۆ هەموو لایەکمان:

* عن رجاء ابن ابي سلمة قال: مات قاسم بن محمد بن ابو بكر الصديق - رضي الله عنه - بين مكة والمدينة حاجاً او معتمرا فقال لابنه: سن عليّ التراب سناً، وسوى على قبري والحق باهلك واياك ان تقول كان وكان رحمه الله).[١]

واتە: ڕەجای کوڕی ئەبی سەلەمە دەڵێ: قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو بەکری (الصدیق) - خوای لێ ڕازی بێت - لە نێوان مەکە و مەدینەدا بوو بە مەبەستی حەج یان عەمرە نەخۆش کەوت و حاڵی گەیشتە حاڵی مردن، لە سەرەمەرگدا کوڕەکەی بانگ کرد و پێی وت: کاتێك مردم بمنێژە و خۆڵ بکە بە سەرمدا و جوان داپۆشەو پاشان قەبرەکەم تەخت بکە و ئاسەواری مەهێڵە و خۆیشت بەجێم بهێڵە و بچۆرەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆت.

نەکەی ها لە پاشان لە ناو خەڵکدا بڵێیت: باوکم بە ڕەحمەت بێ ئاوا و ئاوا بوو!

ئەگەر کەسێك زانی تۆ کەوتوویتەتە سەر سکەی صاڵحان و ڕەوشتە جوانەکانی ئەوان دووبارە دەکەیتەوە و هات بۆ لات و سەرسامی خۆی دەربڕی بەرامبەر گەورەیی‌و خواناسیەکانت، تۆ پێی بڵێ: من بەو جۆرەیش نیم کە تۆ لێم تێگەیشتوویت وەك چۆن ئەمیری باوەڕداران (ڕەزای خوای لێ بێت) بەم شێوەیەی کرد لەگەڵ پیاوێکدا:

---

١ صفة الصفوة (٢/١٦٠).

* عن عمرو بن حرّة عن ابي البختري قال: (جاء رجل الى علي بن ابي طالب – رضي الله عنه – فاثنى عليه وكان قد بلغه عنه أمر، فقال له: اني لست كما تقول، وانا فوق مافي نفسك).[١]

واتە: عەمری کوڕی حورە لە ئەبی البخترییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت ئەمیری باوەڕداران – عەلی کوڕی ئەبو طالب – (ڕەزای خوای لێ بێت) و هەندێ وەسفی چاکەی کرد – کە شتی چاکەی لە عەلیەوە بۆ باس کرابوو –، ئەمیری باوەڕدارانیش – پێی ناخۆش بوو – بۆیە پێی فەرموو: من بەو شێوەیەش نیم کە تۆ لێم تێدەگەیت و من بە دەرم لەوەی لە دەروونی تۆدایە.

ئەوەش یزیدی کوڕی ئەسوەدە و گەورەترین وانەی حەزنەکردن لە شورەتمان پێشکەش دەکات و ئاواتی مردنی خۆی خواست کاتێك زانی خەڵکی زانیویەتی کە خوای گەورە قسە و پاڕانەوەکانی ناشکێنێ و بۆی جێبەجێ دەکات:

* حدث ابو زرعة قال: خرج ضحاك بن قيس فاستسقى بالناس، ولم يمطروا ولم يروا سحاباً، فقال الضحاك: اين يزيد بن اسود؟ فقال: هذا أنا، قم فاستشفع لنا الى الله – عز وجل – ان يسقينا، فقام فعطف برأسه على منكبيه وحسر عن ذراعيه، فقال: اللهم ان عبادك هؤلاء إستشفعوا بي اليك، فما دعا الا ثلاثا حتى أمطر مطراً كادوا يفرقون فيه، ثم قال: ان هذا شهرني فأرحني منه، فما لبث بعد ذلك الاّ جمعه حتى مات).[٢]

واتە: زانای خواناس (ضحاك)ی کوڕی (قيس) موسڵمانانی بردە دەرەوەی شار بۆ نوێژە بارانە – چونکە ئەو ساڵە وشکەساڵی بوو – بەڵام نە باران باری و نە هەور هات، (ضحاك) وتی: کوا یەزیدی کوڕی ئەسوەد؟ یەزید وتی: ئەمەتام. پێی وت: تۆ تکا بکە لە خوای (عز وجل) تا بارانمان بۆ ببارێنێ.

ئەویش هەستایەوە سەرپێ و سەری داخست تا گەیشتە ئاستی ناو شانەکانی باڵەکانی لکاند بە خۆیەوە و وتی: پەروەردگارم ئەم بەندانەت بە من دەڵێن تکای باران بارینت لێ بکەم، وە تا سێ جار هاواری کردە خوا – ئیتر ئەوەندە باران باری خەریك

---

١ علي بن ابي طالب للدكتور الصلابي – لا (٢٠٦).

٢ الجامع لشعب الايمان للبيهقي لا (٣٧٢/١٠).

بوو خەڵکەکە ئاو بیانبات، پاشان فەرمووی: ئەم کارە منی ئاشکرا کرد لە ناو خەڵکا دەی سا خوایە ئیتر مەمهێڵەرەوە، وە یەزید دوای ئەوە لە هەفتەیەك زیاتر نەژیا و گیانی پاکی سپارد و مرد – هەزاران ڕەحمەتی خوا بڕژێت بەسەر گیانی پاکیدا.

# سێیەم

## خۆیان بە نزم سەیرکردووە

یەکێکە لە ڕەوشتە ناوازەکان – عباد الرحمن – کە خوای گەورە بە جۆرێك باسیان دەکات کە وەك بڵێی لەبەر چاوتن و نەرمە نەرمە و لەسەرخۆ ڕێگا دەبڕن وەك بڵێی کۆمەڵێ فریشتەن و ڕێیان لە سەر زەوی کەوتووە وەك دەفەرموێت:

* قال الله تعالى: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾.[1]

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: بەندە ڕاستەقینەکانی خوا بە ئەسپایی بەسەر زەویدا ڕێ دەکەن و هەر کاتێ نەفامان بە هەڵەشەیی قسەیان لەگەڵدا بکەن ئەمان بە ئاشتی و خۆشی وەڵامیان دەدەنەوە، واتە هەرگیز پلەوپایە و هێزیان بەکار ناهێنن لەگەڵیاندا.

ئەگەر لە ئاستی خوشك و برا موسڵمانەکەتدا خۆت بە بچووك نەزانیت و پێڵاودانەریان نەبیت و لە بەریان هەڵنەسیت و لە خۆت گەورەتر سەیریان نەکەیت، ئەوا چاوەڕوان بکە خوای گەورە بەڵایەکی گەورەت بۆ بنێرێت و لەسەر زەوی بتسرێتەوەو لە باتی تۆدا کەسانێکی وا بێنێتە کایەوە خوایان زۆر زۆر خۆش بوێت و لەئاست موسڵمانەکانی برایاندا سەر شۆڕ و نزم بن و لە ئاستی بێ باوەڕاندا توندوتیژ و خۆبەزلزان بن وەك دەفەرموێت:

* قال الله – سبحانه وتعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾.[2]

---

[1] سورة الفرقان، الآية (٦٣).

[2] سورة المائدة، الآية (٥٤).

واتە : خوای عزوجل دەفەرموێت: ئەی ئەو کەسانەی موسڵمان بوون و باوەڕتان هێناوە، هەر کەسێ لە ئێوە لەو ڕێبازەی بۆمان دیاری کردوون لابدات – هیچ گرنگ نییە لە لامان – و لایدەبەین و بەڕەیەکی قورئانی پاکی تر دێنین لە باتی ئەواندا کە ڕەوشتیان ئابەم جۆرە دەبێت: خوایان زۆر خۆش دەوێت و خوایش بێگومان ئەوانی زۆر خۆش دەوێت و لە ئاستی موسڵماناندا سەرکز و بێ فیز و بچوکن و لە ئاستی بێ باوەڕان و دوژمناندا توند و تیژو کەللە ڕەقن و بەفیز و گەورەن..

ئەی چی دەکەیت براکەم، لەسەردەمێك کە ئەوەندە ئاستی خواناسی و صاڵحیەتی دابەزیووە کە پێچەوانەی ئەم ئایەتەی قورئانە – پەنا بە خوا – لە ئاستی دوژمنانی خوا و ناحەزانی ئیسلام و ئەوانەی پابەند نین بە ئیسلامەکەیانەوە و بگرە – پەنا بە خوا – پێکەنینیشیان پێی دێت – زۆر نەرم و نیان و ڕووخۆش و بە شوشن کەچی هەزار توانج لە برا موسڵمانەکانی دەدات و خۆی گەورەتر و ڕاستتر دەزانێت لە هەموویان و لاقرتێ بە بۆچوون و فیکریان دەکات..

پێغەمبەری نازداریش (ﷺ) کە لوتکەی دەسەڵاتە لە دەوڵەتی قورئاندا – بە وتە جوان و کردەوە شیرینەکانی ئەم ئایەتانەی قورئانی بەرجەستە دەکرد و کەس نەبوو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ فیزتر و خاکی تر و خۆبەبچووك زانتر.. با بزانین چی دەفەرمووێت؟:

* عن عیاض – رضي الله عنه – قال: قال رسول الله (ﷺ) ان الله اوحی اليَّ ان تواضعوا حتی لا یفخر أحد علی احد، ولایبغی أحد علی أحد).[1]

واتە: (عیاض)ی کوڕی (حمار) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خوای – عز وجل – نیگای بۆ کردووم و ئاگاداری کردووم لەوەی کە بە ئەندازەیەکی وا زۆر تەوازوع و بێ فیزی و خۆ بەبچووکزانین

---

١ رواه مسلم، ژمارە (٢٨٦٥) ریاض الصالحین لا (١٦٥).

بنوێنن بە جۆرێ کە واتان لێ بێت کەس بۆ ی نەبێت شانازی بەسەر کەسی ترەوە بکات و کەس زوڵم لە کەسی تر نەکات.

برای صالحم، خوشکی صالحەم، ورد بەرەوە کەس شانازی بەسەر کەسەوە نەکات! !.. واتە: بڕوانامە گەورەت نەکات! جل و بەرگی کەشخە و گرانبەها گەورەت نەکات! ئۆتۆمبێلی مۆدیل بەرز و گران بەها گەورەت نەکات! و کار و پیشەکەت گەورەت نەکات!، و پۆستی دەوڵەت و ئاستی سیاسەت گەورە و لووت بەرزت نەکات! هەموو ئەمانە خۆشیەکی کاتین.. و هیچت لە خەڵکی تر زیاتر نییە! ئەگەر خۆت بە زیاتر زانی ئەوە پەنا بە خوا نەخۆشی خۆبەزلزانینت تێدا دروست بووە و عەیادەی ئیمانت پێویستە و سەیری ئەم هەڕەشە ترسناکەی پێغەمبەرەکەت بکە (ﷺ) و ئەوجا ئەگەر جورئەت دەکەی خۆت بە گەورە بزانە:

* عن عبدالله بن مسعود – رضي الله عنه – عن النبي (ﷺ) قال: لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر).[١]

واتە: هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەرمان (ﷺ)عبدالله ی کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ناچێتە بەهەشتەوە —ورد بەرەوە خوێنەری بەڕێز لەو خەسارۆمەندییە گەورەیە— هەر کەسێ لە موسڵمانان بە ئەندازەی مسقالە زەڕەیەك – خۆ بە گەورە زانینی تێدا بێت – ناخرێتە بەهەشتەوە.

حەزی خۆبەزلزانی و خۆ هەڵکێشان لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە و زۆر قورسە لەسەر دڵ و هەستی مرۆڤ کە بیەوێت ئەو ڕەگە وشك بکات و لە خۆیدا نەیهێڵێت.. جا پێغەمبەرمان (ﷺ) کە سەرمەشقی هەموو ڕەوشتێکی جوانە بۆ مرۆڤایەتی و نابێت لە مسقالە زەڕە کەمتریشی تێدا بێت، و دەبێت بە کردەوە وانەی خۆبەبچووك زانین فێری موسڵمانان بکات، ئەویش بەم ڕێگایانە:

* اخرج الطبراني عن جرير – رضي الله عنه – ان رجلا اتى النبي (ﷺ) من بين يديه، فاستقبلته رعده، فقال النبي (ﷺ): ((هوّن عليك، فاني لست بملك، انما انا ابن إمرأة من قريش تاكل القديد)).[١]

---

١ رواه مسلم، (٩١) رياض الصالحين لا (١٦٧).

واتە: سەرەتا پێغەمبەرمان (ﷺ) هەوڵیدا كە دەوروبەرەكەی لێی نەترسن و وەك پاشا و سەرۆك كۆمارەكان سەیر نەكرێت و حسابی بەرپرسێكی گەورە و زاڵمی بۆ نەكرێت! بەڵكو وەك جەریر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و دەبینیٚ تێك چووە و دەلەرزێت! پێغەمبەرمان حەزی لەمە نەبوو بەڵكو پێی فەرموو: لەسەرخۆ بە! خۆ من پاشا نیم، من كوڕی ژنێكم لە قورەیش كە نان و تریتی دەخوارد!..

* واخرج البيهقي عن أنس قال: دخل رسول الله (ﷺ) مكة يوم الفتح، وذقنه على راحلته تخشعاً وفي رواية (ليضع رسول الله (ﷺ) رأسه تواضعاً لله، حين راى ما اكرمه الله به من الفتح).[٢]

واتە: خاڵێكی تر كە پێغەمبەرمان وانەی خۆ بە كەمزانینی بە كردەوە بەرجەستە دەكرد وەك ئەوەی كە لە ئەو جێ سەركەوتندا كە مرۆڤ خۆی لێ دەگۆڕێت و فوو دەكاتە خۆی كەچی وەك ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (فتحی مەككەدا) بە سەركەوتوویی چووە ناو شاری مەككەو هەموو خەڵكی بەمبەر و ئەو بەری ڕێگاكەیدا وەستابوون ئەو ئەوەندە سەری داخستبوو چەناكەی دابووی لەسەر زینی حوشترەكە وەك سەركزی و خشوعی نواندن بۆ خوا، و لە ڕیوایەتێكدا هاتووە، كە پێغەمبەر (ﷺ) سەری دانەواندبوو وەك سوپاس و تەوازوع نواندن بۆ خوا بەرامبەر ئەو بەخششە مەزنەی لەم سەركەوتنەدا پێی بەخشیووە.

كەسێكی سادەیە و هەموو یەكێك لە ئەندامانی كۆمەڵگەكەی ئەتوانن بیبینن و هەر كارێكی هەبێت پێی بڵێت، تەنانەت كەنیزەكەكانی ناو شاری مەدینەیش!:-

* عن انس – رضي الله عنه – قال: ((ان كانت الأمة من أماء المدينة لتأخذ بيد النبي (ﷺ) فتنطلق به حيث شاءت).

---

١ رواه ابن ماجة (٣٣١٢) لە كتێبی (حياة الصحابة) كاندهلوي لا (٣/٢٠٤) وەرگیراوە.

٢ حياة الصحابة– كاندهلوي (٣/٢٠٦).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کەنیزەکەکانی شاری مەدینە هەر کامیان کارێکی بە پێغەمبەر هەبوایە دەهات بۆ لای و دەستی دەگرت و دەیبرد بۆ ئەو جێیەی کە پێی خۆش بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵیان دەڕۆیشت..

برا و خوشکی بەڕێزم.. تۆ هەنگاو دەنێیت بەرە گەیشتن بە کاروانی صالّحان.. جا بۆ گەیشتن بەو دڵە پاکانە پێویست بەوە دەکات کە تێك نەچیت و پێت ناخۆش نەبێت ئەگەر کەسێك لە تۆ زیرەکتر یان ئازاتر یان شارەزاتر یان.. هتد.. بەڵکو گوێ بگرە بۆ ئەم فەرموودەیەی کە دیسان ئەنەس بۆمانی دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

* عن انس – رضي الله عنه – قال: (كانت ناقة رسول الله (ﷺ) (العضباء) لاتسبق او لاتكاد تسبق فجاء أعرابي على قعودٍ له فسبقها، فشق ذلك على المسلمين، حتى عرفه النبي (ﷺ) فقال: (حق على الله ان لا يرتفع شيء من الدنيا الاّ وضعه).[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: حوشترەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی (عضباء) بوو، زۆر خێرابوو هیچ ولآخێك پێشی نەدەدایەوە لە پێشبڕکێدا هەمیشە براوە بوو.. بەڵام ئەعرابیەکی دەشتەکی هات و لە پێشبڕکێیەکدا پێشی حوشترەکەی پێغەمبەری خوای دایەوە و موسڵمانان زۆر دلگران بوون و پێیان ناخۆش بوو.

بەڵام هەر کە پێغەمبەر (ﷺ) بیستی وا نیگەرانی ئەو دۆڕانەن فەرمووی پێیان:– سروشتی خوا وایەو ڕاستی یەکە و خوا لەسەر خۆی فەرزی کردووە کە هەر شتێك لە دنیادا بەرزی بەخۆیەوە ببینێ ڕۆژێ نزمی بکاتەوە .

برای بەڕێزم هەرگیز لەو کەسانە نەبیت کە ڕوویان نایەت سواری تراکتۆر یان جێب یان ماتۆڕپار بن بەڵکو ئەو نەفسە سەرکەشە خۆبەزلزانەت بشکێنە – چەندان دیاردە لە کاروانەکەوە نزیك دەبیتەوە و هەرگیز بەوە کەم ناکەیت، دەی گوێ بگرە بۆ هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەم بارەیەوە چی دەڵێت؟:–

* أخرج البخاري عن جابر – رضي الله عنه – قال: يعودني ليس براكبٍ بغلا ولابرذوناً))[2]

---

[1] رواه البخاري.

[2] رواه البخاري في الرياض الصالحين لا ٢٢٤.

واتە: جابری کوڕی عبداللە – خوای لێ ڕازی بێت– دەڵێت : نەخۆش بووم لە جێگەدا کەوتبووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ سەردانم بەپێ نە ئەسپی پێ بوو نە گوێدرێژ.

وردە وردە لەسەر ئەوە وەرزش بکە کە ڕەگی خۆ بەگەورە زانین لەناو دڵدا بمرێنە ئەو کاتە خۆ بەبچوك زانین جێگەی دەگرێتەوە و دەبیتە کەسێکی زۆر سادە و صاڵحانیش لە موقابیلدا ئەو جۆرە کەسانە دەبەنە ناو کاروانەکەیانەوە..

لە بازاڕ شت بکڕە و بەدەستی خۆت بیانهێنەوەبۆ ماڵەوەو ئەگەر شتێکی گەورەیش بێت ئەوە باشترە و ئەگەر چوویت بۆ پرسەیەك ملبەرز مەکەوە بۆ ڕێزی پێشەوە بەڵکو لە هەر کوێدا کورسیەك یان شوێنێ چۆڵ بوو لەوێدا دانیشە.. و لەم هەڵوێستە جوانەی سەلمانی فارسی ورد بەرەوە:–

* عن ثابت قال: كان سلمان الفارسي اميرا على المدائن، فجاء رجل من اهل الشام ومعه حمل تبن و على سلمان برد و عباءة فقال لسلمان: احمل – وهو لايعرف سلمان ، فحمل سلمان فراه الناس فعرفوه فقالوا: هو الأمير، فقال الرجل: لم أعرفك، فقال له سلمان: لا حتى أبلغ منزلك).[1]

واتە: ثابت دەڵێت: سەلمانی فارسی –خوای لێ ڕازی بێت – کە هاوەڵێکی دڵسۆزو خواناسی پێغەمبەرمان بووە (ﷺ) و عمری کوڕی خطاب (ڕەزای خوای لێ بێت) کردی بە ئەمیری شاری مەدائین و جارێکیان لە بازاڕدا وەك خەڵکە سادەکە بوردەیەكو عەبایەکی لەبەردا بوو، لە دواوە پیاوێك بانگی کرد – کە لە شامەوە هاتبوو، نەیدەناسی – و پێی ووت: ئەم بارەم بۆ هەڵگرە من زۆر ماندوم – کە بارەکەی باری کابوو، سەلمانیش بێ چەن و چون نایە سەرشانیەوە کەوتە دوای پیاوەکە..

لە ڕێگا خەڵکی دەگەن بە سەلمان هاواردەکەن: ئەوە ئەمیرەکەمانە، پیاوەکە زۆر شەرمەزار دەبێت و دەڵێت: نەمناسیت بمبورە ! و سەلمانی بێ فیز و خۆبەبچوکزانیش دەڵێت: نا داینانێم تا ئەو جێگایەی تۆ بۆی دەڕۆیت.

١ صفة الصفوة (١/١٣٤).

هەر ئەم سەلمانە بەڕێزە (ڕەزای خوای لێ بێت) جارێکی تر لە ماڵدا هاوکاری خێزانەکەی و خزمەتکارەکەی دەکات و خەڵکیش پێی دەزانن بەڵام شەرم ناکات و بە دەستی هەویراویەوە دەچێت بە دەم میوانەکەیەوە، ئەمە چۆن بووە؟

* عن ابی قلابة ان رجلا دخل علی سلمان الفارسی – رضي الله عنه – وهو یعجن! قال: ما هذا؟ قال سلمان: قد بعثنا الخادم فی عملٍ فكرهنا أن نجمع علیه عملین).[1]

واتە: ئەبوقولابە دەڵێ: پیاوێك دەچێت بۆ ماڵی سەلمانی فارسی و دەبینێت هەویر دەشێلێت! بۆیە لێی دەپرسێت: ئەمە خەریکی چیت گەورەم؟ سەلمانیش دەڵێت: خزمەتکارەکەمان بۆ کارێك نارد بۆ جێگایەك و پێشمان خۆش نەبوو کە دوو کاری لەسەر کۆبکەینەوە – وتمان با ئەم هاوکارییەی بکەین – کارێکیانی لەسەر لاببەین.

چەند جار لەم کتێبەدا ووتومە کە نیازکردنی ڕۆیشتن بۆ ناو کاروانی صالّحان زۆر ناڕەحەتە و وەرزشی قورس و ناڕەحەتی دەوێ لەوانە دەبێت برای – صالّح – زۆر گوێ بە جل و بەرگ نەدات و جلی گرانبەها و دەگمەن لەبەر نەکات ئیتر با پارەشی هەبێت و ئیتر با خەڵکی تانەوتەشەریشی لێ بدەن، ئەمە سەر مەشقێکە بزانە چۆن جلی لەبەر کردووە:

* عن سعید بن حسین قال: کان عبدالرحمن بن عوف – رضي الله عنه – لایعرف من بین عبیده).[2]

واتە : سەعیدی کوڕی حسێن دەڵێت: عبدالرحمن کوڕی عەوف (ڕەزای خوای لێ بێت) کە یەکێك بووە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و یەکێك بووە لەو شەش کەسەی کە عمری کوڕی خطاب (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆ خەلیفەی دوای خۆی هەڵیبژارد.. لەگەڵ ئەو پایە بەرزیەیدا کەچی ئەوەندە سادە و خاکی بووە لە جل و بەرگیدا کە ئەگەر بچوایەتە ناو خزمەتکارەکانی نەدەناسرایەوە لە ناویاندا – ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە پەروەردەی دەستی فەخری بوونەوەر بوو (ﷺ) و کەشخە کردنی بە جل و بەرگەوە تیا نەمابوو.

---

١ رواه احمد.

٢ صفة الصفوة (١٨٦/١).

تۆ ئەی خوشك و برای خۆم ئەگەر بوویت بەسەرۆك کۆماریش -ان شاءالله- ئەم وەرزشە قورسە بە کردەوە بەردەوام مومارەسە بکەیت.. نەهێڵێت گەورەترین پۆست لێت دابڕنێت .. سەیری عمری کوڕی عبدالعزیز بکە لەم دوو وانە کاریگەرەیدا کە بۆ من و تۆ باشە کە هەرچەندە پۆستێکی واشمان نیە:-

* کان عند عمر بن عبدالعزیز - رحمه الله- قوم ذات لیلة في بعض مایحتاج الیه، فغشي سراجه، فقام الیه فاصلحه، فقیل له: یا أمیر المؤمنین، الا نکفیك؟ قال: وما ضرني؟ قمت وانا عمر بن عبدالعزیز، رجعت وانا عمر بن عبدالعزیز).[١]

واتە: کۆمەڵێ کەس لە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز بوون (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کاتێ خەلیفەی موسڵمانان بوو، لە شەودا چراکە کوژایەوە، عمر خێرا هەستا و زوو چاکی کردەوە و هاتەوە، میوانەکانی وتیان: قوربان بۆ قسەت نەکرد ئێمە چاکمان دەکردەوە؟ عمر وتی: ئێ چیم لێ کەم بوویەوە؟ ڕۆیشتم هەر عمری کوڕی عبدالعزیز بووم و هاتیشمەوە هەر عمری کوڕی عبدالعزیزم.

جێبەجێکردنی (تواضع) لەگەڵ هاوڕێ و هاوئاستەکاندا کەمێ ئاسانە، بەلام ئەی چی دەکەیت کە دەبینیت لەگەڵ پاسەوان و خزمەتکارەکانیشتدا ئەنجامیان بدەیت، ئەمە قورسترین وەرزشی ئیمانییە، دەی دیسان سەیری خەلیفەی ڕاشیدی پێنجەم بکە لەم نموونە بەرزەدا:

* قال عمر بن عبدالعزیز - عندما کان خلیفة للمسلمین - لجاریة له: یا جاریة روحیني، قال: فأخذت المروحة، فاخذت تروحه، فغلبت عینها فنامت، فانتبه عمر، فاذا هو بالجاریة قد احمر وجهها وقد عرقت عرقا شدیدا و هي نائمة، فأخذ المروحة واقبل یروحها، قال: فانتبهت، فوضعت یدها علی رأسها فصاحت.

فقال لها عمر: انما انت بشر مثلي، اصابك من الحر ما اصابني، فاحببت أن أروحك مثل الذي روحتني).[٢]

---

١ عمر بن عبدالعزیز للصلابي لا (٦٨).

٢ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

واتە: عمری کوڕی عبدالعزیز لە کاتی خیلافەتیدا بە کەنیزەکێکی خۆی وت: من دەخەوم و تۆ باوەشێنم بکە — چونکە لە هاویندا بوو و دنیا زۆر گەرم بوو — و ئافرەتەکەش باوەشێنێکی هەڵگرت و دەستی کرد بە باوەشێنکردنی عمر، بە دەم باوەشێنەوە چاوی چووە خەو، کە عومەر بە خەبەر هات، دەبینێ ئەو ئافرەتە خەوی لێ کەوتووە و لە گەرماندا ئارەقێکی زۆری کردووە، بۆیە باوەشێنەکەی لە ناو دەستی دەرهێنا و دەستی کرد بە باوەشێن کردنی.

پاش کەمێك ئافرەتەکە بە ئاگا هاتەوە و دیمەنی ئەمیری باوەڕدارانی بینی کە باوەشێنی دەکات هەردوو دەستی گرت بە تەوقی سەریەوە و هاوارێکی کرد، عمریش پێی وت: ئێ چی تیایە، تۆش وەك من مرۆڤیت، تۆش وەك من گەرمات بووە، حەزم کرد کەمێك فێنکت بکەمەوە وەك چۆن تۆ منت باوەشێن کرد و فێنکت کردمەوە.

محمدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالب کە بە (محمد الحنفیة) بە ناوبانگە و لە باوکەوە برای (حسن و حسین)ە (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئەم وانەیەی بە کردەوە لە باوکیەوە وەرگرت کاتێ لێی پرسی: باوکە گیان کێ دوای پێغەمبەری خوا باشترین کەسە؟ بزانین چۆن وەڵامی داوەتەوە؟:—

* عن محمد بن الحنفية قال: قلت لأبي — اي علي بن ابي طالب — رضي الله عنه — ايّ الناس خير بعد رسول الله (ﷺ)؟ قال: ابو بكر، قلت: ثم من؟ قال: عمر، وخشيت ان يقول ثم عثمان قلت ثم انت؟ قال ما انا الاّ رجل من المسلمين).[1]

واتە: محمدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ لە باوکم پرسی وتم: کێ باشترین کەسە لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ لە وەڵامدا ئەمیری باوەڕداران فەرمووی: ئەبو بەکری صدیق، وتم: ئەی لە دوای ئەبو بەکر؟ ئەویش فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب، منیش لەوە ترسام کە بڵێ عوسمان، بۆیە پێشی کەوتم و وتم: پاش ئەو دووانە تۆ؟ لە وەڵامدا پێی وتم: من! من تەنها یەکێکم لە موسڵمانان و بەس.

---

١ رواه البخاري.

لەوانەيە چواردەورەت بە كارى چاكە و بەندايەتى و خواناسين و شەونوێژ و ڕۆژووەكانت بزانن و لە ڕادەبەدەر ڕێزت بگرن، تۆ نەكەيت بێدەنگ بيت كە ئەوە ئەوە دەگەيەنێت كە پێى ڕازيت پەنا بە خوا!

بەڵكو بەرپەرچيان بدەرەوە و بڵێ برايان بۆ خاترى خوا من چيم وا سەيرم دەكەن و لە ڕادەبەدەر ڕێزم دەگرن و گومانم پىێ دەبەن.. ئەم وانەش لە موحازەرەيەكدا دەستمان دەكەوێت لە ئەميرى باوەڕداران عمرى كوڕى عبدالعزيز كە لەم بارەيەوە پێشكەشى تازە بەشداربووانى كاروانى صاڵحانى دەكات، ئەمە چۆن بووە؟

* عندما عُرض على عمر بن عبدالعزيز الموضع الرابع في حجرة عائشة – رضي الله عنها – فيها قبر النبي (ﷺ) وابوبكر وعمر، فقالوا: (لو دنوت من المدينة حتى تدفن معهم. قال: والله لئن يعذبني الله – الا النار فاني لأصبر عليها – احب اليَّ من ان يعلم الله من قلبي انّي أراني لذلك اهلاً).[١]

واتە: كاتێ كەسە نزيكەكانى دەوروبەرى عمرى كوڕى عبدالعزيز (ڕەزاى خواى لێ بێت) پێشنيارى ئەوەيان بۆ كرد كە گوايە لە ژوورەكەى عائشەدا (ڕەزاى خواى لێ بێت) لە پاش گۆڕى پێغەمبەر و دوو يارەكەيەوە جێگايەكى تر هەيە كە بەشى گۆڕێكى تر دەكات و پێيان وت: ئەگەر لە شارى مەدينە نزيك بيتەوە – لەم كاتى سەرەمەرگەتدا – تا لەگەڵ ئەو سێ زاتەدا تۆش بنێژرێيت؟!:–

عمرى كوڕى عبدالعزيز (ڕەحمەتى خواى لێ بێت) لە وەڵامدا وتى: سوێند بە خوا، خوا سزا و ئازارم بدات جگە لە ئاگرى دۆزەخ كە تواناى خۆڕاگريم نييە – پێم خۆشترە لەوەى كە خوا پێم بزانێت كە لە ناو دڵيشمدا ختورەى ئەوەم كردووە كە شايانى ئەو جێگايەبم.

ڕەوشتى خاكى و سادەيى و بێ فيزى بۆ هەموو كەسێك جوانە، بەڵام زياتر لە دەسەڵاتدار و بەرپرس و گەورە پياوان دێت، چونكە هەژار و بێ دەسەڵات هەميشە حەز بكات و حەز نەكات لە ناو (تواضع)دا دەژى. ئەها ئەم ڕەوشتە چۆن هارون الرشيدى جوان كردووە:–

---

[١] عمر بن عبدالعزيز للدكتور الصلابي لا (٢٩٣).

* يقال: ان هارون الرشيد كان مع انه خليفة المسلمين واميرهم متواضعاً غاية التواضع، حتى قال (ابن سماك) له يوماً: ((تواضعك في شرفك أشرف من شرفك)).[١]

واتە: دەڵێن: هارون الرشيد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەگەڵ ئەوەدا کە خەلیفەی موسڵمانان و سەرگەورەیان بووە زۆر سادە و بێ فیز بووە، هەر بۆیە زانایەکی وەك (ابن سماك) ڕووی تێکرد و پێی وت: ئەم سادەیی و بێ فیزیەت لەگەڵ دەسەڵاتداریەکەدا لە دەسەڵاتداریەکەت خۆی جوانترە.

خوشکان، برایان، وەرن با فێری مانای تەوازوعی ڕاستەقینە ببین لە وەڵامی زانایەکی خواناسی ئەم کاروانە موبارەکەی ئێوە کە بە نیازن لەگەڵیدا گەشت بکەن کە ناوی (بکر)ی کوڕی (عبدالله)یە:-

* قال رجل لبكر بن عبدالله - رحمه الله - علمني التواضع؟ فقال: (اذا رأيت من هو اكبر منك، فقل سبقني الى الاسلام والعمل الصالح، فهو خير مني، واذا رأيت من هو أصغر منك فقل: سبقته الى الذنوب والعمل السيء فانا شرّ منه).[٢]

واتە: پیاوێك بە - مامۆستا - بەکری کوڕی عبدالله ی وت: (تواضع)م فێربکە؟ ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: هەر کاتێ گەیشتی بە موسڵمانێك لە خۆت گەورەتر بوو، بڵێ: پێشی من کەوتووە لە موسڵمانەتی و کردەوەی جواندا و کەواتە لە من باشترە، ئەگەر گەیشتی بە موسڵمانێك لە خۆت منداڵتر بوو، بڵێ من پێشی کەوتووم لە گوناهکردن و کردەوەی خراپدا و کەواتە من لە ئەو خراپترم.

ئەوەش (مأمون)ی کوڕی خەلیفە هارونە ڕەشیدەو خۆیشی خەلیفەی دوای ئەو بوو، وانەیەکی تر لە هونەری سادەیی و بێ فیزی فێری سەرکردە و فەرمانڕەواکانمان دەکات ئەوانەی کە خوا چاکیان بۆ دەکات و خۆیان دەکەن بە ناو ئەم کاروانە موبارەکەی صاڵحاندا:

* حكى يحيى بن اكثم قال: (بتُّ عند المأمون، فانتبه في بضع الليل فتوهم أني نائم، وقد عطش فلم يستدعي الغلام لئلا استيقظ و قام يتمشى هادئاً في خطاه، فلما شرب

---

١ المحلاة، لا ٥٠.

٢ العقد الفريد (٢/٣٦١)، له (القبسات) لا (١٩٠) وەرگیراوە.

رجع وهو يخفي صوته واخذه السعال، فرأيته يجمع كمه في فمه كي لا اسمع سعاله، وانبثق الفجر وقد تناومت، فتمهل قليلاً ثم تحركت فقال (الله اكبر) يا غلام نبه ابا محمد، فصحت: يا امير المؤمنين فشاهدت بعيني جميع ما كان الليلة وبذلك جعلكم الله علينا سادة).[١]

واتە: یەحیای کوڕی ئەکثم دەڵێ: شەوێکیان لەماڵی مەئمون مامەوە لە شەودا من بەخەبەر بووم بەڵام ئەمیری باوەڕداران وای زانی خەوتووم، تینوی بوو بۆ ئەوەی من بەخەبەر نەیەم – خزمەت کارەکەی بانگ نەکرد بەڵکو خۆی لەسەرخۆ بە ئەسپایی چوو ئاوی خواردەوەو گەڕایەوە و کۆکەی دەهات دەستی گرتبوو بە دەمیەوە تا من گوێم لە کۆکەکەی نەبێت، ئەوەبوو بەرەبەیان دەرکەوت و کەمێ چاوەڕوانی کرد و پاش کەمێ من جموجۆڵم کرد ئەویش هاواری کرد– الله اکبر– ئەی خزمەتکار باوکی محمد بەخەبەر بێنەوە، منیش هاوارم کرد و ووتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران بە چاوی خۆم هەموو شتێکم بینی کە ئەمشەو ڕووی دا، هۆی ئەوەیە خوای گەورە کردوونی بە سەرکردەی ئێمە .

برای بێ فیزم، خوشکی خاکیم.. خۆ بەبچوك سەیرکردن و خۆ بە نزم گرتن مانای وایە ئیسلامەکەت بە گەورە و عەزیز سەیر دەکەیت و بەو ڕەوشتە قورئانییە مەزنەت بانگەوازی بۆ دەکەیت و خۆشەویستی دەکەیت لەلای مرۆڤایەتی.

بەپێچەوانەوە هەر کەسێ لوت بەرز بێت و خۆی بە گەورە بگرێت و وجود بۆخەڵکی دانەنێ، ئەوە ئاینەکەی سوك دەکات و ئیسلامی عەزیز لەبەر چاوی مرۆڤەکان دەخات و بەو ڕەوشتە نەنگەی خەڵکی لە ئاین دوور دەخاتەوە. ئەوەش مامۆستا (لیث)ی کوڕی (مجاهد)ە و ئەم ڕاستیە یەمان لە ڕستەیەکی بچووکدا بۆ بەرجەستە دەکات:

*عن ليث بن مجاهد قال: من اعزَّ نفسه اذلَّ دينه ومن اذلَّ نفسه اعزَّ دينه).[٢]

واتە: هەرکەسێ خۆی بەرزل بزانێت ئەوە دینەکەی خۆی نزم کردۆتەوە و هەر کەسێکیش خۆی بەبچوك بزانێت ئەوە ئاینەکەی بە بەرز و بڵند و خۆشەویست ڕاگرتووە..

---

١ من كتاب (اللغة العربية) للصف الثالث المتوسط في اقيلم كردستان العراق.

٢ صفة الصفوة (٢/١٤٠).

لە سیفاتی صاڵحانە.. و لە خۆبەبچوك زانین و بێ فیزیە.. ماچ کردنی منداڵی خزم و دراوسێ و دەست بەریتە گیرفانت و بەکلێنسەکەت لووتی چڵمنی بسرپیت و دەمی لیکنی پاك بکەیتەوە و یان ئەگەر کەوت بڕۆ هەڵیستێنەوە و ئەگەر سەری شکابوو خوێنەکەی بسڕەوە و بۆی ببەستە و ماچێکی بکە و (٢٥٠) دیناری چاپی نوێی عێراقی بکە بە گیرفاندا..

نەکەیت .. دەخیلت بم.. قێزی لێ بکەیتەوە.. نەکەیت ماچی منداڵی بچوك نەکەیت، یان ئەگەر کەوت ڕووت نەیەت ڕاکەی بۆ لای و هەڵیسێنیتەوە.. چونکە بەو کارەت لەناو کاروانە موبارەکەی صاڵحان دەکرێینە دەرەوە:– سەیری عائیشە کە –خوای لێ ڕازی بێ – کە لە سەرەتاوە خەریك بوو لەناو کاروانەکە بچێتە دەرەوە بەڵام وەك خۆی دەگێڕیتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرسێکی وا گەورەی دادا کە بڕیاری دا لەمەولا شتی وا دووبارە نەکاتەوە و ئوسامەی کوڕی زەید هەڵسێتەوە و پاکی بکاتەوە:

* عن الواقدي وابن عساكر من عطاء بن يسار – رضى الله عنه – قال: ((كان اسامة بن زيد – رضي الله عنه – قد اصابه الجدرى اول ما قدم المدينة وهو غلام، مخاطه يسيل على فيه، فعذرته عائشة – رضى الله عنها – فدخل رسول الله (ﷺ) فطفق يغسل وجهه ويقبله، فقالت عائشة: اما والله بعد هذا فلا اقصيه ابداً)).[١]

واتە هەردوو مێژوو نووسی ئیسلامی (واقدی ) و (ابن عساکر) لە (عطا)ی کوڕی (یسار)ەوە خوای لێ ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە لە سەرەتای کۆچەوە ئوسامەی کوڕی زەید – خوای لێ رازی بێ– تازە هاتبوونە مەدینە تووشی نەخۆشی ئاوەڵە بوو بوو، چڵمەکەی هاتبووە ناو دەمی و عائیشە – خوای لێ رازی بێ– کە بینی کەمێ قێزی لێ کردەوە وەك پێویست نەچوو بەدەمیەوە.

هەر کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) – هاتە ژوورەوە – سەرزەنشتی عائیشەی نەکرد – بەڵکو خۆی دەستی کرد بە شۆرین و خاوێن کردنەوەی دەم و چاوی ئوسامە و پاشان ماچیشی کرد، عائیشەیش کە ئەو هەڵوێستە مەزنەی لەسەر مەشقی مرۆڤایەتی بینی

---

١ منهج التربية النبوية للطفل (لا: ٣٨٧).

ووتی: دەی کە مادام وایە، سوێند بەخوا لەم ڕۆ بەدوا خۆمی لیٚ بەدوور ناگرم و خاوێنی دەکەمەوە .

* فقد روى ابن سعد عن عائشة – رضى الله عنها– قالت: عثر اسامة – رضى الله عنه – على عتبه الباب فشجت جبهته فقال: يا عائشة! أميطي عنه الدم، فتقذرته، قالت: فجعل رسول الله (ﷺ) يمص شجته ويمجه ويقول: (لو كان اسامة جارية لكسوته وحليته حتى أنفقه).[١]

واتە: لەم ڕیوایەتەی ابن سعد دا عائشە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: جارێك ئوسامە پێی هەڵكەوت و سەری دای بە قەراغی دەرگاكەدا و تەوێڵی خوێنی لێهات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عائیشە! خاوێنی بكەوە، عائیشە بێزی لێكردو بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی هەستا و خوێنەكەی بە دەم سڕی و هەمووی چووە دەمیەوە و فەرمووی: (ئەگەر ئوسامە كچ بوایە سەرتاپا جلی جوان و ڕەنگینم لەبەر دەكرد و هەموو گیانم دەگرتە ئاڵتون).

هەندیٚ كەس لەم سیفەتە مەزنەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە دەیدەنی صاڵحانە.. مەحرومەو بیٚ بەشە، كاتیٚ كەمیٚ ئاستی بەرز دەبێتەوە ئیتر لە حوكمەتدا بێت یان لە زانست و زانیاری دا بێت یان لەبەر تەمەن بێت، ئیتر داماوە بە تەمایە خەڵكی سەلامی بۆ بكەن و لە حزوریدا هەڵسن و هەموو كارەكانی بۆ ئەنجام بدەن و هەمیشە بیخەنە پێشی پێشەوەو لە پێش هەمووانداا هەر شتیٚ دابەش كرا بەشی ئەو بدرێت!!

ئەمانە صفاتی صاڵحین نین.. بەڵكو لەسەر زانایان و مامۆستاكانی ئاین و بانگ خوازانە كە پێچەوانەی ئەو خالانەی پێشوو بن و سەیرێكی وردی ئەم دوو هەڵوێستە بكەن و پەند لە خەلیفەی چوارەم و ئامۆزای خۆشەویستی پێغەمبەرمان وەربگرن كە دەڵێت:

* اخرج ابن عساكر عن رازان عن علي بن ابي طالب قال: ثلاث هن رأس التواضع: ان يبرأ بالسلام من لقيه، ويرضى بالدون من شرف المجلس، ويكره الرياء والسمعة).[٢]

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢ حياة الصحابة بەرگی (٣/٢١٤).

واتە: ابن عساكر هێناویەتی لە ڕازانەوە و ئەویش لە علی کوڕی ابو طالب (خوای لێ ڕازی بێ) دەفەرمووێ : سێ شت لوتکەی بێ فیزی و خۆبەکەم زانینە: یەکەم/ دەست پێشخەری دەکات لە سەلام کردن لەو کەسانەی پێ ی دەگەن.

دووەم/ ئاساییە لە لای لە خوارەوەی مەجلیسەوە دابنیشێ، و ڕقی لە ڕیا و ڕووپامایی و شورەتە).

ئەوەش زانای مەزنی ئیسلام و موفەسیری قورئان– مجاهیدە – و دەربارەی (ابن عمر) ی گەورە مامۆستای شتێکی سەیر دەڵێت کە هەق وایە هەموو مەلا و مامۆستایانی ئاینی و قوتابخانەکان جێبەجێی بکەن و لە کەسایەتیشیان کەم نابێتەوە بگرە پێی بەرز دەبن و ناو دەردەکەن:

* عن مجاهد قال: صحبت ابن عمر – رضي الله عنه وعن ابيه – وانا اريد ان اخدمه فكان يخدمني اكثر).

واتە: گەورە زانای تەفسیر – باسی سەردەمی لاوی خۆی دەکات و دەڵێت: هاوڕێیەتی عبدالله ی کوڕی عمرم کرد بەو هیوایەی لە نزیکەوە خزمەتی بکەم و بەردەوام خزمەت کاری بکەم کەچی دەمبینی ئەو لە من زیاتر خزمەتی دەکردم.

هەر (تواضع ) و بێ فیزی یە کە برای صالْح و بۆ خوا ژیاو والێ دەکات پێی ناخۆش نی یە خەڵکی لە هەڵەکانی ئاگاداری بکەنەوە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەوە عمری کوڕی عبالعزیزە سەر شکاوەکەی بەنی ئومەیە و بەتوندی داوا لە دەوروبەری دەکات کە ئەگەر هەڵەیەکی کرد ئێخەی بگرن و ڕاستی بکەنەوە!

دەی ئایا منو تۆ واین؟؟ هەر کەسە و وەڵامەکەی لای خۆیەتی:

* قال عمر بن مهاجر قال لي عمر بن عبدالعزيز – رحمه الله– اذا رأيتني قد ملت عن الحق، فضع يدك في تلبابي ثم هزّني ثم قل: ياعمر ما تصنع ؟![1]

واتە: عمری کوڕی موهاجیر دەڵێ: عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پێی ووتم: ئەی عمر هەر کاتێ منت بینی لە هەق و ڕاستی لامدا، ملیوانی کراسەکەم بگرە و ڕام وەشێنە پاشان بڵێ: عمر – بۆ خاتری خوا – ئەوە چی ئەکەی؟!.

---

١ صفة الصفوة (٢/٨٦).

ئەمە سەرۆکی هەموو وڵاتە یەکگرتتووەکانی ئیسلامە و بکوژ و ببڕ خۆیەتی و لە لوتکەی دەستەڵاتدایە کەچی ئەوەندە بیّ فیزە و خۆی بەزل نازانیّ و دەڵیّ ملیوانەکەم ڕاکێشە و ڕام وەشێنە و بڵیّ ئەم کارەت هەڵەیە بۆ خاتری خوا وازی لیّ بێنە! ئیسلام سەرکردەی وا دروست دەکات.

ئەی برای بەڕێز و خوشکی پاك داوێنم... تۆ لەم ڕێگایەدا زۆر پێویستت بەم ڕەوشتە گەورەیە هەیە، و ئەگەر بووی بە دکتۆر یان ئەندازیار یان مامۆستا یان پارێزەر یان سەرۆکی بەشێك لە فەرمانگەیەکدا، یان ئاستێکت پێدرابوو لەناو حیزبێکدا یان لەناو ڕێکخراوێکدا...

لەم حاڵەتانەدا بتەوێت و نەتەوێت پردەبیت لە هەوا و ئارەزووی خۆبەزلزانین! و بە پلتوك خۆت ئەتەکێنی! خەڵکانی خواری خۆت بە بەشەر نازانیت! و لە بەریان هەڵناسیت! لە بازاڕەکاندا ڕووت نایە مامەڵەی شت بکەیت! و سڵاو لە هەموو کەس ناکەیت!

بۆ ئەوەی لەم هەڵانە ڕزگارت بیّ و لە بەهرەی خۆبەزل زانین ڕزگارت ببێت هەندیّ بەسەرهاتی پێشەوایانی صاڵحانت بۆ باس دەکەم کە لە تۆ بەرزتریش بوون و ئاستیان هەبووە:

* عن حنظلة قال: رأيت سالم بن عبدالله –رضي الله عنه– يخرج الى السوق فيشتري حوائج نفسه).[1]

واتە: حەنزەلە دەڵیّ – سالمی کوڕی عبداللە کوڕی عمر– خوایان لیّ ڕازی بیّ – من بە چاوی خۆم بینی دەهاتە بازاڕ و خۆی شت و مەك و پێداویستی ماڵەوەی خۆی دەکڕی.

بۆیە زۆر نیگەران دەبووم، کە ئەندامانی سەرکردایەتی لایەنە ئیسلامییەکانم لە کوردستان دەبینی کە نەدەهاتنە بازاڕەوە و کەس نەیئەبینین و لە ناو دیکس و سەیارەی جام تاریکدا بە خێرایی بە بازاڕا دەڕۆیشتن و لەدوای مەغریبێکی درەنگ بەشەرمەوە و بەدزیەوە دەهاتنە بازاڕ– بێگومان بە ئوتومبێل – و بە پەلە سەریان

١ صفة الصفوة (٦٥/١).

کورت دەکردەوە و دەڕۆیشتنەوە!! کە ئەمەش بۆنی خۆبەزلزانین و خۆبەزیاتر سەیرکردنی تێدایە و وایان زانیوە بەوە کەم دەکەن و کەسایەتیان دەشکێت بەڵام دەبوا ئەوەیان بزانیایە کە کەسایەتیان نەدەشکا بەڵکو دەچوونە ناو کاروانی صالّحانەوە.

* عن ابی هريرة – رضي الله عنه– قال: كان جعفر بن ابي طالب – رضي الله عنه– يحب المساكين ويجلس اليهم ويحدثهم ويحدثونه وكان رسول الله (ﷺ) يسميه ابا المساكين).[1]

واتە: ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: جعفری کوڕی ابو طالب (خوای لێ ڕازی بێ) کە ئامۆزای پێغەمبەری خوایە (ﷺ) و شەهیدی سەرکردەی جەنگی (مؤتة)یە – ئەم پیاوە بەرزە هەژار و کەمدەستەکانی زۆر خۆش دەویست و دەچووە ناویان و لەگەڵیان دادەنیشت و قسەی خۆشی بۆ دەکردن و ئەوانیش قسەیان بۆ ئەو دەکرد، تاوای لێ هاتبوو پێغەمبەر ی خوا (ﷺ) ناوی نابوو (باوکی هەژاران).

ئەی برای صالّحم .. لەم کاروانە موبارەکەدا صالّحان مەرجی قورست لەسەر دەگرن و ئەگەر نەتوانی بیانکەیت و گران بێت لەلات ئەوە ناهێڵن لەگەڵیاندا بڕۆیت، یەکێك لەو کارانە ئەوەیە کە لە جێیەکدا دانیشتبوون مەهێڵە چوار دەورەکەت بە پێوە بن و فەرمووی دانیشتنیان لێ بکە، وەك ئەم ڕووداوەی عمری کوڕی عبدالعزیز و وەزیر و یاوەرەکانی:

* لما وليّ عمر بن عبدالعزيز – رضى الله عنه – قام الناس بين يديه، فقال: يامعشر المسلمين، إن تقوموا نقم وان تقعدوا نقعد، فانما يقوم الناس لرب العالمين).[2]

واتە: عمری کوڕی عبدالعزیز – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، خەڵکی لە دیووەخانی خیلافەتدا لەحزوریدا وەستابوون!.. عمر زۆری پێ ناخۆش بوو لە دڵی خۆیدا بۆیە ڕووی تێ کردن ووتی: ئەگەر ئێوە بە پێوە دەبن ئەوە منیش با هەڵسمە سەرپێ و ئەگەر ئێوەش دادەنیشن ئێمەش لەگەڵتان دادەنیشین، چونکە خەڵکی تەنها لە حزوری پەروەردگاری جیهاندا بە پێوە دەوەستن.

---

١ عمر بن عبدالعزيز للصلابي لا (٦٨).

٢ هەمان سەرچاوە (لا: ١٥٠).

زۆر کەس هەن لوت بەرزی و خۆبەزلزانی نامێڵێ کە چۆن بۆ پرسەیەك یان چۆن بۆ کۆڕێکی ئاینی یان ڕۆشنبیری یان ئەدەبی ـ لە هەر جێگەیەك چۆڵ بێت دانیشن بەڵکو هەمیشە قۆتە قۆتی ڕیزەکانی پێشەوەیانە و یەکسەر بۆ سەرەوەی مەجلیس دەکوتن- بەڵام صالْحان وانین بەڵکو باپێکەوە بچینە خزمەت سەرکردەی گەنجانی بەهەشت (حسین)ی کوڕی علی و وانەیەکمان پێ بڵێتەوە دەربارەی شێوازی دانیشنەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ):-

* عن الحسين بن علي – رضي الله عنهما – قال: سألت ابي عن مجلسه (ﷺ)؟ فقال: وكان اذا انتهى الى قوم جلس حيث ينتهي به المجلس ويأمر بذلك).

واتە: حسین ی کوڕی علی کوڕی ئەبو طالب – خوایان لێ ڕازی بێ- دەڵێ: لە باوکم پرسی دەربارەی جێگەی دانیشتنەکانی پێغەمبەر (ﷺ)؟ و لەوەڵامدا ووتی: هەرکاتێ بیویستایە بچێتە ناو کۆڕێکەوە سەیری دەکرد بزانێ کۆتایی خەڵکەکە لە کوێ دایە لەوێ دادەنیشت و فەرمانیشی دەدا کە هەموو هاوەڵان بەو شێوەیە بچنە ناو کۆڕ و دانیشتنەکانەوە

هەی یاران ئەگەر وەرەمێکی سەرەتانی بە جەستەی یەکێکمانەوە بێت چەند شار و چەند وڵات و چەند دکتۆر دەگەڕێین و چەندێ دینار و دۆلار سەرف دەکەین تا لە ڕیشە دەری دێنین و چاك دەبینەوە؟!

ئەی بۆچی گوێ نەگرین بۆ – زانای خواناس و صالْحی ناو هاوەڵان – عبدالله ی کوڕی سەلام – ڕەزای خوای لێ بێ – کە چۆن وەرەمی سەرەتانی خۆ بەزلزانین و فیز و گەورەیی نواندنی لە ناو دڵیدا دەردەهێنا بە هەر هۆیەك ببوایە و ئیتر نەدەترسا لەوەی کە کەسایەتی بێتە خوارەوە و بچووك بێتەوە لەبەر چاوی خەڵکی – چونکە پەروەردەی دەستی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە دەیفەرموو:

* قال رسول الله (ﷺ): (ما تواضع احد لله الاّ رفعه الله).[1]

واتە: هەر کەسێ لەبەر خاتری خوا خۆی بە کەم و بچووك سەیر بکات لە ناو خەڵکیدا، خوای گەورە پلە و پایەی بەرز دەکاتەوە لە ناو خەڵکیدا ئیتر بیەوێت یان نەیەوێت، دەی با بچینە خزمەت عبدالله ی کوڕی سەلام و خۆمان نەشتەرگەری بکەین:

---

[1] رواه البخاري.

* أخرج الطبراني باسناد حسن واصله في صحيح مسلم حديث رقم (١٤٧-١٤٩) عن عبدالله بن سلام انه مرّ في السوق وعليه حزمة من الحطب!. فقيل له: ما يحملك على هذا؟ وقد اغناك الله عن هذا؟ قال: اردت ان ادفع الكبر، اني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من الكبر او في قلبه خردل من الكبر).[1]

واتە: دەگێڕنەوە (عبدالله)ی کوڕی (سلام) (خوای لێ ڕازی بێت) بە ناو بازاڕدا تێپەڕی و کۆڵێ داری بەسەر شانەوە بوو!، لێیان پرسی: بۆچی ئەم کۆڵە دارەت هەڵگرتووە؟ خۆ تۆ پێویستت پێی نییە و خوا وەزعی باش کردوویت؟

لە وەڵامدا وتی: ویستم نەفسم بشکێنم و لە لووت بەرزیەکەی بیخەمە خوارەوە و خۆ بەزلزانی لە خۆم دادەڕنم چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ناچێتە بەهەشتەوە هەر کەسێك مسقالە زەڕەیەك ئەوەندەی تۆوی خەرتەلەیەك لوتبەرزی و خۆ بە زلزانی لە دڵیدا هەبێت)).

پێشتریش عومەری کوڕی خەتاب — شەهیدی سەرکردە — ئەم نەشتەرگەرییەی بۆ خۆی کرد و سوودێکی باشی لێ وەرگرت و بە پێی خاوس چوو بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەژن:

* اخرج المروزي في العيدين عن زر قال: (رأيت عمر بن الخطاب — رضي الله عنه — يمشي الى العيد حافياً).[2]

واتە: مەروزی لە باسی دوو جەژنەکەی ئیسلامدا لە (زەڕ)ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عومەری کوڕی خەتابم بینی لە ڕۆژی جەژندا بە پێی پەتی دەڕۆیشت.

یا لە ئەوپەڕی ئەوجی دەسەڵاتیدا کە ئەمیری هەموو موسڵمانان بوو وڵاتی فارس و ڕۆمی هێنا بە چۆکدا کەچی بۆ ئەوەی خۆی لێ نەگۆڕێت و مەغروری ڕووی تێ نەکات ئەم نەشتەرگەریە پێویستە ئەنجام دەدا — کە ئەوەندە قورس و گران بوو (عبدالرحمان ی کوڕی عەوف) (خوای لێ ڕازی بێت) پێی وت: چ پێویستی دەکرد خۆت ئاوا دابەزێنیت — بۆ سەر سفر!!:

---

١ حياة الصحابة (٢/٢١٤).

٢ حياة الصحابة (٣/٢٠٧).

* اخرج الدينوري عن محمد بن عمر المخزومي عن ابيه، قال: نادى عمر بن الخطاب: الصلاة جامعة، فلما اجتمع الناس وكثروا، صعد المنبر، فحمد الله واثنى عليه بما هو أهله وصلى على نبيه (ﷺ) ثم قال:

(ياايها الناس! لقد رأيتني ارعى على خالات لي من بني مخزوم، فيقبض لي القبضة من التمر والزبيب، فأظل يومي واي يوم، ثم نزل.

فقال عبدالرحمن بن عوف (رضي الله عنه): يا أمير المؤمنين! مازدت على ان قمئت نفسك يعني عبت فقال: ويحك يا ابن عوف! اني خلوت، فحدثني نفسي. فقالت: انت امير المؤمنين، فمن ذا أفضل منك، فاردت ان أعرفها نفسها).[1]

واتە: دەینوری لە محمدی کوڕی عومەری مەخزومیەوە، ئەویش لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) هاواری کرد — وەرن بۆ نوێژی جەماعەت —* و کاتێ خەڵکی کۆبوونەوە کە زۆر زۆر بوون، ئەوجا عومەر چووە سەر مینبەر و سوپاسی خوای کرد بە جۆرێ کە شایستەی بێت و پاشان صەلاواتی لەسەر پێغەمبەرەکەی دا (ﷺ) و پاشان وتی: ئەی خەڵکینە، کاتی خۆی بە منالی مەڕ و بزنم دەلەوەڕاند بۆ خاڵوانم لە هۆزی مەخزوم و ئەوانیش لە بەرامبەریدا یەك مشت خورما و مێوژیان پێ دەدام و ئەو ڕۆژەم پێ دەبردە سەر و چ بردنە سەرێك، پاشان لە مینبەرەکە هاتە خوارەوە.

عبدالرحمنی کوڕی عەوف (خوای لێ ڕازی بێت) پێی وت: ئەمیری باوەڕداران، چ سوودێکت لەو قسانە وەرگرت جگە لەوەی خۆتت پێ سووك کرد واتە عەیبدارت کرد، عومەریش وتی: واز بێنە ئەی کوڕی عەوف، من تەنها بووم، دەروونی بەدم قسەی بۆ دەکردم و دەیوت پێم: تۆ ئەمیری باوەڕدارانیت و کێ هەیە لە تۆ باشتر بێت، منیش ویستم هەقیقەتی بۆ ڕوون بکەمەوە و خۆمی پێ بناسێنم.

---

١ هەمان سەرچاوە (٣/٢٠٨).

* هەموو خەلیفەکان ئەگەر بیانویستایە جەماوەر کۆبکەنەوە شیعاری (الصلاة الجماعة)یان دەوتەوە.

شان بە شانی عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) خەلیفەی مەزنی چوارەمیش عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم خۆ شکاندنەوەیەی کردووە و خۆی کۆڵی خۆی هەڵگرتووە و ئامادە نەبووە بیدا بە کەس بۆی هەڵگرێت با بزانین چۆن خۆ بە گەورەزانی لە ناو دەروونیدا ڕیشەکەن کردووە وەك وەرەمی سەرەتانی:-

* أخرج البخاري في الأدب (ص ٨١) عن صالح، بياع الاكسية عن جدته قالت: رأيت علياً – رضي الله عنه – اشترى تمراً بدرهم، فحمله على ملحفته، فقلت له او قالت: قال له رجل: احمل عنك يا أمير المؤمنين! قال: لا، ابو العيال أحق ان يحمل).[١]

واتە: بخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (ادب المفرد)دا لە صاڵحی قوماش فرۆشەوە و ئەویش لە نەنکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: عەلی کوڕی ئەبو تالیبم بینی (خوای لێ ڕازی بێت) هەندێ خورمای کڕی بە درهەمێك و هەڵی گرت و نای بە شانیەوە بەرەو ماڵ و منیش پێم وت: -یان – پیاوێك پێی وت: من بۆت هەڵدەگرم ئەی ئەمیری باوەڕداران!

عەلی فەرمووی: نەخێر – شتی وا ناکەم – مناڵدار خۆی شایانە پێداویستی خۆی هەڵبگرێت.

برای خوێنەر – دەمانەوێت صاڵح ببین و شانەخرە دەکەین بۆ ناو کاروانی صاڵحان کەچی کاتێ بانیعی وەردەگرین یان لە بازاڕ شتێکی کەمێ قەبەت کڕیووە – ڕووت نایە – هەڵی بگری و خێرا دەست لە تەکسی یان ماتۆڕبار ڕادەگریت!! دەی ئەمجارە شتێکت کڕی لە بازاڕەوە بینێ بە شانتەوە و بیبەرەوە بۆ ماڵ و نەفسی سەرکەش نزم کەرەوە.. ئەم کارە بۆ من و تۆ کەمێ سووکترە بەڵام بۆ بەرپرس و ئاست بەرزەکان وەرزشێکی زۆر قورسە خوا ڕەحمیان پێ بکات و بتوانن ڕەگی (کبر) و خۆ بەزلزانی لە بن بێنن لە ناو دڵیاندا.

ئەی خوشکی موسڵمانم ئەزانی پەتایەکی ترسناك خۆی کردووە بە ناوتاندا – پەنا بە خوا – پشت شکێنە و ئەگەر وریا نەبن نەك لە ناو کاروانی صاڵحان وەرناگیرێن

---

١ حياة الصحابة (٢٠٩/٣).

بەڵکو بۆنی بەهەشتیش ناکەن، چونکە لە خۆبایی بوون و خۆڵێ گۆڕان و لووت بەرزی لە دوایە..

بۆ نموونە: لوت بەرزی ناهێڵێ (تواضع)ت تێدا دروست ببێ و جل و بەرگی (٦) مانگ لەمەو بەر لەبەر ناکەیت چیە کۆن بووە؟!!

نان ناکەیت! ئەمەچیە وەزع باش بووە و مەعاش باش بووە! خۆ بووکەکانی تریش نایکەن! ئێستا هیچ ناکەم تەشت و سەردۆڵە دادەنێم و نان دەکەم! ئەی نەی خوا نانی بۆ بکەم واتە بە هاوسەرە بەناو خۆشەویستەکەی دەڵێ! دەگوێ بگرە، سوێند بە خوا لێت کەم نابێتەوە ئەگەر هاوکاری گیرفانی مێردەکەت بکەیت و جاربەجار نانی کوردی یان نانی تەنوری بۆبکەیت! (فاطمة الزهراء)- خوا لێ ی ڕازی بێ - کچی پێغەمبەر بوو خێزانی علی کوڕی ئەبوطالب بووە کەچی نانی کردوە و هەویری شێلاوە دەی تۆ کچی کێت پێ دەڵێن؟؟! لەم نمونەیە وردبەرەوە و ڕێگای صالحان کوێر مەکەرەوە:

* اخرج ابو نعيم في الحلية (٣/٣١٢) عن عطاء قال: أن كانت فاطمة -رضى الله عنها- بنت رسول الله (ﷺ) لتعجن وان قصتها لتكاد ان تضرب الجفنة)[1].

واتە: عەطا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: فاطمە -ڕەزای خوای لێ بێ- کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەویری دەشێلا تەنانەت ئەوەندە سەری دانەواندبوو کە پەرچەمی خەریك بوو دەکەوتە ناو هەویرەکەوە..

ئەی خوشکی بەڕێز و پاك داوێنم... جاری وا هەیە وادەبێت شوودەکەیت بە پیاوێك کە بەر پرسە یان ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی یان ئاینی یان حزبی هەیە.. ئیتر شەیتان بە هەموو جۆرێ دەیەوێت لەو ڕێگایەوە لە خشتەت بەرێت و نەشتەرگەری خۆ بەزلزانیەکانت نەکەیت هەرگیز شایانی ناو کاروانە موبارەکەکەی صالحان نابیت!

شەیتان پێت دەڵێت بڵێ: من ژنی فلان کەسی گەورەم! چۆن نان دەکەم! دەبێ نانی گەرمم هەبێ!! دەبێ نانی بازاڕم بۆ بکڕن!

---

١ حياة الصحابة (٣/٢١١).

یان لە هەمووی خراپتر، خوشکێکی موسڵمان کە شوو دەکات تا ماوەیەکی زۆر دەست نادات بە ئیشەو نان ناکات – ئەمە چیە وەلا تازە بووکە!! ئەی ئەزانی کچێکی شۆخ و شەنگی عەرەب و کچی سەرۆك عەشیرەت بووە و هەر کە شووی کردووە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئێوارە گواستوویانەتەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتای شەو دا قۆڵی هەڵماڵیوە و هەویری شێلاوە بۆ نانکردن؟ دەی فەرموو سەیری ئەم هەڵوێستەی ئافرەتانی صحابی بکە و کەمێ لە لوت بەرزی و غروورت وەرە خوارەوە تا لە کاروانەکە نزیك ببیتەوە:

* اخرج ابن سعد (٨/٦٤) عن المطلب بن عبدالله قال: دخلت أيِّمُ العرب على سيد المرسلين (ﷺ) أول العشاء عروساً، وقامت من اخر الليل تطحن – يعني (أم سلمة).[١]

واتە: دایکی باوەڕداران – ام سلمة –خوالێ ی ڕازی بێ لە سەرەتای شەوەوە گوێزرایەوە بە بووکی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لە کۆتایی هەر ئەو شەوەدا دەستی کرد بە هەویر شێلان و نان کردن.

علی کوڕی ئەبوو طالب (خوای لێ ڕازی بێ) جل و بەرگی سادەی لەبەر دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەمەند بووە کاتی سەرزەنشتیان دەکرد لەسەر ئەوە دەیفەرموو: ئێوە چیتانە بەسەر جل و بەرگمەوە بەم جۆرە باشە لە فیز و تەکەبور دەمپارێزێ و موسڵمانانیش چاوم لێدەکەن:

* عوتب علي بن ابي طالب في لباسه، فقال: مالكم وللباس هو ابعد من الكبر واجدر ان يقتدى بي المسلم).[٢]

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢ صفة الصفوة (٢/١٤٠).

# چوارەم

## صاڵحان خۆیان لە بیدعەکاری پاراستووە

ئیسلام کۆتا بەرنامەی ژیانە و تەواوترین پرۆگرامی پەروەردەیی لە خۆگرتووە، تەنها ئیسلامە کردەوەی چاك، ڕەوشتی بەرز، هەڵوێستی مەردانە، بانگەواز، جیهاد و گیان فیدایی و خواناسی و بەندایەتی کردن بۆ خوا، لە کەس وەرناگرێت ئەگەر مەرجێکی گەورە و قورسی تێدا نەبێت! ئەزانی ئەو مەرجە کامەیە؟ ئەو مەرجە (دڵسۆزی)یە، واتە لەبەر خاتری خوا ئەنجامی دابێ. دەی لەم ئایەتەی سورەتی ( بەیینە) وردبەرەوە:

* قال الله تعالى: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥﴾[١].

واتە: خوای گەورە باسی ئومەتەکانی پێشوو دەکات و دەفەرموێت: فەرمانمان پێ نەداون تەنها بەوە نەبێت کە خوا پەرستی بکەن بە دڵسۆزی و ئیخلاسەوە و ئاین بەرپا بکەن بۆی بە ڕێك و پێکی و نوێژ بکەن و زەکات دەربکەن لە ماڵەکانتان و ئەوەش ئاینی ڕاست و دروستە.

لە سورەتی ماعون دا خوای گەورە (وەیل)ی داناوە بۆ کێ؟ بۆ ئەو کەسانەی کە کەمتەرخەمی دەکەن لە نوێژەکانیاندا- واتە دەی فەوتێنن و لە جێگەی خۆیدا ئەنجامی نادەن - ئەو کەسانەشی کە ڕیابازی دەکەن و کاری چاکە ئەنجام دەدەن بەڵام لەبەر چاوی خەڵك و ئەگەر لە شوێنێکدا تەنها بوون ئەو کارە چاکە ناکەن:

قال الله تعالى: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ۝٦ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ۝٧﴾[٢].

---

١ سورة البينة، الآية (٥).

٢ سورة الماعون، الآية (٤-٧).

واتە: (وەیل) پەنا بەخوا کە شیوێکە لە شیوەکانی ناو جەهەننەم یان بە مانای لە ناو چوون و پەنجەڕۆیی بۆ ئەو کەسانەی کە نوێژ دەکەن بەڵام کەم تەرخەمی تێدەکەن و لەبەر ڕووپامایی و ڕیا ئەنجامی دەدەن و پێداویستی دەفر و دۆڵەیش نادەن بە دراوسێ.

لە جێیەکی تردا خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە باوەڕیان وایە کە دەگەنەوە بە پەروەردگاریان لە ڕۆژی قیامەتدا با کردەوەی چاکی مەرجدار ئەنجام بدەن، کام مەرجەیە هەی خۆشەویستانم؟:

* قال الله تعالى: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًا﴾.[١]

واتە: هەر کەسێ باوەڕی وایە و بە تەمایە بگەڕێتەوە بەردەم لێپرسینەوەی پەروەردگاری با کردەوەی چاك بکات و لە خوا ناسی و بەندایەتی کردنیدا -دڵسۆزیو ئیخلاص- بنوێنێ و هاوبەشی تێدا پەیدا نەکات بۆ خوا، واتە: با لەبەر خاتری خوا و پاداشتی ڕۆژی دوایی هەموو کارە چاکەکانی بکات و خوای گەورە بەر بە نیوەیی ناوێت واتە نیوەی لەبەر خاتری خوا و نیوەی لەبەر ئەوەی خەڵکی وەسفی چاکەی بکەن و خوای گەورە بەشەکەی خۆی ناوێت و هەمووی دەدات بەو کەسەی کە لەبەر ئەو چاکەی ئەنجام داوە.

بۆیە خوشك و برای موسڵمانم گوێ بگرە بۆ ئەم فەرموودەیە:

* عن ابی هريرة - رضی الله عنه- قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ان الله سبحانه يقول: انا اغنى الشركاء عن الشرك، فمن عمل عملاً اشرك فيه غيری فانا منه بریئ، وهو للذی عمله).[٢]

واتە: ئەبو هورەیرە - خوا لێ ی ڕازی بێ - دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) فەرمووی: خوای (سبحانە وتعالی) دەفەرموێت: من لە هەموو کەس زیاتر

---

١ الكهف، (الاية: ١١٠).

٢ رواه مسلم في الصحيح عن زهير بن حرب عن ابن عليه.

پێویستم بە هاوبەشی نیە، و هەر کەسێ کردەوەیەکی چاك بکات و لەبەر من بیکات بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵکیش ببینێ ئەوە من لەو کردەوەیە بەریم و نامەوێت و با بۆ ئەو کەسە بێت کە لەبەر ئافەرینێك کردەوەکەی بۆ کردووە.

ڕیابازی زۆر ترسناکە – خاوەنەکەی لە کاروانی صالّحان دەکرێتە دەرەوە و کردەوە چاکەکانی بۆ نانوسرێت، لەمانەش زیاتر دەبێتە هاوبەش پەیداکەری بچوك– پەنا بەخوا– ئەزانی هاوبەشی پەیداکردنی بچوك (الشرك الاصغر) چی یە؟ دەگوێ بگرە بۆ ئەم فەرموودەیە:

* قال رسول الله (ﷺ) (ان اخوف ما اخاف عليكم الشرك الاصغر ، قالوا: وما الشرك الاصغر يارسول الله؟ قال: (الرياء) يقول الله يوم القيامة اذا جزى الناس باعمالهم: اذهبوا الى الذين كنتم تراؤن فى الدنيا، فانظروا هل تجدون عندهم الجزاء).[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوەی زیاتر ترسم هەیە کە توشتان ببێت هاوبەش پەیداکردنی بچوکە، هاوەڵان –خوایان لێ ڕازی بێ – پرسیان: هاوبەش پەیداکردنی بچوك چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: (ڕیابازی) خوا لە ڕۆژی قیامەت کاتێ پاداشتی کردەوەکانی خەڵکی دەداتەوە بە هەندێك دەفەرموێ: لای من بە تەمای پاداشت مەبن و بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کە لەبەر ئەوان کردەوەی جوانتان ئەنجام دەدا، و بزانن توانای پاداشت دانەوەی ئێوەیان هەیە؟ بێگومان نەخێر.

– کۆچ – زۆر گەورەیە و کارێکی قورس و گران و ناڕەحەتە.. کۆچ واتە: بەجێ هێشتنی ماڵ و منداڵ و وەزیفە و مەعاش و باخ و ڕەزەکانی و بچێت بۆ جێگایەك کە غەریب و نامۆ و بێ لانە و ماڵ و منداڵ و بێ کار و بێ پارە..

ئەم کارە گەورەیە لە قیامەتدا دەدرێت لە بێژنگ بزانن چی دەردەچێ لەبەر خوا کردویەتی یان نیەتی تری تێکەڵ کردوە، دەی وەرن با گوێ بگرین بۆ ئەم فەرموودە صحیحە کە دەفەرموێت:

---

١ اسناد حسن، مسند أحمد (٥/٤٢٨–٤٢٩).

* قال رسول (ﷺ) (انما الاعمال بالنيات، وانما لكل امرئ مانوى، فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله، ومن كانت هجرته لدينا يصيبها او امرأة ينكحها فهجرته الى ما هاجر اليه).[١]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پاداشتی کردەوەکان بەپێی نیەتەکانەو بەپێی ڕادەی نیەت پاکی پاداشت دەدرێتەوە، هەر کەسێ کۆچ بکات بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە بۆی دەنوسرێت کە ڕاستەکات و بۆ لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی کۆچی کردووە، بەڵام هەرکەسێ لەبەر دەسکەوتێکی دنیایی یان لەبەر ئافرەتێك کە بیەوێت بیخوازێت ئەوە پاداشتی کۆچەریانی نیە و تەنها ئەو دەسکەوتە دنیاییە یان ئەو ئافرەتەی دەست دەکەوێت و بەس واتە ڕەنجە ڕۆیی ڕۆژی قیامەتە – پەنا بەخوا–.

زانایانی فەرموودە هۆی ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە بۆ کابرایەك لە مەککە بوو بە نیاز بوو ئافرەتێك بخوازێت کە ناوی (أم قیس) بوو، بەڵام لە بەختی ڕەشی ئەودا ئەو ئافرەتە لەگەڵ هاوەڵاندا کۆچی کرد بۆ مەدینەی مونەوەرە، ئەمیش خۆی کۆکردەوە و بەدوایدا کۆچی کرد، ئیتر لەو ڕۆژە بەدوا پێیان دەوت: کۆچکەری (أم قیس)!

(ئیخلاص) زۆر نارەحەتە و دەروون زۆری پێ ناخۆشە و خەریکە ئەتەقێ ئەو هەموو کارە چاکەی پێ دەکەیت بەڵام نایەڵی کەس بزانێت و ئافەرینی کەسی ناوێت.

* قال احد الصالحين – رحمه الله – سئل سهل بن عبدالله التستري –رحمه الله– ايّ شئ اشد على النفس؟ اشد ما كان على النفس من الاخلاص لانه ليس للنفس فيه نصيب).[٢]

واتە: یەکێ لە صالّحان – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێ: هیچ شتێك بە لای نەفسەوە ئەوەندەی (دڵسۆزی) ناخۆش نیە، چونکە هیچ سودێکی بۆ ئەو نیە و بەشی ئەوی تیا نی یە).

---

١ اخرجه البخاري في الايمان (١/٢٠).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٢٩).

ئـەم ئایەتـە پـیرۆز و فـەرموودە شـیرینانە ئاگریـان بەردایـە دڵ و دەروونـی شوێنکەوتووانی ئەم ئاینە پاکە و شیعاری بەنهێنی هێشتنەوەی کردەوەچاکەکانیان هـەڵگرت و هـەموو هـەوڵێکیان خـستەکار تـا نـزیکترین کەسـی خۆیـشیان کـە هاوسەرەکانیان بوو بەگریان و غەمی ناو دڵیان نەزانن و کردەوەکانیان وەك هـەنگوینی شاخ بە پوختەیی بمێنێتەوەو تەسلیمی پەروەردگاری خۆشەویستیانی بکەن:

* عن عمران بن خالد قـال: سمعت محمد بن واسع – رحمه الله– يقول: ان كـان الرجل ليبكي عشرين سنة وامراته معه لا تعلم).[1]

واتە: عمران ی کوڕی خالد دەڵێ : لە محمدی کوڕی واسیعم بیستووە– ڕەحمـەتی خوای لێ بێ – دەیووت: پیاو چاك و صاڵحی وا هەبووە ماوەی بیست ساڵ لـە ترسـی خوا و ڕۆژی قیامەت گریاوە و خێزانەکەی لەگەڵیدا بووەو بەم کارەی نەزانیوە.

بـرای صالح ، خوشـکی صـاڵحە، ئـەزانی صـاڵحان – ڕەحمـەتی خوایـان لێ بـێ – خەریکی کردەوەی چاك بوونو ئەگەر کەسێك هاتبێت بۆ لایان لـەو کاتـەدا وازیـان لـەو کارە چاکە هێناوە بە شێوەیەکی کاتی و پاش ڕۆشتنی ئەو کەسە دەستیان کردۆتەوە بـە قورئـان خوێنـدن یـان زیکرەکـەیان، دەی جـوان وردبـەرەوە لـەم نموونـە جوانـەی سەرمەشقێکی صاڵحان پێشکەشی کردوە پێش هەزار ساڵ لەمەوبەر:

* عن الاعمش قـال: عن ابراهيم النخعي – رحمه الله – وهو يقرأ فـي المصحف واستأذن عليه رجل فغطى المصحف وقال: حتى لايرى هذا أنني اقرأ فيه كل ساعة).[2]

واتە: ئەعمەش دەڵێ: جارێك من لە لای (ابراهيم النخعي) –ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دانیـشتبووم و ئـەو لـەو کاتـەدا قورئـانێکی کردبوویـەوەو تیایـدا دەوری دەکـردەوە، پیاوێك داوای ڕوخسەتی هاتنە ژوورەوەی کرد لێی، مامۆسـتا ابـراهیمیش پـێش ئـەوەی پیاوەکـە بێتـە ژوورەوە قورئانەکـەی داخـستەوە و ڕووی تێکـردم و پـێی ووتم: بۆیـە وا دەکەم تا ئەم پیاوە وانەزانێت من هەموو سەعاتێ قورئانی تێدا دەخوێنم.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٨١).

٢ صفة الصفوة (٣/٥٥).

صاڵحان هەر بەوەوە نەوەستاون کە کردەوەی چاکی خۆیان شاردۆتەوە لە ترسی ڕوپامایی و ڕیابازی، بەڵکو ئامۆژگاری دەوروبەریشیان دەکەن تا لە پەتای ترسناکی ڕیا خۆیان بە دوور بگرن:

* قال الحسن البصری – رحمه الله – نظر رجاء بن حیوة الی رجل یتناعس بعد الصبح، فقال: انتبه عافاك الله، لایظن ظان ان ذالك عن سهر وصلاة فیحبط عملك).[1]

واتە: حەسەنی بەسری – ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دەڵێ: جارێکیان ڕجای کوڕی حەیوە – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – پیاوێکی لە کاتی بەیاندا بینی خەوەنوچکە دەیبردەوە، پێی ووت: ئاگات لە خۆت بێت خوا عەفوت بکات، با خەڵکی واگومانت پێ نەبەن کە ئەم خەوەنوچکەیەت لەوەوەیە کە ئەم شەو نەخەوتویت و هەر نوێژت کردوە و بەو کارەشت خوا ناسی و کردەوەکانت دەشۆرێتەوە.

* وقیل عن الحسن البصری– رحمه الله– انه وعظ یوماً، فتنفس رجل الصعداء، فقال له: یا ابن اخی ماعساك أردت بما صنعت؟ ان کنت صادقاً فقد شهرت نفسك، وان کنت کاذباً فقد اهلکتها، ولقد کان الناس یجتهدون فی الخفاء وما یسمع لأحدهم صوت، ولقد کان الرجل ممن کان قبلکم یستکمل القرآن فلا یشعر به جاره).[2]

واتە: دەڵێن جارێك حەسەنی بەسری – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، پیاوێك هەناسەیەکی قوڵ و دووروودرێژی هەڵکێشا، بەسری پێی ووت: ئەی برازاکەم مەبەستت چی بوو لەو کارەی کردت؟ چونکە ئەگەر ڕاستبێ و لە دڵەوە دەرچووبێ ئەوە خۆتت دەرخستووە، خۆ ئەگەر لە دڵیشەوە نەبووبێ و بەدرۆ بووبێ ئەوە خۆتت لەناوبردوە.

براکەم خەڵکانی پێش ئێوە لە نهێنی و چۆڵدا کاری چاکەیان کردووە و کەس گوێی لە دەنگی نەبووە، یان کەسی وا هەبووە هەموو قورئانی دەورکردۆتەوە و دراوسێکەی ئاگای لێی نەبووە.

---

١ عمر بن عبدالعزیز لا: ٢٠١ لە (الزهد للحسن البصري) وەرگیراوە.

٢ هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٠٠).

* وكان الحسن يقول: روى ان سعيد بن جبير– رحمه الله – رأى رجلاً متماوتاً فى العبادة فقال: يا ابن اخى، ان الاسلام حي فاحيه ولاتمته، أماتك الله ولا احياك).[١]

واتە: حەسەنی بەسری دەڵێ: دەگێڕنەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – پیاوێکی بینیبوو لە نوێژدا خۆی مراندبوو – گوایە خشوعی هەیە – پێی ووت: ئەی کوڕی برام ئاینی ئیسلام زیندووە و زیندووی ڕاگرە و مەی مرێنە، خوا بتمرێنێ و نەتژێنێ.

* عن سفيان قال: كان عمل الربيع كله سراً ان كان ليجئ الرجل وقد نشر المصحف فيغطيه بثوبه).

سوفیان دەڵێ: کردەوە چاکەکانی ڕەبیع هەمووی بەنهێنی ئەنجام دەدا و هەر کاتێ لە کاتی قورئان خوێندندا یەکێ بهاتایە بۆ لای یەکسەر جلەکانی خۆی دەدایە سەر قورئانەکەدا و دایدەپۆشت تا نەزانێت کە قورئان دەخوێنێت.

ناڕەحەتترین شت لە لای مرۆڤ ئەوەیە کردەوەکانی بشارێتەوە لە ژن و منداڵەکانی چونکە شارینەوەی کردەوە لە خەڵکی ئاسانە بەڵام لە ماڵ و منداڵی خۆی بشارێتەوە زۆر قورسە بەڵام صاڵحان – ڕەحمەتی خوایان لێ بێ – لە ترسی ئەوەی ڕیای تێکەڵ نەبێت بە دزی ماڵەوەشیانەوە بە ڕۆژوو بوون ئەمە سەرمەشقێکی تری صاڵحانە و ناوی عەمری کوڕی قەیسی مەلائی یە و بزانین بە چ هونەرێك نەیهێشتوە بزانن بە ڕۆژوەکانی:

* عن اسحاق بن خف قال: اقام عمرو بن قيس الملائى – رحمه الله – عشرين سنة صائماً ما يعلم به اهله يأخذ غذاءه ويغدو الى الحانوت فيتصدّق بغذاءه ويصوم واهله لايدرون)[٢]

واتە: (اسحاق)ی کوڕی (خف) دەڵێ: زانای خواناس عەمری کوڕی قەیسی مولائی– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– (٢٠) ساڵ ڕۆژووی گرتووە و هەوڵی داوە ماڵەکەی خۆیشی بەم چاکەیەی نەزانن بەم هەنگاوەی کە خواردنەکەی خۆی دەبرد بۆ دوکان و لەوێ

---

١ هەمان سەرچاوە و لاپەرە (٢٠١).

٢ صفة الصفوة (٨١/٢).

دەیکرد بە خێر و خۆی نانی نەدەخوارد و بەڕۆژوو دەبوو ماڵەوەشی هەستیان پێ نەدەکرد..

وادیارە ئەم نەخۆشیە کوشندەیە بە ئاسانی لە کۆڵی خواناسان نابێتەوە مەگەر زۆر زۆر ئاگاداری ئەو کردەوە جوانانە بن کە دەیکەین و ڕیایی تێکەڵ نەکەن لەم وانەیەدا (ابن الاعرابی) بەشێوازێکی کاریگەر دەیەوێت لەو پەتایە ڕزگاریان بکات، چی دەڵێ؟

* قال ابو بكر الرازي: سمعت ابن الاعرابي يقول: أخسر الخاسرين من ابدى للناس صالح أعماله وبارز بالقبيح من هو اقرب اليه من حبل الوريد ).[١]

واتە: ئەبوبەکری رازی دەڵێ: لە (ابن الاعرابی) م بیست دەیفەرموو: خەسارۆمەندترینی خەسارۆمەندان ئەو کەسەیە کە کردەوە جوانەکانی لەبەر چاوی خەڵك دەکات و کردەوە ناشرینەکانیشی لەبەر چاوی ئەو کەسەی کە لە خوێن بەرەکانی لەش نزیك ترە لێیەوە دەیکات.

گەندەڵی ڕووی لەم جیهانە پێشکەوتووە مادەیەی ئەمڕۆمان کردووە.. کەس بەردێك ناخاتە سەر بەردێك تا سوپاس نامەیەك یان ئافەرینێك یان شاباشێك نەکەیت بەگیرفانیدا! بەڵام ئای کە پێویستمان بە زیندوراگرتنی ئیخلاص و دڵسۆزیە..

ئیخلاص و دڵسۆزیش لە فرۆشگەی ئیسلامی عەزیزدا دەست دەکەوێت و بەس، خواناسیو ڕۆژوو نوێژ و حەج و زەکات بەرپا دەکات بەبێ ئەوەی کەس زۆری لێ بکات!. خێر و دەست بڵاوەو کەسیش پێی نازانێت!. دڵی پاك ڕاگرتووە و ڕقی لە کەس نیە و حەسودی بە کەس نابات بەبێ ئەوەی کەس چاودێر بێ بەسەر دڵیەوە جگە لە خوای پەروەردگار!

ئای کۆمەڵگەی ئینسانی پێویستیان بەم کاڵا گران بەهایە هەیە کە ئەوە علی کوڕی حسین ی کوڕی علی یە — خوایان لێ ڕازی بێ — بەم دەست و بەو دەست و بە نهێنی و لە شەوەکانداو پارەی دەنارد بۆ بێوەژن و نەدارەکانی شاری مەدینەی پڕ لە نوور ئەمە چۆن زانرا ئەو هەستاوە بەو کارە؟

---

١ الجامع لشعب الايمان (١٠/٣٧٩).

* عن محمد بن اسحاق قال: كان الناس من أهل المدينة يعيشون ولا يدرون من اين كان معاشهم فلما مات– علی بن الحسين – رحمهما الله – فقدوا ما كانوا يؤتون به فی الليل).[١]

واتە: محمدی كوڕی ئیسحاق دەڵێ: كۆمەڵێ خەڵكی شاری مەدینە پارەیان بۆ دەهات و ژیانیان پێ دەبردەسەر بە خۆشی، بەڵام هەرچیان دەكرد نەیاندەزانی كێیە وا خێرومەندێكی ئاوا مەزنە و حەز ناكات كەس پێ ی بزانێت و سوپاسی بكات و لە كوێوە دێت بۆیان نەیاندەزانی!

بەڵام ئەو ڕۆژەی كە علی كوڕی حسین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) كۆچی دوایی كرد دەبینن لەو ڕۆژە بە دواوە ئەو هاوكاریەیان نەما بەوەدا زانیان كە (عەلی) بووە لە شەودا گەڕاوە بەسەریاندا و هەر ماڵە و تورەكەیەكی بۆ هەڵداوەتە ژوورەوە.

برای صالْحم ئەوەت لە یاد بێت كە هەر شتێك و هەر چاكەیەك لەبەر خوا نەكرێت و بۆ مەبەستی تر و بە نیازی ترەوە بكرێت، ئەوە كاتیە و ڕۆژێ دێ تاقەتی لێی نامێنێ و وازی لێ دێنێ چونكە ئیشی پێی نامێنێت،، ئەم ڕاستیەش محمدی كوڕی حەنەفیە لە ڕستەیەكی كورتدا دەری بڕیووە:

* عن محمد بن الحنفية – رضي الله عنه – قال: كل مالا يبتغي به وجه الله يضمحل).[٢]

واتە: هەر چاكەیەكی چاك یان كردەوەیەكی جوان یان شیرین لەبەر خاتری خوا و پاداشتی ڕۆژی دوایی نەكرێت ئەوە شتێكی كاتییە و لەناو دەچێت و نامێنێت.

برا و خوشكم، هەرگیز نەڵێن من دڵی خۆم دەناسم و لە ڕیاكاری خاڵییە، سوپاس بۆ خوا لەبەر ئەم و ئەو هیچ چاكەیەك ناكەم و تەنها لەبەر خاتری خوا و ڕەزامەندی ئەو دەیكەم ئیتر بە ڕۆژو بێت لەملا و لەولا باسی دەكات و ئەگەر قورئان خوێن بێت دەڵێ لە خەتمەكەمدا لە فلان شوێندام!..

---

١ صفة الصفوة (٦٨/٢).

٢ هەمان سەرچاوە (٥٥/٢).

ئەوەی زۆر بیّ خەم بێت لە ڕیا و ڕووپامایی ئەوە نزیکترین کەسە لێیەوە وەك ئەبی لوبابە (خوای لیّ ڕازی بێت) ئەم ڕاستیە دەدرکێنێت و پێمان دەڵیّ:

* عن الأوزاعي عن عبد بن ابي لبابة – رضي الله عنه – قال: ان اقرب الناس من الرياء، آمنهم له).[1]

واتە: ئەبو عەمر الاوزاعی دەگێڕێتەوە لە (عبد)ی کوڕی (أبی لبابە) (خوای لیّ ڕازی بێت) و دەڵیّ: نزیکترین کەس لە پەتای ڕیابازیەوە ئەو کەسانەن کە بێخەمن لێی و وا دەزانن ڕیا زۆر دوورە لێیانەوەو بۆ ڕیا هەرگیز هیچ چاکەیەك ناکەن.

دەرمان خانەی سەرمەشقانمان لە پیاوچاکان و صالحانی ئەم ئومەتە پڕە لە نموونەی کردەیی دەربارەی شارینەوەی کاری چاکەیان لە خەڵکی لە ترسی ڕیا و ڕووپامایی و هاوبەش پەیداکردنی بچووك بۆ خوا، ڕۆژێك (حذیفة) (خوای لیّ ڕازی بێت) دڵی نەرم دەبێت و لە نوێژدا دەگری:

* عن الاعمش قال: بكى حذيفة في صلاته، فلما فرغ التفت فاذا رجل، فقال له: لا تعلمن بهذا أحداً).[2]

واتە: ئەعمەش دەڵێت: جارێکیان حوزەیفە (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) لە نوێژدا دەستی کرد بە گریان و فرمێسك ڕشتن، کاتیّ لیّ بوویەوە لە نوێژەکەی لای کردەوە دەبینیّ پیاوێك سەیری دەکات و بە حاڵی زانیووە، بۆیە بە هەڵە دەوان پێی وت: ئەم شتەی کە ئێستا دیت – کە من گریام – لای کەس باسی نەکەیت.

* عن منذر عن الربيع بن خيثم – رحمه الله – إنه قال لأهله: اصنعوا لي خبيصاً، قال: وكان يكاد لايشتهي عليهم شيئاً – قال: فصنعوه، قال: فارسل الى جارٍ له مصاب، قال: فجعل يأكل ولعابه يسيل، قال: فقال اهله: مايدري هذا ما يأكل، فقال الربيع: لكن الله عز وجل يدري).[3]

---

١ صفة الصفوة (٢/٧٢).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٣١٢).

٣ هەمان سەرچاوە (٢/٤١).

واتە: مونزیر لە زانای خواناس – ڕەبیعی کوڕی خەیسەم – ەوە دەگێڕێتەوە کە داوای کردبوو لە خێزانەکەی خۆی: کە چێشت و گۆشتێکی خۆش لێ بنێ – ئەمەش سەیر بوو لە لایان چونکە زۆر بە دەگمەن داواکاری ئاوای لێ کردبوون – ئەوانیش بە پێخۆشحاڵیەوە دروستیان کردو دەڵێ: ئەویش ناردی بە دوای دراوسێیەکیدا کە نەخۆشیەکی لەگەڵدا بوو تا نانی لەگەڵدا بخوات، دەڵێ: کاتێ ئەو پیاوە نەخۆشە نانی دەخوارد لیك بە دەمو لێویدا دەهاتە خوارەوە، دەڵێ:ماڵەوەی پێیان وت: (چ پێویستی دەکرد ئەم خواردنە شاز و خۆشەمان پێ دروست بکەیت بۆی! خۆ ئەو هەر نازانێ ئێستاچی دەخوات؟! ڕەبیع لە وەڵامدا فەرمووی: دەی خوای – عز وجل – خۆی دەزانێت!.

خواناسێکی تر ناوی ئەبو حازمە و وانەیەکی کورت و پوختمان دەداتێ و لەم بارەیەوە پێمان دەڵێ:

* قال سفيان بن سعيد قال ابو حازم – رحمه الله – اخف حسنتك كما تخفي سيئتك ولا تكونن معجباً بعملك، فلا تدري اشقي انت ام سعيد).[1]

واتە: سوفیانی کوڕی سەعید دەڵێت: ئەبو حازم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: چاکەکانت بشارەوە وەك چۆن گوناهەکانت دەشاریتەوە، هەرگیز بە کردەوە چاکەکانی خۆتدا مەنازە، چونکە تۆ لە قیامەتدا بەختەوەر دەبیت یان ڕەنجەڕۆ؟!.

* قال ابراهيم السائح كنت في مصر فقال لي – ابراهيم بن أدهم – رحمه الله – يا أبا إسحاق! إعبدوا الله سراً حتى تخرج على الناس يوم القيامة كميناً).[2]

واتە: ئیبراهیمی سائح دەڵێ: لە میسر بووم – ئیبراهیم ی کوڕی ئەدهەم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی وتم: ئەی ئەبا ئیسحاق! زۆر بە نهێنی خواناسی بکە تا لە ڕۆژی قیامەتدا لە ناکاودا بۆ خەڵکی مەحشەر دەرکەویت کە لە صالّحان بوویت لە دنیا.

---

١ الجامع لشعب الايمان البيهقي (١٠/٣٣٨).

٢ هەمان سەرچاوە (١٠/٣٤٠).

ئایا تۆیش پێت ناخۆشە و تورە دەبیت کاتێ هەواڵی شەونوێژ و ڕۆژووە سوننەتەکانت لێ بپرسن؟ یان خۆشحاڵ دەبیتو بە زیادەوە بۆیان باس دەکەیت؟ دەی گوێ بگرە بۆ پیاوچاکەکەی مێژووی ئەم ئوممەتە موبارەکە، کە ناوی (تەمیم الداری)یە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

* عن يزيد بن عبدالله قال: قال رجل لتميم الداري – رحمه الله – ما صلاتك بالليل؟ فغضب غضباً شديداً ثم قال: والله لركعة اصليها في جوف الليل في سرّ أحب الـيّ من ان اصّلي الليل كله ثم اقصه على الناس).[1]

واتە: یەزیدی کوڕی عبدالله دەڵێ: پیاوێك بە (تەمیم الداری) وت: چەند ڕکات نوێژ دەکەیت لە شەودا؟ مامۆستا تەمیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زۆر زۆر تورە بوو، پاشان وتی سوێند بە خوا یەك ڕکات نوێژ بکەم لە ناو جەرگەی شەودا و بە دزی هەموانەوە لە لام باشتر و پێم خۆشترە لەوەی شەوەکە بە تەواوەتی شەونوێژ بکەم و بەلام بەیانی باسی بکەم بۆ خەڵکی.

ئەمەش عامری کوڕی (عبدالله)یە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەمان وانەمان پێ دەدات بەلام بە شێوازێکی تر:

* عن عبدالله بن الشخير قال: كنا نأتي عامر بن عبدالله وهو يصلي في مسجده فاذا رآنا يتجوز في صلاته ثم انصرف فقال لنا: ماتريدون؟ وكان يكره ان يروه يصلي).[2]

واتە: عبدالله ی کوڕی شەخیر دەڵێ: لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەچووین بۆ ماڵی مامۆستا عامری کوڕی عبدالله – ڕحمەتی خوای لێ بێت – لە سوژدەگاکەی ماڵەوەیدا بۆ خۆی نوێژی دەکرد و هەر کاتێ بیزانیایە هاتووین بۆ لای نوێژەکەی کورت دەکردەوە و سەلامی دەدایەوە و دەهات بۆ لامان و پێی دەوتین: بۆچی هاتوون؟ چونکە زۆر پێی ناخۆش بوو خەڵکی پێی بزانن نوێژ دەکات.

برای موسڵمانم.. خوشکی باوەڕدار.. با ئەم وەرزشە قورس و گرانە ئەنجام بدەین کە لە شناوکردن قورسترە.. بەلام ئەگەر نەیکەین خوا بە عیزەت و جەلالی خۆی

---

١ صفة الصفوة (٢/٣٧٤).

٢ صفة الصفوة (٢/١٣٩).

سوێندی خواردووە تووشی بەلاّ و فیتنەیەکی وامان دەکات کە حیلمی حەلیم نەیەڵێت!!

ئەو وەرزشەیش.. وەرزشی خستنەیەکی دڵ و زمانمانە.. شێوازی خواناسی و بەندایەتیمان لە نهێنی و ئاشکرادا وەك یەکی لێ بکەین و ئەگەر لە نهێنیدا زیاتر بێت ئەوە باشی باشترە.. دەی با گوێ بگرین بۆ ئەو کابرایەی لە کۆڕێکی محمدی کوڕی کەعب دا چی وتووە؟

* عن ابو معشر عن محمد بن كعب – رحمه الله – قال: جاء رجل قال: إنّ ما في بعض الكتب: ان لله عباداً السنتهم احلى من العسل، وقلوبهم أمرّ من الصبر، يلبسون للناس مسوك الضأن من اللين، يحتلبون الدنيا بالدين، قال الله تعالى: اعليّ يجترئون، وبيّ يفترون، بعزتي لاتيحن لهم فتنةً تدع الحليم فيه حيران).

قال كعب بن محمد القرظي (رحمه الله) هذا – موجود – في كتاب الله (عز وجل) حيث يقول: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ (البقرة: ٢٠٤).[١]

واتە: ئەبو میعشەر لە محمدی کوڕی کەعبی (القرظي)یەوە دەگێڕێتەوە: پیاوێك هات بۆ لامان وتی: لە کتێبە ئاسمانیەکانی پێشتردا هاتووە و دەڵێ: خوای گەورە کۆمەڵێ بەندەی هەیە زمانیان لە هەنگوین شیرینترە، بەلاّم دڵیان لە ئارام گرتن تاڵترە، جل و بەرگی نەرم و نیانیان کردووە بە بەری خۆیاندا، لە ڕێگەی دینەوە دنیا دەدۆشن و بەسەر دینەوە دنیا خۆری دەکەن، خوا دەربارەیان دەفەرمووێت: بە من دەوێرن؟ من دەخەڵەتێنن؟ دەی سوێند بە عیزەت و جەلالی خۆم دەبێ تووشی فیتنەو ناڕەحەتیەکیان بکەم کە ژیرمەندانیش سەری لەبەر دەرنەکەن و سەرگەردان بن.

کەعبی کوڕی محمدیش فەرمووی: لە قورئانی پیرۆزیشدا هاوشێوەی ئەمە هاتووە و دەفەرمووێت: ((خەڵکانی وا هەیە قسەی خۆش و زمانی شیرینیان سەرسامت دەکات بەلاّم خوا شاهیدە دڵیان کرمنە و پڕە لە ڕق و کینە و ناحەزی!..

١ الجامع لشعب الايمان (١٠/٣٦٢).

دەی خوشکانم.. براکانم با پێکەوە لە تەنها خوا بپاڕێینەوە کە وەك زمـان و دەم و چاو و شورەتمانی بە موسڵمان دروست کردووە دەی دڵیشمان موسڵمان کەو بیبە بۆ خۆت ئەی (أرحم الراحمین).

خوایە لە دنیا لەسەر هەموو ناڕەحەتی و نەداری و سوکایەتیەك ئارام دەگرین بەڵام داوات لێ دەکەین تۆ عیزەت و جەلالی خۆت لەو کەسانە نەبین لە ڕۆژی قیامەتدا و لەبەر چاو ملیارەها بەشەر کارتی نامەی کردەوەکانمان بدرێنین و بڵێین ئەو هەموو سـەدیانە هێناوتە حسێب نەکراوە تۆ ڕاسبیت!! پەنا بـە خـوا.. دەی توخـوا لـەم وتەیـەی (ابـو عمران) وردبەرەوە و پاشان هەوڵ بدە لە نهێنیدا خوا زیاتر بپەرستیت تا بـە ئاشـکرا و لە ناو خەڵکیدا:

* عن جعفر قـال: انبئنـا ابـو عمـران الجـوني – رحمـه الله – قـال: تـصعد الملائكـة بالأعمال فينادي الملك: الق تلك الصحيفة، قال: فتقول الملائكة: ربنا قالوا خيراً وحفظنا عليهم، فيقول تبارك وتعالى: لم يرد به وجهي. قال: سينادي الملك: اكتب لفلان كذا وكذا مرتين، فيقول: يارب انه لم يعمله!، فيقول – عز وجل – انه نواه انه نواه).[١]

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەبو عمرانی جوفی (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) بۆی باس کردین و دەیـوت: کاتێـك فریـشتەکان کردەوەکانمـان بەرزدەکەنـەوە بـۆ لای پەروەردگار، خوای عز وجل دەفەرموێت: ئەو لاپەڕانە بدڕێنن، لایبەن!

فریشتەکانیش – سەرسام دەبن – و دەڵێن: ئـەی خوایـە گیـان کـردەوەی چـاك و وتەی خێری وتووە و ئێمەش بۆمان نوسیووە، ئەویش دەفەرموێت: ڕاستە کردوویەتی بەڵام مەبەستی ڕەزامەندی من نەبووە و تەنها لەبەر خاتری من نەیکردووە.

پاشان دەفەرموێت: بۆ فـلان کـەس دوو قـات ئـەو کردەوە چـاکەی بـۆ بنووسـن، دیـسان فریـشتەکان سەرسـام دەبنـەوە و دەڵـێن: خوایـە، ئـاخر هیـچی نـەکردووە؟! خـوایش لـە وەڵامیانـدا دەفـەرموێت: بـەڵام نیـەتیان هـەبوو بیکـەن..نیـەتیان هـەبوو بیکەن.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٧٨).

مەرجی صالّحان زۆر قورسن تا لە ناو کاروانە موبارەکەکەیان وەرمان بگرن و دەبێت زۆر بە وردی و بە ئاگاداریەوە چاکە بکەین و بچووکترین نیەتی تری تێکەڵ نەکەین، نەك هەر ئەوە بەڵکو شەیتان لە ڕێگەیەکی واوە بۆمان دێت کە خۆمان هەستی پێ ناکەین و بە گوناهی نازانین وەك ئەم دوو مەرجەی صالّحان:

* قال موسى بن اسماعيل: سمعت سفيان بن عُيينة يقول: اصابتني ذات يوم رقة فبكيت، فقلت في نفسي لو كان بعض اصحابنا لرق معي ثم غفوت: فأتاني آت في منامي فرفسني وقال: يا سفيان خذ أجرك ممن احببت ان يراك.[1]

واتە: موسای کوڕی جەعفەر دەڵێ: بیستم لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە دەیفەرموو: ڕۆژێکیان هەستم کرد دڵم نەرم بوو بۆ خوا و گریانم بۆ هات لە ترسی پەروەردگارم، پاشان لە دڵی خۆمدا وتم: چەند خۆش بوو ئێستا یەکێ لە هاوڕێکانم لەگەڵدا بووایە و پێکەوە بگریاینایە و ئەویش وەك من دڵی نەرم ببوایە!!.. بە دەم ئەو خەیاڵەوە چاوم چووە خەو و لە خەومدا یەکێ هات بۆ لام و شەقێکی سوکی تێ هەڵدام و پێی وتم: سوفیان، بڕۆ پاداشتت لەو کەسە وەربگرە کە ئاواتەخواز بوویت لێرە بوایە و تۆی بدیایە بەم حاڵەوە.

مەرجی گەورەی صالّحان ئەوەیە کە بە دزیەوە خواناسی و شەو نوێژ بکەیت و خشوع بنوێنی و نوێژی درێژ خایەن بکەیت و ڕۆژو بگریت و ماڵ ببەخشیت و (ئەبو ئومامە) لەم بارەیەوە وانەیەکی زۆر گەورەمان دەداتێ لە ڕێگەی ڕستەیەکی بە سوودەوە:

* رأى ابو امامة الباهلي – رضي الله عنه – رجلاً في المسجد يبكى في سجوده، فقال له: انت، انت، لو كان هذا في بيتك.[2]

واتە: هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو ئومامەی باهیلی (خوای لێ ڕازی بێت) وەك عادەتی هەموو هاوەڵان لە دوای مردنی پێغەمبەرمان (ﷺ) کاری بانگەواز و تێگەیاندن و ڕاست کردنەوەی موسڵمانانیان لە ئەستۆی خۆیان گرتبوو – ڕۆژێکیان لە

---

١ صفة الصفوة (٢/١٥٦).

٢ البحر الرائق في الزهد والرقائق، (لا: ١٤٣٤).

مزگەوت بوو دەبینێ یەکێ لە نوێژگەران بە کوڵ لە ناو سوژدەدا دەگریا.. ئەمیش بە ئەسپایی چپانی بە گوێیدا و پێی وت: هێی تۆ! ئەی براکەم، بریا ئەم کارە گەورە و جوانەت لە ماڵەکەی خۆتدا بکردایە.

بەڵێ خوشك و براکانم... هەر کەسێ خوا بۆی بکات و لە ماڵەکەی خۆیدا گریانی بێت و شەونوێژ بکات و قورئان بە بەردەوام خەتم بکات و لێوەکانی بە (ذکر)ەوە خەریك بن، مەرجی سەرەتای صالّح بوونە و نیشانەی چاك بوونەوەیە لە نەخۆشی کوشندەی – ڕیابازی – بۆیە پێم خۆشە بە درێیەوە لە تاریکایی شەوێکی زستاندا خۆمان دابگرین لە زانای خواناس (ابو حلال العکی) و بزانین چۆن خۆی دڵنیا دەکات کە کەس ئاگای لێ نییە و هەمووی چووەتە خەوی خەو ئەوجا دەچووە خزمەت خۆشەویستەکەی و تا بەیانی شەونوێژی بۆ دەکرد:

* عن العيناء بنت ابي الحلال العكي قالت: اذا كان أبو حلال فوق غرفة، فيأتي بعض أبوابها فيشرف على شق من ناحية الحي فينادى: يا فلان يا فلان، ثم يقبل على الشقّ الآخر فينادى: يا فلان يا فلان، ثم يقبل على الشق الآخر فيقول مثله حتى يأتي على الأركان الاربعة، قالت: ثم يقول: ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾؟[1]

واتە: خوشکە عەینای کچی (ابی حلال العکی) دەربارەی باوکی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: هەر کاتێ ئەبو حەلال – واتە باوکی – لە شەودا لەسەربان بخەوتایە، پێش ئەوەی دەست بکات بە نوێژ لە چواردەورە ورد دەبوویەوە نەوەك یەکێ بە خەبەر بێ‌و بە شەونوێژی بزانێت بۆیە دەچووە سووچێکی سەربانەکەو هاواری دەکرد: فڵان کەس فڵان کەس – دەنگ نەبوو – ئیتر دڵنیا دەبوو کە خەوتوون، پاشان دەچووە لایەکی تری سەربانەکە و بانگی دەکرد: فڵان کەس فڵان کەس، دەچووە لاکانی تر و بە هەمان شێوە بانگی دەکردن، دەڵێ لە دوای ئەوە دەیووت: بە خوا باشە دەنگی کەس نایەت و چرپەیان نەماوە و ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾؟. و پاش ئەوە ئینجا دەستی دەکرد بە شەونوێژ کردن.

---

١ صفة الصفوة (١٥٢/٢).

ئەی برای موسڵمانی دوکاندار ئایا تۆ لە دوکان قورئان دەور دەکەیتەوە؟ دەی خۆ هەموو کەس بەو کارە چاکەت دەزانێت و لە ڕیابازییەوە نزیك دەبیتەوە! دەی بۆ چارەسەری ئەمە سەرێك بدە لە پیاو صاڵحە دوکاندارەکان کە ناوی (حسّان)ە و بزانە چی دەکات تا (ڕیا) نزیکی نەبێتەوە:

* عن عمارة بن رازان قال: كان حسان يفتح باب حانوته فيضع الدواة وينشر حسابه ويرفي سترة ثم يصلي، فاذا احس بانسان قد جاء يقبل على الحساب حتى يريه انه كان في الحساب.[1]

واتە: (عمارە)ی کوڕی (ڕازان) دەڵێ: خواناس و پیاو چاك – حسان ی کوڕی ئەبی سینان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەیانیان دوکانەکەی دەکردەوە و قەڵەم و مرەکەبەکە و دەفتەری قەرز و حساباتەکەی لەبەردەمی خۆیدا دەکردەوە پەردەیەکی دادەدایەوە و لە پشتەوە دەستی دەکرد بە نوێژکردن، و هەر کاتێ هەستی بکردایە یەکێ بۆ دوکانەکەی دێ نوێژەکەی بە پەلە تەواو دەکرد و دەستی دەدایە قەڵەم و دەفتەرەکەی تا ئەو کڕیارە وا بزانێت خەریکی حساب و کتابی دوکانەکەیەتی.

تەنانەت – صاڵحان – خوایان لێ ڕازی بێت – بە دزی خێزانەکانیانەوە دەستیان کردووە بە شەونوێژ و بە فێڵێکی حەڵاڵ کردوویانەتە خەو بە ئەسپایی لە ژێر جێگەکە دەهاتە دەرەوە و چووەتە سەر بەرماڵەکەی و چۆتە خزمەت خۆشەویستەکەی:

* عن موسى بن هلال قال: حدثني رجل كان جليساً لنا وكان امرأة حسان مولاة له قال: حدثني امرأة حسان بن ابي سنان قالت: كان يجيء فيدخل معي في فراشي، قالت: ثم يخادعني كما يخادع المرأة صبيها، فاذا علم اني قد نمت سل نفسه فخرج ثم يقوم فيصلي.

قالت: فقلت له: يا ابا عبدالله كم تعذب نفسك ارفق بنفسك، فقال: اسكتي ويحك فيوشك أن أرقد رقدة لا أقوم منها زماناً.[2]

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٢٠٠).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٠٠).

واتە: موسای کوڕی هیلال دەڵێ: پیاوێك لە ماڵمان بوو کە خێزانەکەی حەسان کاتی خۆی کەنیزەکی ئەم بووە و پاشان ئازادی کردووە دەڵێ: خێزانەکەی حەسانی کوڕی ئەبو سینان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیووت: حەسان دەهاتە ناو جێگە و خۆی دەکرد بە ژێر لێفەکەمدا و پاشان: فێڵی لێ دەکردم وەك چۆن دایك فێڵ لە منداڵەکانی خۆی دەکات، هەر کە دەیزانی من خەوم لێکەتووە لەسەرخۆ بە ئەسپایی لە ژێر لێفەکە دەهاتە دەرەوە و دەستی دەکرد بە شەونوێژ.

دەڵێ: جارێك پێم وت: ئەی باوکی عبدالله تا کەی سزا و ئەشکەنجەی لەشت دەدەیت، دەی بەزەییەکت بە خۆتدا بێتەوە. حەسانیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیووت: بێ دەنگ بە ژنەکە بێ قەزا بی یاخوا، خەریکە وام لێ دێ بە جۆرێ هەستمەوە بۆ شەونوێژ کە تا ماوەیەکی زۆر وازی لێ نەهێنم و بەردەوام بم لەسەری.

برای خۆشەویست و خوشکی داوێن پاك.. زۆر ئاگاداری پوختەکردنی کردەوە چاکەکانمان بین و لەبەر خاتری خوا، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە یەك یەك ئەیدا بەم دیو و ئەو دیودا و ئەگەر ئیخلاصی تێدا بوو دەفەرمووێت بیخەنە ئەولاوە و ئەگەر ڕیای تێکەڵ بوو دەفەرمووێت لاییەن بیخەنە ئەولاوە و ئەوە لەبەر من ئەنجام نەدراوە و وەری ناگرم:—

* حدثنا انس — رضي الله عنه — أن النبي (ﷺ) قال: يجاء باعمال بني آدم فتصب بين يدي الله تعالى يوم القيامة في صحف مختمة، فيقول: خذوا هذا! والقوا هذا! فيقولون: والله ما علمنا الاّ خيراً، قال: انّ عمله كان لغيرى، واني لا أقبل الاّ ما ابتغى به وجهي.[١]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا کردەوەکانی بەنی ئادەم دەهێنرێتە بەردەمی خوای — عز وجل — لە ناو نامەی کەبسکرا و و مۆرکراودا، دەفەرمووێت: ئەمەیان وەرگرن، بەڵام ئەمەیان فڕی دەنە ئەولاوە! و فریشتەکانیش دەڵێن: سوێند بە خوا لە چاکەکردن بەولاوە هیچی ترمان لێ نەدیوە، خوایش لە

١ رواه البخاري في (التاريخ الكبير)، (٢٧٨/٢/١).

وەلامدا دەفەرمووێت: ئەو کردەوانەی بۆ من نەکردووە و منیش تەنها ئەوانە وەردەگرم کە تەنها لەبەر خاتری من ئەنجام دراون.

لەم ڕێگا دوور و درێژەدا - ئەتوانین سوود لە زانای خواناس - (ئەبو وائل) وەربگرین کە بێ وێنە بووە لە بەردەوامی زیکر و یادی پەروەردگاریدا و چرکەی لە دەست دەرنەچووە کە (الله اکبر) یان (استغفر الله) یان (سبحان الله) یا (لااله الا الله) یان (صەلاواتدان) یان (قورئان وتنەوە بە دەم خۆیەوە) بەلام هەر کاتێ یەکێ دیاربووایە هەموو دنیات پێ بدایە یەك تەسبیحەی نەدەکرد، لەم وانەیەوە چی فێر دەبیت لەگەڵ دەروونتدا قسە و دیالۆکی لەسەر بکەن:

* عن عاصم قال: کان ابو وائل - شقیق ابن سلمة - رحمه الله - اذا خلی یسبِّحُ، ولو جعلت الدنیا علی ان یفعل ذلك وأحد یراه لم یفعل.

واتە: عاسم دەڵێ: زانای خواناس - ابو وائل - (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) برای (ابن سلمە) بوو، ئەم پیاوە هەر کاتێ تەنها بوایە بیری خوای - عز وجل - ی دەکردەوە و زیکر و یادی دەکرد، بەلام ئەگەر بیزانیایە کەسێ ئاگای لێیەتی و دەیبینێ چی دەکات، هەموو دنیات پێ بدایە تەنها زیکرێکی نەدەکرد.

کەسی وا هەیە ماوەیەکی زۆرە لە ناو کاری چاکە و خێر و بانگەوازدایە.. بەلام کۆمەڵێ مەبەست پاڵی پێوە ناوە بۆ ئەو کارانە و بە تەنها ڕەزامەندی خوا تاقە مەبەستی نەبووە بەڵکو دەستکەوتی دنیاشی مەبەست بووە وەك بەدەست هێنانی بڕوانامە یان وەرگرتنی موچە یان بەرزبوونەوەی ئاستی لە ناو لایەنێکی ئیسلامیدا یان شورەت پەیدا کردن و نازناوی گەورە و چەندان شتی تریش کە یەك دانەیان بەسە کە کردەوەکانمان وەرنەگیرێت جا وەرە کەسێك هەموویانی مەبەست بێت، ماڵ کاولی هەردوو دنیایە..

لەوانەیە کەسێك حەز بکات بزانێت ئایا لە نیوەی ڕێگەدا دەتوانرێت نیەت بۆ خوا یەکلایی بکرێتەوە، بێگومان بەڵێ و هەموو ئەو ماوەیەشی لێ وەردەگیردرێت و جاڕی خۆشەویستی و ڕاستگۆیی بۆ دەدرێت لە لایەن خواوە.

ڕۆژێك یەکێکم دی لەو کەسانەی عەرەق خۆرن و زۆربەی کات سەرخۆشن، هات بەسەیارەکەیەوە لە پاڵمدا وەستا و بەگەرمی تەوقەی لەگەڵدا کردم و منیش پێم ووت:

توخوا ئیتر بەسە سەرپێچی کردنی خوا و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا؟ سەرێکی باداو ووتی: ان شاء الله. خوا بۆم بکات ڕۆژێ بێ منیش بێمە ڕیزی ئێوەوە.. منیش دوای خوا حافیزی له دڵی خۆمدا ووتم ئەم پیاوە لەگەڵ خوادا ڕاست دەکات چونکە دەڵێ نایشارمەوە و بەئاشکرا گوناه دەکەم و هەر کاتێ تەوبەم کرد بەئاشکرا و بەتەواوەتی پابەند دەبم بەئیسلامەوە .

بەڵام ئەوانە ترسناکن کە بەڕواڵەت خاوەنی ڕەوشتی جوان و ئاکاری بەرزن و هەردەم لە مزگەتدا دەبینرێن کەچی ناو دڵی بکەیتەوە پڕیەتی لە ڤایرۆسی دەم پیسی، دڵپیسی، دەست پیس و چاو لەوەڕێن بۆ حەرام و گوێ کر بۆ گۆرانی بۆگەن و ڕەوشت کوژ! !

دەی بۆچی گوێ نەگرین بۆ پیاو چاك و صاڵحی ئومەت – فضیل ی کوری عیاض– ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە گوناه کردنی پێ خۆشترە لە چاکە کردن لەگەڵ ڕیادا دەی گوێی لێ بگرە لەم ووتە بە نرخەیدا:

* حدثني بشر بن حارث قال سمعت فضيل بن عياض – رحمه الله – يقول: ( لأن آكل الدنيا بالطبل والمزمار احب اليّ من ان اكلها بديني).[1]

واتە: بشری کوڕی حارث دەڵێ: لە (فوزەیل ی کوڕی عەییازم بیست) –ڕەحمەتی خوای لێبێ – دەیفەرموو: خەریکی بەدەست هێنانی دنیا (پارە و پول و شورەت و نازناو و ئاستی بەرز بم) لە ڕێگەی تەپڵ و مۆسیقاوە پێم خۆشترە لەوەی هەوڵی دەسکەوتنیان بدەم لە ڕێگەی ئیسلامەکەمەوە وکاری خواناسی و بەندایەتیمەوە.

بەڵام – برا و خوشکەکانم – دەخیلتان بم، نەکەن لە ترسی ئەوەی تووشی ڕیا و ڕوپامایی نەبن واز لە هەندێ کاری چاکە بهێنن، چونکە گرنگ ئەوەیە دڵتان یەکلایی بکەنەوە بۆ خوا لەو کارە چاکانەی پێی هەڵدەستن، ئەگینا هەندێ کار هەیە سروشتەکەی وایە دەبێت لەناو کۆمەڵگەدا ئەنجامی بدەیت و ئەوان چاوت لێ بکەن و تۆ سەرمەشقیان بیت:

---

١ الجامع لشعب الايمان – (٣٤٩/١٠).

* عن حيثمه عن الحارث بن قيس الجعفي قال: اذا هممت بخير فلا تؤخره واذا اتاك الشيطان فقال: انك ترائي فزدها طولاً).[١]

واتە: حەیثەمە لە حارث ی کوڕی قەیسی جەعەفی یەوە دەڵێ : هەر کاتێ نیازی کردنی کارێکی خێرت هەبوو دوای مەخە و هەستە بەکردنی، و ئەگەر شەیتانی نەفرین لێ کراوێش – پێ ی ووتی: بۆ ڕیابازی ئەم کارە دەکەیت تۆ درێژتری بکەرەوە و گوێ بەو وەسوەسەیە مەدە.

عن ابی جعفر الحذاء قال: سمعت ابن عيينة يقول: اذا وافقت السريرة العلانية فذلك العدل، واذا كانت السريرة افضل من العلانية فذلك الفضل، واذا كانت العلانية افضل من السريرة فذالك الجور).[٢]

واتە: ابو جەعفەر الحذاء دەڵێ: گوێم لێ بوو سوفیانی کوڕی عویینە – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەیووت: ئەگەر نهێنی مرۆڤی موسڵمان و ئاشکراییەکانی وەك یەك وابوون ئەوە عەدل و ڕێك و پێکیە و بەڵام ئەگەر کارە نهێنیەکانی لە کارە ئاشکراکانی باشتر بوو ئەوە ئەوپەڕی چاکیە و فەزڵە.

بەڵام خوانەکردە ئەگەر کارە ئاشکراکانی لە کارە نهێنی یەکانی باشتر و زیاتر بوو ئەوە ئەوپەڕی ستەم کاریە.

ئامۆزا بەغیرەت و زاناکەی پێغەمبەری سەروەرمان سێ نیشانەی دیاری کردووە بۆ ئەوکەسانەی دووچاری نەخۆشی ڕیابازی دەبن و بەو سێ نیشانەیەدا دەناسرێنەوە:

* قال علي بن ابي طالب – رضي الله عنه – للمرائي ثلاث علامات: يكسل اذا وحده، وينشط اذا كان في الناس، ويزيد في العمل اذا اثني عليه، وينقص اذا ذمّ به).[٣]

واتە: ئەمیری باوەڕداران – علی کوڕی ئەبو طالیب– خوای لێ ڕازی بێ– دەفەرمووێت: ڕیاباز بە سێ نیشانەدا دەناسرێتەوە: یەکەم ئەگەر تەنها بێت زۆر تەمەڵە لە عیبادەت و خواناسیدا ، دووەم: ئەگەر لەناو خەڵکیدا بێت زۆر چالاکە، سێیەم: ئەگەر وەسفی چاکەی بکەیت زیاتر کردەوەی چاك دەکات و ئەگەر سەرزەنشتی بکەیت چالاکی سست دەبێت.

---

١ صفة الصفوة (٢/٤٧).

٢ صفة الصفوة (٢/١٥٦).

٣ علي بن ابي طالب – للدكتور الصلابي (لا:٢٦١).

# پێنجەم

## صاڵحان خۆیان لە ڕیابازی پاراستووە:

هەموو بەرنامەیەك لەم ژیانەی دنیایاماندا لە سەرەتادا کۆمەڵێ بنەمای ڕاست و دروست و جوان و سادەیە.. بەڵام بەتێپەڕبوونی زەمەن و دەستکاری کردنی بنەماکانی ئەو بەرنامەیە لە لایەن زانا و خوێنەوارانیەوە وردە وردە لە سکەکەی خۆی دەیترازێنن و بەلای چەپ یان بەلای ڕاستدا دەیبەن و ئەگەر زەمەنەکە دوور و درێژ بێت وای لێ دەکەن لە شتێکی تر بچێت. ئەمە لە بەرنامە دەستکردەکانی مرۆڤدا.

ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش دەستکردی مرۆڤەکان نیە کە ژیرمەند و زاناکانیان بۆیان هەبێت لێی زیاد دەکەن یان لێی کەم بکەنەوە و بیگۆڕن. بەڵکو بەرنامەکە لە سەردەمی پێغەمبەری سەروەرماندا (ﷺ) تەواو تەکمیل بوو بە شاهیدی خوای گەورەو ئایەتی قورئان:

* ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾.[1]

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت پێمان ئەمڕۆ ئاینەکەتانم تێر و تەسەل و تەواو کرد و هەموو بەخششەکانی خۆم ڕژاند بەسەرتاندا و ڕازی بووم ئاینی پیرۆزی ئیسلام ببێتە ئاین و بەرنامەی ژیانتان.

کەواتە هێنانە کایەی هەر بیدعەیەك یان زیادەڕەویەك لە فەرمان و ئەرکە ئاینییەکاندا مانایەکی زۆر ترسناکی هەیە کە ئەوەش ئەوەیە ئەم ئاینە نوقستانە و ئەو بە خەیاڵی خۆی – پەنابەخوا– تەواوی دەکات کەواتە هەر زیاد کردنێك یان تێکەڵ کردنی ئارەزواتی مرۆڤەکان بە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر شتێکی خراپ و گومڕا ئامێزە ئیتر با خاوەنەکەشی بڵێ شتێکی چاکە و پێویستە ئەم زیادکردنە! نەخێر ئەگەر چاك و پێویست بوایە خوا و پێغەمبەر بڕیاریان لەسەر دەدا چونکە:

---

١ سورة المائدة، (الآية: ٣).

* قال الله تعالى: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾[١]

واتە: خوای تۆ هیچی لە بیر ناچێت و هەرچی سود و کەڵکی مرۆڤەکانی تێدا بووبێت بۆ هەموو سەردەمەکان بەبێ سێ و دووکردن قورئان هێناویەتی و فەرموودەش پاڵپشتی بووە لەو کارەدا..

لە ژیاندا هەموو شتێك قابیلی ئەوەیە کەبەرەوپێشی بەرین و زیادی بکەین و هەمیشە کاری ئەمڕۆمان دەبێت لە کاری دوێنێمان جوانتر بێت و پێشکەوتووتر بێت.. بەڵام دەخیلە .. تەنها ئیسلام بەرنامەی داڕێژراوی خوایە و بۆ من و تۆ و هیچ کەسی تر نیە لێی کەم بکەینەوە یان بۆی زیاد بکەین.. بەڵام هەندێ کەس لە موسڵمانان – پەنا بەخوا – هەر ڕۆژەی شتێك زیاد دەکەن لە ناو هەموو کارە شەرعی و پەرستشیەکاندا وەك نوێژ و بانگ و قامەت و ڕۆژو و حەج و صەلاوات دان و قورئان خوێندن و زیکر کردنەکاندا.. بەڵام کاتێ بە شێوەیەکی برایانە و خۆشەویستانە دەست دەکەیتە ملیان و پێیان دەڵێیت: لە پێناوی چیدا ئەم کارە دەکەن بۆچی بەو جۆرە دینداری ناکەن کە محمد (ﷺ) و خەلیفە ڕاشیدەکان و ئەصحابی بەدر و سەرجەم هاوەڵان کردیان و بە هۆیەوە خوایش لێیان ڕازی بوو؟ دەی ئیتر براکەم تۆ لەوە زیاتر چیت دەوێت ئەوان بەو ئاینداریە پاکە بێ غەل و غەش و دوور لە بیدعە و زیادەکاریەوە بەهەشتیان بۆ خۆیان پچڕی دەی ئیتر تۆ بە تەمای چیت و نیازت چیە بەم دەستکاریکردنی بانگ و قامەت و سەرجەم شەعائیرەکانی تری ئیسلام؟

لە وەڵامدا دەڵێت: ئێمە بە نیازی خۆمان گوڵ دەچێنین و چاکە دەکەین و لە بەرژەوەندی خودی ئیسلامە کە ئەو کارانە دەکەین! ! و نیەتمان پاکە!

دەی برای موسڵمانم زۆر خەتەرە! زیادکردنی بڕگەیەك بۆ دین یان کەمکردنەوەی – ئیتر با وابزانی خوا غەزەبت لێ ناگرێت ئەگەر نیەتت پاك بێت، سوڕەتی کەهفت خوێندۆتەوە؟ دەی گوێ بگرە بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە:

---

١ سورة مريم، (الآية: ٦٤).

* قـــال الله تعـــالى: ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴾.[1]

واتـە: خەسارۆمەندترین کەسـتان پـێ بناسـێنم؟ دەی ئـەو کەسـانەن کـە هـەموو ماندووبوون و هەوڵ و تەقەلاّی دنیایان بـە زایـە دەچێت و سـوودیان پـێ ناگەیـەنێت! کەچی خۆیـان بـە نیـازی خۆیـان وایـان زانیـووە خێریان دەگـات و لـە خـوا نزیکیـان دەکاتەوە!

زۆربەی ئەو کەسانەی بیدعەکاری دەکەن دەڵێن: زیـانی نیـە و وا دەزانـین شـتێکی چاك دەکەین و بیدعەکە حەسەنەیە!! پەنا بە خوا!

خوێنەری خۆشەویستم، من نووسەرم بۆ هەموو لایـەك – و هـەرگیز نـامبینی لەبـەر غەرەزێك یان تەرەفگیریەك – شـتێکت بـۆ بنووسـم و تـۆی پـێ نیگـەران بکـەم بـەڵکو منـیش فەقێیـەکی لاوازی حوجرەکـەی پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) و لـە فـەرموودە صەحیحەکانی ئەوەوە قسەی دۆستانە و برایانەت بـۆ دەکـەم، بۆیـە ئـەم فەرموودەیـە باش لەبەر بکە و لە ناو دڵ و مێشکدا جێگەیان بکەرەوە:

* عن عائشة – رضي الله عنها – قالت: قال رسول الله (ﷺ): (من أحـدث في أمرنـا هذا ماليس منه فهو ردّ).[2]

واتە: عائشەی کچی ئەبو بەکری صدیق (خوایان لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێ شـتێکی نـوێ دابهێنـێ و تێکـەڵی ئـەم ئاینەی ئێمەی بکات کە لەم ئانەدا نەبێت ئەوا خوا لێی وەرناگرێت و دەیداتەوە بە نـاو چاویدا و پاداشتی ماندووبوونەکەی مایە پووچی و سەرگەردانیەتی لە ڕۆژی قیامەتدا.

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بەرنامەیەکی تێر و تەسەلی وای هێناوە کە پێویست بە زیادکردنی ناکات و دروست نییە بڵێین: با فلاّن برگەی بۆ زیاد بکـەین یـان بـا فـلاّن برگەی لێ لابەین..

---

١ سورة الكهف، (الآية: ١٠٤).

٢ متفق عليه، رياض الصالحين، (لاپەڕە: ٥٩).

من لێرەوە ئەرکی سەر شانمە ئەو موسڵمانە خۆشەویستانەم ئاگادار بکەمەوە کە واز لەو کارە بێنن.. ئەوە لە ڕیزی صاڵحان دەیانباتە دەرەوە، و نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لە شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێ بەش دەبن و ناویشیان نییە لەسەر یەك بەرداخ لە بەرداخەکانی سەر حەوزی کەوسەر و دە گوێ بگرە با ئەم فەرموودە (صحیح)ەت بخەمەوە یاد و دڵنیایشم تۆش وەك من لەگەڵ بیدعەدا بەینت تێك دەچێت إن شاء الله:-

* قال رسول الله (ﷺ): أنا فرطتكم على الحوض وليختلجنّ رجال دوني فاقول: يارب أصحابي! فيقول إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك.[1]

واتە: پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) باسی مەشهەدێکی غەمناك و ناهەمواری ڕۆژی قیامەتمان بۆ دەکات کە تیایدا کۆمەڵێك لە موسڵمانان بەرەو ئاگری دۆزەخ دەدرێنە بەر و بۆ پێغەمبەرەکەشیان نییە کە تکایان بۆ بکات و دەفەرمووێت من لای حەوزی کەوسەردا چاوەڕوانتان دەکەم و دەستەیەك لە ئومەتەکەم دەیانەوێت بێن و ئاو بخۆنەوە فریشتەکان ڕێیان نادەن و بەرەو دۆزەخ پاڵیان پێوە دەنێن و (رحمة للعالمين)یش خۆی پێ ناگیرێت و هاوار دەکات: ئەوانە ئوممەتی منن وازیان لێ بێنن.

و فریشتەکانیش لادەکەنەوە بۆ لای و بە شێوەیەکی ناز پێی دەڵێن: بەڵێ ئوممەتی تۆن، شوێنکەوتەی تۆن بەڵام تۆ نازانی دوای وەفاتی تۆ و لە سەردەمەکانی داهاتوودا چی شتیان داهێناوە و تێکەڵیان کردووە بە کانیاوە زوڵاڵەکەی ئیسلام!.

(ابن عمر)یش (خوای لێ ڕازی بێت) زۆر لەم فەرموودەیە ترساوە و هەمیشە پەنای گرتووە بە خوا کە یەکێك بێت لەو کەسانەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە پێغەمبەری خوا و هاوەڵە بەڕێزەکانی جیابکرێتەوە و لەگەڵ ئەواندا حەشر نەکرێت و ئەم وتە جوانەی لەبیر مەکە تا لە ژیانتدایت:

* عن محمد قال: نبئت ان ابن عمر – رضي الله عنهما – كان يقول: (اني لقيت أصحابي على أمر، واني اخاف ان خالفتهم ان لا الحق بهم).[2]

---

١ حديث صحيح رواه المالك في الموطأ (١/٢٨-٢٩).

٢ صفة الصفوة (٢/١٦٠).

واتە: محمد دەڵێ: پێم گەیشتووە لە عبداللە ی کوڕی عومەری کوڕی خەتابەوە (خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت) کە دەیفەرموو: من لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێمدا ژیاوم کاتی خۆی لەسەر کۆمەڵێ ڕێنمایی و سوننەتی بەرز و دروست بووین، زۆر دەترسم کە پێچەوانەی ئەوان کار بکەم لە دینداری کردنمدا و ئەوەش ببێت بە هۆی ئەوەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا نەگەم پێیان و لێیان ببڕێم.

خۆشەویستانم... هەوڵ مەدە ئیسلام بۆیاخ بکەیت و بە میکیاجی بیدعە و شتی داهێنراو جوانی بکەیت.. بەڵام ئیسلام هاتووە من و تۆ جوان بکات... ئیسلام خۆی جوانە و وەك خۆر و مانگ و ئاسمان و زەوی و چیاکان جوان دروست کراوە.. نەکەیت دەخیلت بم جگە لە قورئانی پیرۆز و سوننەت و ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی تر زیاد بکەیت – بە نیەتی ئەوەی گوایە خەڵکی پێ دەهێنێتەوە بۆ لای ئیسلام و خەڵکیش گوێ بۆ قورئان و سوننەت ناگرن لەم ڕۆژگارەدا!!

با پێکەوە لەبەردەم یەکێ لە صاڵح و خوا ناسی ئومەتەکەمان (ابن ادریس الخولانی)دا بوەستین و بزانین لەم بارەیەوە وانەیەکمان پێ دەدات و لە هاوەڵە مەزنەکەی پێغەمبەرمانەوە(ﷺ) (معاذی کوڕی جەبەلەوە) شتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە؟:–

* عن ابن ادریس الخولانی – رحمه الله – عن معاذ بن جبل – رضی الله عنه – قال: ((ان یأتی یوم یقول القائل : مالی اقرأ علی الناس القرآن فلا یتبعوني علیه فما أظنهم یتبعوني علیه حتی ابتدع لهم غیره، ایاکم وایاکم وما ابتدع فان ما ابتدع ضلالة).[1]

واتە: (ابن ادریس الخولانی ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕێتەوە –خوای لێ ڕازی بێ – فەرموویەتی: لەوانەیە ڕۆژێك بێتە پێشەوە کەسێك بڵێت: نازانم هۆی چیە قورئانی پەروەردگار بەسەر خەڵکیدا دەخوێنم کەچی شوێنم ناکەون و گومانیش نابەم شوێنم بکەون مەگەر شتی تازەیان بۆ بهێنمە ناو ئاینەکەوە جگە لە قورئان!!..

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٥٤).

دەخیلتـان بم.. دەخیلتـان بم.. نزیکـی بیدعـە و داهێنـراو مەبنـەوە چـونکە ئـەوە چڵەپۆپەی سەر لێ تێکچوون و گومڕاییە.

هەروەها یەکێ لە (عبدالله) مەزنەکانی ئیسلام (خوا لێی ڕازی بێ) وەك موعاز ڕامان دەوەشێنێ و لە کۆمەڵێ قسەی بێ مانا ئاگادارمـان دەکاتـەوە وەك پـێم وایـە وا بـانگ بدرێ! یان وا بە جـوان دەزانم وا بـە ڕۆوبـین!! یـان وای بـۆ دەچـم ئـاوا نوێـژ بکـرێ باشە!!.. دووبار دەخیلتبم واز لەم وشانە بێنە:

* اخرج الطبراني في الكبير عن ابن مـسعود – رضـی الله عنـه– قـال: ایـاکم ورأیـت وأرأیت فانما هلك من كان قبلكم برأیت وأرأیت).[١]

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود –خوا لێی ڕازی بێ– یەکێکە لـە هاوەڵـە پێـشینە و گەورە زاناکانی ئیسلام و ئاگادارمان دەکاتـەوە لـە بـەکارهێنانی عـەقڵ و بۆچـوون لـە بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسڵماندا و دەفـەرموێت ((دەخیلتـان بم دووربـن لـە پـێم وایـە و وای بۆدەچم! چونکە ئومەتەکانی پێش ئێوە بە پێم وایە و وای بۆدەچم خوای گـەورە لە ناوی بردن.

ئەمەش سوفیانی کوڕی سەوریە و وەسیەت دەکـات بۆمـان کـە تـا بۆمـان دەکرێـت لەگەڵ ئەو کەسانەدا سوننەت جێ بەجێ دەکەن باش بین و پشتیان لـە زەوی نـەدەین و قسەیان پێ نـەڵێین و لـەناو خەڵکدا سوکیان نەکـەین چـونکە ئەوانـە غـەریب و بـێ کەسن!:

* عـن سـفیان الثـوري – رحمـه الله – قـال: (استوصـوا بأهـل الـسنة خـیراً فـانهم غرباء).[٢]

واتە: زانای مەزنی فەرموودەناس – سوفیانی سەوری – ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ– دەرفەمووێ: تا بۆتان دەکرێت – براکانم– باش بن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت هـەنگاو بـە هـەنگاو لەگـەڵ سـوننەتدا بـن – خۆیـان بـە دوور دەگـرن لـە بیدعـە و داهێنراوەکان – چونکە ئەو کەسانە غەریب و بێکەسن لەناو موسڵماناندا..

---

١ هەمان سەرچاوە (٨٣/١).

٢ البحر الرائق في الزهد والرقائق، (لا: ٢٤).

ئەکەی خوشك و برای موسڵمانم .. بلێی بیدعە دوو جۆرە – یەکەم – حەسەنەیە و دووەم سەییئەیە ! ! بەڵکو هەمووی سەیئەیە چونکە دەستکاری کردنی بەرنامە تێر و تەواوەکەی پەروەردگارە..

زاناکان هەموویان دژی بیدعەی حەسەنەن و ئەو وتانەی دژی بیدعە دەری دەبڕن مەبەستیان بیدعەی حەسەنەیە.. ئەگینا منالێکیش دەزانێت بیدعەی سەیئە حەرامە با هەر نیەتێکی هەبێت..

دەی با بچینەوە خزمەت عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) بزانین دەربارەی ئەو کەسانەی زیکری خوا دەکەن، بەڵام لەسەر شێوازی پێغەمبەر نا بەڵکو لەسەر شێوازێکی داهێنراوی نوێ با بزانین چیان پێ دەڵێت و چیش بە ئێمە دەڵێت؟:

* اخرج الطبراني في الكبير عن عمر بن سلمة قال: كنا قعوداً على باب ابن مسعود بين المغرب والعشاء، فأتى ابو موسى الاشعري – رضي الله عنه – قال: اخرج الينا يا ابا عبدالرحمن، فخرج ابن مسعود فقال: يا ابا موسى ما جاء بك في هذه الساعة؟

فقال: لا والله، الا اني رأيت امراً ذعرني وانه لخير ولقد ذعرني، وانه لخير قوم جلوس في المسجد ورجل يقول لهم: سبحوا كذا وكذا، احمدوا كذا وكذا! قال: فانطلق عبدالله وانطلقا معه حتى أتاهم فقال: ما أسرع ما ضللتم واصحاب رسول الله احياء وازواجه شواب وثيابه وانيته لم يتغير، إحصوا سيئاتكم فانا اضمن على الله ان يحصي حسناتكم.[1]

واتە: عومەری کوڕی سەلەمە دەڵێ: لەبەر دەرگاکەی ماڵی عبدالله ی کوڕی مەسعود دانیشتبووین لە نێوان نوێژی مەغریب و عیشادا بوو – پێش ئەوەی لە دەرگا بدەن و ئەویش فەرموویان لێ بکات – یان چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەیان کرد تا لەگەڵیدا بچن بەرەو مزگەوت و شەرمیان دەکرد لە دەرگای مامۆستای مەزنیان بدەن–.

لەم کاتەدا (ابو موسى الاشعرى) (خوای لێ ڕازی بێت) هات و هەر لە دوورەوە هاواری کرد: ئەی (ابو عبدالرحمن) خێراکە وەرە دەرەوە؟ ! و (عبدالله)یش بە پەلە

---

١ حياة الصحابة (٤/٨٢).

هاتە دەرەوەو وتی: چیە (ابو موسی) شتێك ڕوویداوە وا لەم کاتەدا و بەم شێوەیە هاتوویت؟

ئەبو موسا وتی: نەخێر شتێکی وا ڕووی نەداوە، بەڵام من لە مزگەوتدا پێش کەمێك شتێکم دیووە کە لەوانەشە کارەکە خێر بێت بەڵام من تێك چووم و مێشکم تەقی، خۆ خێریشە بەڵام منی تێکدا، کۆمەڵێك لە مزگەوتدا دانیشتبوون‌و زیکری خوا دەکەن- یەکێکیان پێیان دەڵێت: ئەوەندە جار (سبحان الله) بکەن و ئەوەندە جار (الحمد لله) بکەن و ئەوانیش بە پێی ئەو ژمارەیە زیکرەکان دووبارە دەکەنەوە!

(عبدالله) بە بیستنی ئەم هەواڵە تێکچوو و توڕە بوو بۆیە بە پەلە بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ و ئێمەش هەموومان بە دوایدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە مزگەوت و چوو بۆ لای ئەو کەسانە و پێی وتن: چەند خێرا لە ڕێگای ڕاست لاتاندا و گومڕابوون، بۆ خاتری خوا خۆ هێشتا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا زیندوون و خێزانەکانی گەنجن و جل و بەرگ‌و قاپ و قاچاخەکانی وەك خۆی ماوەتەوە و نەگۆڕاون.. (براکانم) ئێوە گوناھ و خراپەکانتان بژمێرن و مەهێڵن زیاد بکات و تەوبەی لەسەر بکەن ئەو کاتە من زەمانەتی لای خواتان بۆ دەکەم کە چاکەکانتان بۆ دەژمێرێت..

خۆ ئەم کارەی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە دەیانکرد.. کارێکی چاك بوو بە زاراوەی هەندێك - بیدعەیەکی حەسەنە بوو - بەڵام لە لای هاوەڵە تێگەیشتووەکان، قوتابیە گوێڕایەڵە دڵسۆزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) - بیدعە - یەك جۆرە و دابەش ناکرێت بۆ دوو جۆر و صاڵحانیش دەبێت ئاوا لێی تێبگەن تا لە کاروانە موبارەکەکە جێ نەمێنن.

برای بەڕێزم.. یەکێك لە بنەما ترسناکەکانی بیدعە ئەوەیە کە خەڵکی ئەوەندە بەرز بکەینەوە بۆ ئاستێك کە نزیك بێت لە ئاستی پێغەمبەر (ﷺ) و هەندێ کاتیش - پەنا بە خوا - لەویش بەرزتری بکەینەوە، بەڵام صاڵحانی ئەم ئوممەتەی ئێمە کەرامەتێکی بەو جۆرەشیان لە خواناسێکەوە دیتبێت هەوڵیان داوە بیشارنەوە و خەڵکی پێ لە خشتە نەبرێت و خەڵکی پێ نەکرێتە خزمەتکار و دەروێش.

لەم بەسەرهاتەی خوارەوە ورد بەرەوە و ئەوجا بزانە کە لە بنەماکانی بەرەو خوا چوون و صالح بوون ئەوەیە کە واز لە بەندەکانی خوا بێنین و کەرامەتەکانیان گەورە

نەکەین و خەڵکی لە خواناسیەوە لە شوێنکەوتنی سوننەت نەترازێنین بۆ ئەوەی بە کەسایەتیەکان سەرسام بن:

* لما قتل الرجل الصالح عبدالله بن غالب – رحمه الله – في معركة.. فلما دفنوه اصابوا من قبره رائحة المسك، عن مالك بن دينار – رحمه الله – قال: نزلت في قبر عبدالله بن غالب الحداني، فاخذت من ترابه فاذا هو مسك وقال: فتن الناس به فبعث على قبره فسويّ.[1]

واتە: پیاو صاڵحی ئوممەت – عبدالله ی کوڕی غالب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە یەکێ لە غەزاکاندا شەهید بوو، کاتێ ویستیان بینێژن و دایان هێڵایە گۆڕەکەیەوە دەبینن گۆڕەکەی بۆنی میسك دەدات.

مالیکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: من بەخۆم چوومە ناو گۆڕەکەی عبدالله ی کوڕی غالب و مشتێ خۆڵم هەڵگرت و بۆنم کرد دەبینم پڕاوپڕ بۆنی میسك دەدات، وتی: پاش ئەوەی خەریك بوو خەڵکی بەو هۆیەوە تووشی فیتنە و لەڕێ لادان ببن کەسێکم نارد بۆ گۆڕەکەی و تەختی کرد و شوێنەواری ون کرد.

صاڵحان – خوایان لێ ڕازی بێت – ئاوا لە ئیسلام تێگەیشتوون نەك وەك ئەوەی کە ڕاگەیاندنی لە سنوور بەدەر بکات بۆ سەرگەورە و مامۆستا و شێخەکەی و حەز بکات لە پێغەمبەر و هاوەڵان زیاتر لە دڵی خەڵکدا بە هەیبەت بن!!

صاڵحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) زۆر ناتەبان لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو و داهێنەراندا لە بواری بیروباوەڕ و پەرستشەکاندا، فەرموو سەیرێکی خواناسی ئیسلام (ایوب السختیانی) بکە و پەندێکی باشی لێ وەربگرە:

* عن سلام بن ابي المطيع قال: قال رجل من اهل الاهواء لأيوب السختياني – رحمه الله – الا اكلمك بكلمة؟ قال: ولا نصف كلمة.[2]

واتە: سەلامی کوڕی ئەبی موطیع دەڵێ: یەکێك لە ئەهلی هەوا و ئارەزووکاران ئەوانەی بە مەزاجی خۆیان دینداری دەکەن نەك بە میزاجی شوێنکەوتن، هات بۆ لای

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٢٥).

٢ صفة الصفوة (٢/١٩٩).

شێخ ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و پێی وت: بۆم هەیە یەك وشەت لەگەڵدا بدوێم؟ ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: نەخێر تەنانەت نیو وشەیشت بۆ نییە.

ئەمە باشە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە مێشکیان داخراوە و گفتوگۆ سوودی نەبێت لەگەڵیاندا، بەڵام برای صالح و بۆ خوا صولحاو دەتوانێت بە شێوەیەکی هێمنانە و لەسەرخۆ خەڵکانی ڕاهاتوو لەسەر بیدعە بەرەو کانیاوی زوڵاڵی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بگێڕێتەوە و ئەوەش جۆرێکە لە جۆرەکانی خزمەتکردن بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و نزیك بوونەوەی دڵەکانە لە یەکتری.

برا و خوشکم.. ئەگەر شتێك تێکەڵ کرابوو لە عیبادەتەکان لە وتە یان کردەوەیەك، تۆ وەری مەگرە و کاری پێ مەکە چونکە ئەو زانستە کە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە و ئەگەر شتێك لە دوای ئەو زیادکرابوو با زۆر جوان و چاك و ڕازاوەش کرابوو نابێت کاری پێ بکەیت و ئەوزاعیش – ڕحمەتی خوای لێ بێت – بۆ ئەو مەسەلەیە ئاماژە دەکات و دەفەرموێت:

* قال الاوزاعي – رحمه الله – ((العلم ما جاء عن اصحاب رسول الله (ﷺ) وما لم يجئ عنهم فليس بعلم)).[١]

واتە: زانا و پێشەوای شامییەکان و پارێزەری سنووری ئیسلام ئەوزاعی – ڕحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرموێت: ئەو زانست و زانیاریەی کە دەبێت وەری بگرین ئەوەیە کە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە و ئەوەی لەوانەوە پێمان نەگەیشتبێت ئەوە پێی ناڵێن زانست..

دەخیلت بم برای موسڵمانم.. نەکەیت دەمارگیری وات لێ بکات پاش ئەوەی بۆیشت دەرکەوت کە ئەو کارە یان ئەو وتە و زیکرەت بیدعەیە و لە پێغەمبەری نازدارەوە پێمان نەگەیشتووە، تۆ هەر بەردەوام بیت لەسەری.. ئەوەش دەرمانخانەکەی (ایوب السختیانی)یە و لەم بارەیەوە ئامۆژگاریەکی جوانمان پێشکەش دەکات و ئاگادارمان دەکاتەوە لە پاشەڕۆژی کردەوە بیدعەکان:

---

١ صفة الصفوة (٢/١٨٠).

* عن هشام بن حسان ان ايوب السختياني قال: ما ازداد صاحب البدعة اجتهاداً الاّ زاد من الله بعداً.[١]

واتە: زانای صالْح و خواناس: ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: تا خاوەن بیدعە زیاتر خۆی هیلاك بکات لە کردەوە بیدعەییەکانیدا زیاتر لە خوای گەورە دوور دەکەوێتەوە – پەنا بە خوا – .

کەواتە من و تۆ بۆچی کردەوەیەك بکەین کە دڵنیا نین لێمان وەردەگیرێت یا نا، ئەی بۆچی کردەوە گەلێك نەکەین کە سوننەتن و بە دڵنیاییەوە لێمان وەربگیرێت انشاء الله،شتێکی نزیك لەم مانایە ئەو وتە بە نرخەی (ابن عباس)ە (خوا لێی ڕازی بێت) کە سوودێکی چاکمان پێ دەگەیەنێت لە ڕزگاربوون لە پەتای بیدعەکان:

* اخرج ابن عبدالبر في العلم عن ابن عباس انه قال: ((انما هو كتاب الله وسنة رسوله (ﷺ) فمن قال بعد ذلك برأيه فما أدری أفي حسناته يجد ذلك ام في سيئاته)).[٢]

واتە: عبدالله ی کوڕی عەباس – کە یەکێکە لە (عبدالله) مەزنەکانی ئیسلام (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: تەنها قورئانەکەی پەروەردگار و سوننەت و ڕاڕەوی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕێگە و ڕێبازی ڕاستەقینەمانە و هەر کەسێ بەدەر لەو دووانە هەر ڕا و بۆچوون و شتێکی خۆی هەبێ من نازانم ئایا لە نامەی چاکەکانیدا دەنوسرێت یان لە نامەی کردەوە خراپەکانیدا)!.

خوێنەری بەڕێز، من و تۆ بە تەمای وەرزشێکی زۆر قورسین ئەویش مارەسۆنێکی دوور و درێژە کە ڕاکردنە بە دوای کاروانی صالْحاندا.. بۆیە دەبێت سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و چوار یارەکەی زیندوو بکەینەوە و پێویستە لەو پێناوەدا زۆرێ لەو شتانەی کە جاران وەك دین وەرمان گرتبوون و پابەندین پێیانەوە وازیان لێ بێنین و لە باتی هەموو بیدعەیەکدا سوننەتێك زیندوو بکەینەوە و ئیتر با لەو پێناوەشدا هەندێك لێت زویر بن و ناوت بە خراپە بزڕێنن.

---

١ صفة الصفوة (١٩٩/٢).

٢ حياة الصحابة (٨٣/٤).

ئەوە عومەری کوڕی عبدالعزیزە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی خۆشە پارچە پارچە گۆشتی لێببێتە لە بەرامبەر مراندنی بیدعەیەك و زیندووکردنەوەی سوننەتێکدا:-

* قال عمر عبدالعزیز - رحمه الله - فلو كان كل بدعة يميتها الله على يدي، وكل سنة يعيشها الله على يدي ببضعة من لحمي حتى يأتي آخر ذلك على نفسي كان في الله يسيراً.[١]

واتە: عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموویت: ئەگەر هاتوو لەسەر دەستی مندا خوای گەورە بیدعە و داهێنراوێك لە ناو بەرێت و سوننەتێك لەسەر دەستمدا زیندوو بکاتەوە ئیتر زۆر ئاساییە لە لام لە بەرامبەریدا پارچەیەك لە لەشم لێ ببێتەوە تا لە ئاکامدا هەموو گیانم لەو پێناوەدا لە ناو بچێت و ئەوەش بۆ خوا هێشتا کەمە.

دژایەتی کردنی بیدعە و هەوڵی مراندنی کارێکی زۆر بەرز و پیرۆزە.. چونکە ئیسلام سەوزاییەکی جوان و ڕازاوەیە و پارێزگاری کردن لەو سەوزاییەی واجبی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە و ئەو کارەش بە بژارکرنی بەردەوام دەبێت، واتە هەڵکێشانی هەر گیا و گژەیەك لە بەینەکاندا سەوزبوون و زیان بە گیا و گژە ئەسڵیەکە دەگەیەنێت.. باخەوانیش زۆر بە هێمنانە ئەو گیا و گژە نامۆیانە لە ڕیشك دەردەهێنێت و ئاژاوە و بەربەرەکانێی برا موسڵمانە بیدعەچیەکان ناکات و ڕقەبەرایەتیان ناکات بەڵکو زۆر بە ژیرانە و لەسەرخۆ ڕزگاریان دەکات لێی، سەیری خەلیفەی دووەمی ئیسلام بکەن چۆن بە ژیرانە دەیەوێت موسڵمانان لە بیدعە و ئارەزووکاری و گومان دووربخاتەوە:

* اخرج ابن عبدالبر في جامع العلم (١٣٤/٢) عن ابن شهاب عن عمر بن الخطاب - رضي الله عنه - قال وهو على المنبر: (ايها الناس ان الرأي كان من رسول الله مصيباً لأن الله كان يريه، انما هو منا الظنّ والتكلف).

واتە: عمری کوڕی خطاب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەسەر مینبەر وتاری دەدا و دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە ڕا و بۆچونەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەواو بووە چونکە خوای گەورە لە ڕێگای وەحیەوە پێی پیشان داوە... بەلام لەلایەن ئێمەوە گومان

---

١ عمر بن عبدالعزیز، للصلابي (لا: ٣٧).

بردن و زۆر لە خۆکردنە، واتە ئاینی خوا کامڵە و زۆر لە خۆکردنی ناوێ پێویستی بە ئارایشت کردن نییە، تا یەکێك بڵێ بە ڕای من ئەمە شتێکی باشە! و یان ئەمە شتێکی جوانە و بیدعەیەکی حەسەنەیە!

ئەی برای صالحم، خوشکی صالیحەم.. زۆر شت هەیە کە پێت وایە کردنی باشە، یان وتنی باشە، بەلام دەخیلت بم بپرسە بزانە پێغەمبەری خوا و هاوەڵە شیرینەکانی کردوویانە، ئەگەر نەیان کردبوو تۆش نەیکەیت و وازی لێ بێنە و ئەوەش بڕارکردنی ئاینە..

صاڵحان – ڕەحمەتی خوایان لێ بێ – زۆر حەزیان کردووە هەندێ کار ئەنجام بدەن بەلام لە ترسی ئەوەی نەکەونە بیدعەوە وازیان لێ هێناوە و نەیان کردووە لەوانە:

عن خلف بن حوشب قال: قال ربيع بن ابی الراشد – رحمه الله – لولا ان اخالف من كان قبلی لكان الجبانة مسكني الى ان أموت).[1]

واتە: ڕەبیعی کوڕی ئەبی ڕاشد – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێ: ئەگەر سەرپێچی‌و پێچەوانەی پێشووی خۆم نەبوایە – کە ئەوان شتی وایان بە ڕەوا نەزانیووە بۆ موسڵمان – ئەوا کونجێکی چۆڵ و هۆڵم بۆ خۆم دەدۆزیەوە و تێیدا بە تەنها تا مردن بۆ خۆم خواناسیم دەکرد..

* وفي رواية اخرى عن خلف بن حوشب ان ربيع بن ابی الراشد قال: والله لو لا ان تكون بدعة لسحت في الجبال).[2]

واتە: لە ڕیوایەتێکی تردا خەلەفی کوڕی حەوشەب لە – ڕەبیعی کوڕی ئەبی ڕاشیدەوە دەگێڕێتەوە: کە فەرموویەتی: ئەگەر دەمزانی نەدەچووە خانەی –بیدعە– وە ئەوە سەری خۆم هەڵدەگرت و دەچومە ناو ئەو کێوانە و لەوێ بۆ خۆم هەمیشە خواناسیم دەکرد.

---

١ صفة الصفوة (٢/٧١).

٢ صفة الصفوة (٢/٧١).

صاڵحان – ڕەحمەتی خوایان لێ بێ – زۆر ترساون لە بیدعەکاری و زۆر وردەکار بوون لە خۆپاراستن لێی و وەك موسڵمانانی ئەمڕۆ نەبوون کە نەك خۆیان لە بیدعەکان ناپارێزن بەڵکو یان بەڵگەی بۆ دەدۆزنەوە و دەڵێن شتێکی جوانە و زیانی نییە!! ویەك تۆز توند و تیژ نین لەگەڵ بابای بیدعەکاردا و بەڵکو لەگەڵ وابەستەیەکدا بە قورئان و سوننەوە فەرقی ناکەن بەڵام بزانین صالحان چۆن سەیری ئەو کارانەیان کردوە؟:–

* عن فضيل بن عياض – رحمه الله – قال: اذا رأيت مبتدعاً في طريق فخذ في طريق آخر.[١]

واتە: خواناسی بەناوبانگی ئیسلام فوزەیل ی کوڕی عەبیاز – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەفەرموێت: هەر کاتێك موسڵمانێکی بیدعە چیت لە ڕێگایەکدا پێ گەیشت تۆ خێرا ڕێگەت بگۆڕە و لە ڕێگەیەکی ترەوە بڕۆ..

(فضیل) لەم بڕگە کورتەدا دەیەوێت قوتابیان و موریدانی قورئان لە ترسناکی بیدعە ئاگادار دەکاتەوە و تێیان دەگەیەنێت لەو کەسانەوە نزیك ببنەوە کە ئیسلام وەك خۆی و کانیاوە سازگارەکەی جێبەجێ دەکەن و ناهێڵن لە ملاولاوە جۆگەلە ئاوی تری بێتە سەر کە کانیاوە ئەسڵەکە لێڵ بکات یان بیشارێتەوە.

من و تۆ چیمان لە خەلیفەی یەکەمی ئیسلام زیاترە؟ بۆچی ئەگەر کەسێك دڵسۆزانە لێمان بێتە پێش و ئاگادارمان بکاتەوە لە کارە بیدعییەکانمان و بمانخاتەوە سەر ڕێبازی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لێی وەرنەگرین و دەم و چاوی لێ بهێنینە یەك و هەزار ناوونات‌ۆرەی خراپی بخەینە دوا و بمانەوێت لەبەر چاوی موسڵمانانی بخەین؟! دەی من وەك خۆم سوپاسی هەر کەسێ دەکەم بژاری دینەکەم بکات لە هەموو گیاکەڵە و ڕووەکێکی نامۆ کە موسڵمانان لە ناو سەدەکانی ڕابردوودا لە ناو کێڵگەی قورئان و سوننەت دا چاندوویانە.. با بزانین ئەبو بەکر – خوالێ ی ڕازی بێت – چی دەفەرمووێ:

١ البحر الرائق في الزهد والرقائق، (لا: ٢٥).

* قال ابو بكر الصديق (رضى الله عنه) في اول خطبة بعد الخلافة قال: أيها الناس انما انا متبع ولست بمبتدع، ان احسنت فأعينوني وان زغت فقوموني).[١]

واتە: کاتێ ئەبو بەکری (صديق) بوو بە خەلیفەی موسڵمانان لە یەکەمین وتاردا فەرمووی: ئەی خەڵکینە، من شوێنکەوتەی سوننەت و ڕێڕەوی قورئان و فەرموودەم و بیدعەچی نیم و شتی تازەتان لە خۆمەوە بۆ ناهێنم، لەم ڕێگەیەشدا ئەگەر چاکەم کرد هاوکارم بن و پشتگیرم بن تا زیاتر چاك بم و ئەگەر کەمێ لامدا لە ڕێگەی چاکە و قورئان و سوننەت ئێوە هەوڵ بدەن ڕاستم بکەنەوە و بمهێننەوە سەر سکەی ڕێك و ڕاست.

دەی ئایا تۆ برای موسڵمانم.. چیت لەو پیاوە مەزنە زیاترە؟ بۆچی کاتێ پێت دەڵێن ئەو کارە بیدعەیە و دوورە لە هەدی پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر سوپاسی ناکەیت و واز لەو کارە ناهێنی؟!.

ئەی شوێنکەوتەی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) – ئەبی دەرداء – زانا مەزنەکەی شام و هاوەڵە گیان لەسەر دەستەکەی محمد المصطفى ڕێگایەکی جوانی داناوە بۆت تا لە دنیای بیدعەت بپچڕێنێت و لەگەڵ دنیا ئاڵەکەی سوننەتی خاوێندا دەست لەملت بکاتەوە، بزانین چیمان پێ دەڵێت:–

* عن انس عن ابى درداء – رضى الله عنه – قال: اغد عالماً او متعلماً او مستمعاً ولا تكن الرابع، قلت للحسن ما الرابع ؟ فقال: المبتدع).[٢]

واتە: ئەبو درداء – خوا لێ ی ڕازی بێ – دەفەرمووێت: یان زانابە و خەڵکی فێری قورئان و سوننەت و زانستە بەسوودەکان بکە، یان خوێندکار بەو لەبەردەم زانایاندا چۆکدا بدە و زانست وەربگرە یان ئەگەر ئەو دوانەیش نەبوویت گوێگر بە بۆ قسەی بەسوود و قورئان و سوننەتی پێغەمبەر و وانەی لێ وەربگرەو جێبەجێیان بکە، بەڵام دەخیلت بم چوارەم مەبە لەناو دەچیت. دەڵێ لە حەسەنم پرسی: چوارەم چی یە؟ لە وەڵامدا ووتی: بیدعەچی.

---

١ ابو بكر الصديق، للصلابي.

٢ صفة الصفوة (١/٣١٩).

چـەندێك نـانی حـەڵاڵ پەیـداکردن گـەورە و مەزنـە لـە ئیـسلامدا لـە بەرامبەریشدا زیندووکردنەوەی سوننەت و کار پێ کردنی ئەوەندە گەورەیە، چونکە یەکەم گەدە لـە پـاروی حـەرام دەپارێزیـت بـەڵام دووەم دینەکـەت لـە یـادکردن و دەسـتکاری کـردن دەپارێزێت، بارستەیەکی پڕ لە مانای زانای خواناس یونس ی کوڕی عوبەید بخەمـەوە یادتان لەم بارەیەوە وتوویەتی:

* عن یونس بن عبید قال: لیس شئ أعز من شیئین: درهم طیـب ورجـل یعمـل علـی سنة).[1]

واتە: یونس ی کوڕی عوبەید – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەفەرمووێت: هیچ شـتێك ئەوەندەی دوو شت بە نرخ نییە: پـارە و دەرهـەمێکی حـەڵال مـرۆڤ پەیـدای بکـات بـۆ خۆی و ماڵ و منداڵی، دووەم پیاوێك تا لە ژیاندایە لەسـەر سـوننەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لانەدات و کاریان پێ بکات.

هەرکەسیش لەسەر ڕێـڕەوی سـوننەت بـڕوات لـە ژەنـگ و ژیـواری بیدعـە و تێکـەڵ کراوەکان بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕزگاری دەبێت.

ئەو پەتەوازەیی و گروپ گروپی مەزهەبیەی ڕووی لە موسڵمانان کـردووە هۆیەکـەی دەگەڕێتەوە بۆ جێگیربوونی (بیدعـە) بـە شـێوازێکی زۆر ناشـرین لـەناو موسـڵماناندا و تاوای لێ هاتووە مرۆڤی وا هەیە ئامادەیە دەسـت لـە سـوننەتێکی صـحیحی پێغەمبـەر (ﷺ) هـەڵبگرێت بـەڵام وا دەزانێـت هـەموو دنیـایی بەسـەردا ڕوخـاوە ئەگـەر بتـەوێت بیدعەیەکی بۆ ڕۆشن بکەیتەوە و بتەوێ وازی لێ بێنێ..

هەر ئەم هۆیەش وای کرد لـە صـاڵح و خواناسـی ئومـەت (سـولەیمان التمیمـی) کـە ئەوەندە ڕقی لە موسڵمانی بیدعەچی بێتەوە کە بە جـۆرێ تـا مـردن و سـەرەمەرگیش هەر خەفەتبار بوو دەگریا بزانین لەبەر چی بووە وا بەو جۆرە گریاوە؟:

* مرض سلیمان التمیمی فبکی فی مرضه بکاءً شدیداً، فقیل له مـا یبکیـك؟ أتجـزعُ من الموت؟ قـال لا ولکـن مـررت علـی قـدري فـسلمت علیـه فأخـاف ان یحاسـبنی ربـي علیه).[2]

١ صفة الصفوة (٢/٢٠٤).

٢ صفة الصفوة (١/١٨١).

واتە: سلیمان التمیمی – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – لە نەخۆشیەکدا زۆر بە کوڵ گریاو، پێیان ووت: بۆچی دەگریت؟ ئایا لە مردن دەترسیت؟ ووتی: نەخێر، بەڵام جارێکیان دام بە لای لە قەدەریەکدا* و سڵاوم لێ کرد! زۆر دەترسم پەروەردگارم لەسەر ئەوە لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکات..

(فضیل) ی کوڕی (عیاض)یش – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – زۆر پەست بووە بە (بیدعە) و زۆر ترسناك بووە لە لای کە عەبدێك ئەوەندە ڕوودار بێت ئەوەندە بێ شەرم بێت ئیسلامی عەزیز بە ناتەواو و نوقوستان بزانێت و بەخەیاڵی خۆی شتی بۆ زیاد بکات و تەواوی بکات – پەنا بەخوا – بۆیە ئامۆژگاریمان دەکات وەك پێشتر باسم کرد کە پێمان دەفەرموێت: ئەگەر بیدعەچیەك بەرەو ڕووت هات تۆ هەوڵ بدە لەو ڕێگایەوە نەچیت و لابدە لێی.

برای خۆشەویستم، خوشکی بڕوادارم، منیش جاربەجار کاتی خۆی هەندێ کردەوەم بەگەرم گرتبوو زۆر دڵم پێیان خۆش بوو، هەندێ لە هاوڕێ تێگەیشتووەکانم پێیان وتم ئەو کارانەی تۆ دەیکەیت، سوننەت نین و بگرە بیدعە و داهێنراو و زیادکراون بۆ ئیسلام و پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتی وای نەکردووە و کەچی خوایش لێی ڕازی بووە..

بەڵام بە داخەوە لەو کاتەدا گوێم پێ نەدان و لەسەر کارەکانم بەردەوام بووم و زۆریش خۆم دەڕەنجاند، بەڵام وتەیەکی ئیمام مالك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کاری تێکردم و پاش ئەوە دەستم کرد بە بژارکردنی کردەوە چاکەکانم و ئەوەی لەگەڵ سوننەتدا نەبووایە نەمدەکرد با زۆر جوانیش بوایە، ئەو وتەیە گیان و دڵ و دەروونی هەژاندم و بیدعەی وا لەبەرچاو خستم کە وام لێهات نەمدەوێرا نوێژم بکەم لە دوای بیدعەچیەکانەوە..

وتەکەیشی ئەوەیە کە دەفەرموێت: ((هەر کەسێ بیدعەیەك لەم دینەدا بێنێتە کایەوە مانای وایە ئەم دینە بە ناتەواو دەزانێت و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) – پەنا بە

* قەدەریەکان: کۆمەڵێ لە موسڵمانانن و بەوە گومڕابوون کە دەڵێن هەموو گوناهێك قەزا و قەدەرە..

خوا – بە ناپاك و خائین دەزانێت و دەڵێت دینەکەی بە ناتەواوی گەیاندۆتە ئێمە و من دەمەوێت بە داهێنانی جوان تەواوی بکەم))! کەچی خوای گەورە بڕیاری تەواوی دینی ئیسلام دەدات و دەفەرمووێت:

* ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾.[١]

واتە: وا ئەمڕۆ ئاینەکەتانم تێرو تەسەل کردو بەخششی خۆم بە تەواوی ڕژاند بەسەرتانداو ڕازی بووم کە ئیسلام ئاینتان بێت.

---

١ سورة المائدة، (الآية: ٣).

# شەشەم

## صاڵحان خۆیانیان لە غەیبەت پاراستووە:

برای موسڵمانم، خوشکی پاکداوێن، کە مادەم بە نیازیت بکەوێتە دوای کاروانە پڕ لە نوورەکەی صاڵحان.. تا بۆت دەکرێت خۆت لە باسکردنی موسڵمانان لە پشتەملە واتە غەیبەت کردنیان بەدوور بگرە.

لە هەمووی ترسناکتر ئەوەیە کە خوای گەورە لە سورەتی (الحجرات)دا بە شێوەیەکی وا قێزەونی کردووە کە هەر کەسێك بیبیستێت غەیبەتی لەبەر چاو دەکەوێت و نزیکی نابێتەوە.

قال الله تعالى: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُۚ وَاتَّقُوا اللَّهَۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾.[1]

واتە: ئەی دەستەی باوەڕداران غەیبەتی یەکتری مەکەن و لە پشتەملە باسی یەکتر مەکەن چونکە ئایا پێتان خۆشە گۆشتی برا موسڵمانەکەتان بخۆن بە مردوویی؟!! ئەوەتان زۆر پێ ناخۆشە و – ئێڵنجتان دێت دەی لە خوا بترسن و لە غەیبەت کردنیش ئێڵنجتان بێت بە ڕاستی خوا لێ وەرگری تەوبە و بەسۆزە.

خوشکان، برایان، هەی یاران وەرن با پێکەوە لەگەڵ سەروەرمان (ﷺ) و جبریلدا (سەلامی خوای لەسەر بێت) و لە شەوی میعراجدا سەردانێکی ئاگری جەهەنەم بکەین بزانین ئەوانەی غەیبەتی خوشك و براکانیان دەکەن لەوێ دەبینرێن؟ ئەی وەزعیان چۆنە؟:

* عن أنس بن مالك – رضي الله عنه – قال: قال رسول الله (ﷺ): (لما عرج بي ربّي – عز وجل – مررت بقومٍ لهم أظفار من نحاس يخمشون وجوههم وصدورهم، فقلت: من هؤلاء يا جبريل؟ قال: هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناس، ويقعون في اعراضهم).[2]

---

١ الحجرات: (١٢).

٢ اسناده حسن، الجامع لشعب الايمان (٢٠٥/١٠) وقال الشيخ الالباني صحيح (٥٢١٣).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێك پەروەردگارم بەرزی کردمەوە بۆ لای خۆی – لە کاتی میعراجدا – دام بە لای کۆمەڵێك کەسدا نینۆکیان مس بوو، دەم و چاوو سنگی خۆیان پێ دەڕنی! وتم: ئەی جبریل ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن و زەمیان دەکەن.

دەخیلتان بم برایان، خوشکان، نەچنە ڕیزی گۆشت خۆرەکان، مەبەستم ئەو کەسانە نیە سەیرانی زۆر دەکەن و گۆشتی چاك دەبرژێنن! بەڵام گەورە زانای سەرمەشقمان پێناسەیەکی تری دەکات:

* يقول محمد بن عبيد الطنافسي: كنا عند سفيان الثوري – رحمه الله – فأتاه رجل فقال: يا ابا عبدالله، أرأيت هذا الحديث الذي جاء فيه: (ان الله ليبغض أهل البيت اللحميين) اهم الذين يكثرون اكل اللحم؟

فقال سفيان: لا، هم الذين يكثرون اكل لحوم الناس.[1]

واتە: محمدی کوڕی عوبێدی تەنافوسی دەڵێ: لە خزمەت سوفیانی سەوریدا بووین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەو کاتەدا پیاوێك هات و وتی: ئایا ئەو فەرموودەیەی کە تیایدا هاتووە – خوای گەورە ڕقی لە خانەوادە گۆشت خۆرەکانە! مەبەستی لەو کەسانەیە کە گۆشتی زۆر دەخۆن؟ سوفیانیش فەرمووی: نا، بەڵکو ئەو کەسانەن کە زۆر زۆر گۆشتی خەڵکی دەخۆن! واتە: غەیبەتیان دەکەن.

ئەمەش پێغەمبەرە ئازیزەکەمانە (ﷺ) وانەیەکی گەورەمان فێردەکات لە دوورکەوتنەوە لەم ڕەوشتە ناشیرینە و حەزی نەکردووە باسی کەسێك بکات و چەندان ماڵ و سامانی پێ بدرێت یان هەیبێت:

* عن عائشة – رضي الله عنها – قالت: حكيت إنساناً، فقال: لي النبي (ﷺ): (ما أحبّ اني حكيت انساناً وان لي كذا وكذا).[2]

---

١ اسناده رجال ثقات، الجامع لشعب الايمان (١٠/٢٠٤).

٢ اسناد رجاله ثقات، الجامع (١٠/٢١٠).

واتــە: عائـشە – دایکـی بـاوەڕداران – (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: باسـی یەکێکم کرد لە لای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)و ئـەویش پێـی فـەرمووم: پـێم خـۆش نیـە زەمی یەکێك بکەمو لە بەرامبەردا ئەوەندەو ئەوەندە سامانم دەست کەوێت!.

ئەم جارەیان دایکی ئازیزمان – عائیشە – (خوای لێ ڕازی بێت) ناوی ئـەو خوشـکە موسڵمانەش دەبات کە غەیبـەتی کـردووەو پێغەمبـەریش (ﷺ) بـە جۆرێك قێزەونـی دەکات لە لایدا کە تا مردن نزیکی باسکردنی خەڵکی لە پشتەملە نەبێتەوە:

عن ابي حذيفة عن عائشة قالت: قلت يا رسول الله ان صفية إمرأة واشارت الى أنملة – يعني قصيرة! فقالت النبي (ﷺ): (لقد مزجت بكلمة لو مزجت بها البحر مزجت).[1]

واتــە: ئــەبی حوزەیفــە دەڵێــت: عائــشە (خــوای لێ ڕازی بێــت) فــەرمووی: بــە پێغەمبەری خوام (ﷺ) وت: –صوفیە– ئافرەتێکی کورتە باڵایەو ئاماژەی کـرد بـە نینۆکی پەنجەی بۆی! و پێغەمبەریش فەرمووی: خۆت تێکەڵی وشـەیەکی وا کـرد کـە ئەگەر تێکەڵی دەریایەکی بکەیت پیسی دەکات.

ئەمــەش خوشــکە – مەیمونــە – یــە (خــوای لێ ڕازی بێــت) بەنـدە ئازادکراوەکـەی پێغەمبەرمان (ﷺ)و پێغەمبەرمان پێی دەفـەرمووێت ئەگـەر دەتـەوێت سـزای نـاوگۆڕ نەچەژیت غەیبەتی کەس مەکە:

* عن عبدالرحمن بن القاسم، عن ميمونة مولاة النبي (ﷺ) قالت: قال لي رسـول الله (ﷺ): يا ميمونة تعوذي بالله من عذاب القبر، قلت: يا رسول الله انه الحق؟ قال: (نعم يا ميمونة، وان من أشد عذاب القبر يا ميمونة: الغيبة والبول).

واتە: عبـدالرحمن ی کـوڕی قاسـم لـە مەیمونـەوە دەگێڕێتـەوە – کـە کـەنیزەکێکی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا بووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێـی فـەرمووم: ئـەی مەیمونە پەنا بگرە بە خوا لە سزای گۆڕ، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە ڕاستی لە گۆڕدا سزا دەدرێین؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: بـەڵێ ئـەی مەیمونـە، ناڕەحـەترین سزای گۆڕ بۆ ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی خەڵکی دەکەنو ئەوانەیشی بە جـوانی تـارات ناگرن.

---

١ قال الترمذي: حسن صحيح، الجامع لشعب الايمان (٢١١/١٠).

برای موسڵمانم - غەیبەتکاران - لەناو کاروانە موبارەکەکەی صالّحاندا جێیان نابێتەوە چونکە ئەزانی غەیبەتکردن بۆنێکی زۆر بۆگەنی هەیە؟ شتی وات بیستووە؟ دەی گوێ بۆ ئەم فەرموودەیە بگرە:

* عن جابر قال: كنا مع النبي (ﷺ) في سفر فهاجت ريح منتنة، فقال: (اتدرون ما هذا؟) قالوا: لا، قال: (قوم من المنافقين اغتابوا ناسا من المؤمنين).[1]

واتە: جابری کوڕی عبدالله (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە سەفەرێکماندا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین (ﷺ) بایەك هەڵی کردو بۆنێکی ناخۆشی لەگەڵ خۆی هێنا، فەرمووی: ئەزانن ئەمە چیە؟ وتیان نەخێر، فەرمووی: کۆمەڵێك لە دووڕووەکان غەیبەتی کۆمەڵێك لە بڕوادارانیان دەکرد.

ئەوەش زانای تابعین‌و خواناس - عوبەیدە - یە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وا لەم دینە پاکە تێگەیشتووە کە هەر کەسێك باسی براو خوشکانی موسڵمانی بکات لە پشتەملە ئەوە دەستنوێژەکەی شکاوەو دەبێت بیگێڕێتەوە:

* عن محمد بن سيرين - رحمه الله - قال: قلت لعبيدة - رحمه الله - ممّ يعاد الوضوء؟ قال: من الحدث واذى المسلم! قال: وكان شيخ يمر بمجلسٍ لهم فيقول: توضأوا فان بعض ما تقولون شرّ من الحدث).[2]

واتە: محمدی کوڕی سیرین دەفەرموێت: بە عوبەیدەم وت (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئایا دەستنوێژ لە چی دەگێڕێتەوە؟ فەرمووی: لە چوونە سەرئاوو ئازاردانی موسڵمانان، پیاوێك دای بە لای کۆمەڵێك کەسدا پێی وتن: دەست نوێژ بگرنەوە، چونکە هەندێ لە قسەو باسەکانتان لە دەستنوێژ شکێنەکان خراپترن.

ئایا بیستووتانە کە غەیبەت دەستنوێژ دەشکێنێت‌و نوێژ بەتاڵ دەکاتەوەو ڕۆژوو دەشکێنێت؟ سەیر نەبێت بە لاتەوە، ئێستا بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)و وتەی ئیمام احمد ئەو سەرسامیەت ناهێڵم - ان شاء الله-:

---

١ رواه احمد ورجال احمد ثقات، الجامع لشعب الايمان (١٠/٢١٧).

٢ رواه ابن ابي شيبة في المصنف (١/١٣٤)، الجامع لشعب الايمان (١٠/٢١٤).

* عن ابن عباس – رضي الله عنه – أن رجلين صليا الصلاة الظهر او العصر وكانا صائمين، فلما قضى النبي (ﷺ) الصلاة قال: (اعيدوا وضوءكما وصلاتكما وامضيا في صومكما واقضياه يوماً آخر)، قالا: لِمَ يا رسول الله (ﷺ)؟ قال: اغتبتم فلاناً).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی عەباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویّت: دوو پیاو نوێژی عەسر یان نیوەڕۆیان کردو بە ڕۆژویش بوون، کاتێك پێغەمبەر نوێژەکەی کرد پێی فەرموون: دەستنوێژ بگرنەوەو نوێژەکانتان بگێڕنەوەو ڕۆژووەکەشتان بگرن بەڵام دوایی بیگێڕنەوە! ئەوانیش وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەویش فەرمووی: غەیبەتی فڵان کەستان کرد.

پێشەواکەی ئەهلی سوننەو جەماعە – احمدی کوڕی حەنبەل – (خوای لێ ڕازی بێت) ڕاڤەیەکی ئەم فەرموودەیە دەکات بە شێوەیەکی جوان با گوێی بۆ بگرین:

* قال الامام احمد بن حنبل – رحمه الله –: (أمر من أمره بأعادة الوضوء والصلاة بالغيبة، أو اذى المسلم انما هو بالتكفير لما مضى من الذنب والله اعلم).[2]

واتە: ئیمام احمدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمانی داوە بە دەستنوێژگرتنەوەو دووبارە کردنەوەی نوێژەکە ئەگەر غەیبەتی کەسێکی کردبوو بەو دەستنوێژەوە یان لەبەر ئەوەی ئازاری دڵی موسڵمانێکی داوەو ئەو کارەش دەبێتە هۆی لێخۆشبوونی گوناهەکەی‌و خوایش باشتری لێ دەزانێت.

خۆشبەختی بۆ غەیبەتکراو ئەگەر بەو هۆیەوە ئەویش دەست نەکاتەوە بە غەیبەتکردنی غەیبەتکەرەکەو بیداتە دەستی خوا، ئەو کاتە لە قیامەتدا سەرمایەی کردەوەی جوانی ئەو کەسانە دەبات بۆ خۆی:

* قال الامام الاوزاعي – رحمه الله –: (بلغني انه يقال للعبد يوم القيامة: قم فخذ حقك من فلان! ، فيقول: مالي قبله حق، فيقال: بلى ذكرك يوم كذا وكذا بكذا وكذا).[3]

واتە: ئیمام ئەبوعەمری ئەوزاعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموویّت: بیستوومە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بە بەندەیەك دەوترێت: هەستە بڕۆ هەقی خۆت لە فڵان کەس

---

١ ذكره السيوطي في الدر المنثور، الجامع لشعب الايمان (١٠/٢١٥).

٢ الجامع لشعب الايمان (١٠/٢١٨).

٣ اسناده رجال ثقات، الجامع لشعب الايمان (١٠/٢٢٣).

بکەرەوە ! ئەویش دەڵێ: هیچ هەقێکم لە لای نیە، و پێی دەڵێن: بەڵێ هەقت لایەتی چونکە لە ڕۆژی ئەوەندەی ئەوەندەدا فلان باسی تۆی کردو غەیبەتی کردیت.

هەر بەم هۆیەشەوە بوو کە زانای خواناسو صالح (عبدالرّحمن) دەڵێ: من حەز دەکەم دەنکە بە دەنکەی ئەم شارە غەیبەتم بکەن، بزانین بۆچی؟:

* قال عبدالرحمن بن عمر رسته: سمعت عبدالرحمن بن مهدي — رحمه الله — يقول: (لو لا اني اكره ان يعصى الله لتمنيت ان لايبقى في هذا المصر أحد الاّ وقع فيّ واغتابني، واي شيء أهنأ من حسنة يجدها الرجل في صحيفته يوم القيامة لم يعملها لم يعلم بها).[1]

واتە: عبدالرحمن ی کوڕی ڕستە دەڵێت: گوێم لێ بوو مامۆستا عبدالرحمن ی کوڕی مهدی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە پێم ناخۆشە سەرپێچی پەروەردگار بکرێت ئاواتم دەخواست یەك بە یەکی ئەم شارە غەیبەتیان بکردمایە، دەی چی لەوە خۆشترە کە مرۆڤ لە ناو نامەی کردەوەکانیدا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵێ کردەوەی چاکەی بۆ نووسرابێتو خۆی نەیکردبێت.. بەڵکو چاکەی غەیبەتکەرانی بۆ هاتووە پەنا بە خوا و خۆیان بێ چاکە ماونەتەوە.

خوشكو براکانم لەم کاروانە موبارەکەدا وەرناگیرێین تا وەك زانا صالحەکەی سەردەمی تابعین محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لێ نەیەت لە وردترین قسەماندا لە غەیبەت کردن خۆمان بپارێزین:

* قال طوق بن وهب: دخلت على محمد بن سيرين وقد اشتكيت، فقال: كاني أراك شاكياً قال: قلت: أجل، قال: اذهب الى فلان الطبيب فاستوصفه، ثم قال: اذهب الى فلان فانه اطب منه، ثم قال: (استغفر الله اراني قد اغبته).[2]

واتە: تەوقی کوڕی وەهەب دەڵێ: چووم بۆ خزمەت محمدی کوڕی سیرینو حاڵی نەخۆشینی خۆم بۆ باس کردو ئەویش فەرمووی: ئەبینم سکاڵای ئێشو ئازارت دەکەی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: بڕۆ بۆ لای فلان پزیشك ئەو شارەزاترە لە ئەو، پاشان فەرمووی: خوایە داوای لێبووردن دەکەم، وا ئەزانم غەیبەتی یەکەمم کرد ! !

---

١ اخرجه ابو نعيم في حلية الاولياء (١١/٩) الجامع لشعب الايمان (٢٢٢/١٠).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢٤٦/١٠).

صالْحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) خۆیان هەرگیز غەیبەتی کەس ناکەن‌و بە هیچ جۆرێکیش نایەڵن هیچ کەسێك لە مەجلیسەکانیاندا غەیبەتی برایەکی موسڵمانی بکات‌و لە پشتەملە باسی بکات‌و حورمەتی بشکێنێت بۆیە مەجلیسەکانیان مەجلیسی پڕ لە نوورو ئیمان بووە‌و فەرموون پەندێك وەربگرن یاران لە ئیاسی کوڕی موعاویەوە:

* عن سفيان بن حسين قال: كنت عند إياس بن معاوية وعنده رجل تخوفت ان قمت من عنده ان يقع في، قال: فجلست حتى قام، فلما قام ذكرته لإياس قال: فجعل ينظر في وجهي فلا يقول لي شيئا، حتى فرغت، فقال لي: (اغزوت الديلم؟ قلت: لا، قال: اغزوت السّند؟ قلت: لا، قال: فغزوت الهند؟ قلت: لا، قال: فغزوت الروم؟ قلت: لا، قال: فسلم منك الديلم والسند والهند والروم، وليس يسلم منك اخوك هذا، فلم يعد هذا، فلم يعد سفيان هذا).[١]

واتە: سوفیانی کوڕی حوسەین دەڵێت: لە خزمەت ئەیاسی کوڕی موعاویەدا بووم‌و لەوێ پیاوێکی لێ بوو زۆر ترسام کە من هەڵسم لە پاشەملە غەیبەتم بکات لە لای مامۆستا ئیاس بۆیە بڕیارم دا دانیشمەوە تا ئەو دەڕوات، پیاوەکە ڕۆیشت‌و منیش باسم کرد بۆ مامۆستا! مامۆستایش هەر سەیری ناوچاوانی دەکردم هیچی نەدەووت تا لێ بوومەوە پاشان پێی وتم: ئایا لە غەزای دەیلەمدا بەشداریت کردووە؟ وتم: نا، فەرمووی: ئەی لە غەزای سیند دا؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: ئەی لە غەزای هندستاندا؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: ئەی لە غەزای ڕۆمدا؟ وتم: نەخێر، ئەوجا فەرمووی پێم: تۆ دەیلەم‌و سیندو هیندو ڕۆم لە دەستت بێوەی بوون کەچی برا موسڵمانەکەت لە دەست‌و زمانت بێوەی نیە؟! ئیتر لەو ڕۆژە بەدوا سوفیانیان نەبینی غەیبەتی هیچ کەسێك بکات.

براو خوشکی موسڵمانم، هەتا بۆمان دەکرێت با باسی کەس نەکەین چونکە لەوانەیە بە تەنها ئەو قسانەی تۆ حورمەتی ئەو برا موسڵمانەت لە کۆمەڵگەدا بشکێنێت، ئەی

---

١ الجامع لشعب الايمان (١٠/٢٤٦).

ناترسی خوای گەورەیش حورمەتی تۆش بشکێنێت؟ دە گوێ بگرە بۆ مامۆستای صالّحانو سەرمەشق بۆ ئێمە – ئیبراهیمی نەخەعی – بزانە لە ترسی چی غەیبەتی کەس ناکات؟:

* قال الأعمش: سمعت ابراهيم النخعي – رحمه الله – يقول: (اني لارى الشيء اكرهه فما يمنعني ان أتكلم فيه الاّ مخافة ان ابتلى بمثله).[1]

واتە: ئەعمەش دەڵێت: لە ئیبراهیمی نەخەعیم بیست (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: زۆر شت دەبینم لە خەڵکیدا پێم ناخۆشە بەڵام ئەوەی ڕێم لێ دەگرێت کە باسی بکەم ئەوەیە کە دەترسم خوای گەورە خۆیشم دووچار بکات بەو غەڵەتەوە، واتە بە هۆی ئەوەی کە هەستاوم بە شکاندنی کەسێكو غەیبەتیم کردووە.

ئەگەر بە ڕاستتەو دەتەوێت بچیتە کاروانی صالّحانەوە دەبێت وەك مامۆستا سوفیانی سەوری بیت (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەوەندە بە گەورەو ترسناك سەیری غەیبەت بکەیت کە لەوە ترسناکتر بێت لە لات کە تیرێکی پێوە بنێیت!:

* قال بشر بن حارث يقول: قال الفضيل – بن عياض – سمعت سفيان – الثوري – رحمه الله – يقول: (لأن ارمي رجلاً بسهم أحب اليّ من ان ارميه بلساني).[2]

واتە: فوزەیلی کوڕی عەیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: گوێم لێ بوو سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: پێم خۆشە تیرێك بگرمە کەسێكو – بریندازی بکەم – نەوەك بە تیری زمانم بریندازی بکەم.

دەخیلتان بم هەی یاران، با بەسوك نەڕوانین بۆ غەیبەتو باس کرنی خوشكو برا موسڵمانەکانمان لە پشتەملە بە شتێکی سادەو ساکار سەیری نەکەین بەڵکو با گوێ لە زانای مەزنی فەرموودە سوفیانی کوڕی عویەینە بگرین ئەوجا بۆت دەردەکەوێت کە تاوانێکی چەند گەورەیە:

---

١ اسناده حسن، الجامع لشعب الايمان (٢٤٧/١٠).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢٥١/١٠).

* قال اسحاق بن اسماعيل: قال سفيان بن عيينة – رحمه الله –: الغيبة عند الله اشد من الزنا وشرب الخمر، لان الزنا وشرب الخمر ذنب فيما بينك وبين الله – عز وجل – فاذا تبت منه تاب الله عليك، والغيبة لا تغفر لك حتى يغفر لك صاحبها).[1]

واتە: سوفیانی کوڕی عویەینە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: غەیبەتکردن لە لای خوای عز وجل لە زیناو مەی خواردنەوە ترسناکو گەورەترە! چونکە زیناکردنو ئارەق خواردنەوە گوناهێکە لە نێوان خۆتو خوادایە وە ئەگەر لە دڵەوە تەوبە بکەیت خوا تەوبەت لێ وەردەگرێت بەڵام غەیبەت کردن گوناهێکە لەگەڵ خەڵکیداو تا ئەو کەسە لێت خۆش نەبێت خوایش لێت خۆش نابێت.

وەرن برایان با چاوێك لە ئیمامی بخاری بکەین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زانا مەزنەکەی فەرموودەو خاوەنی صحیحی بوخاری بزانە لەسەر غەیبەت کردن بە خۆی چی دەڵێت:

* قال بكر بن منير: سمعت محمد بن اسماعيل البخاري – رحمه الله – يقول: أرجو ان القي الله ولا يحاسبني اني اغتبت أحدا).[2]

واتە: بەکری کوڕی مونیر دەڵێت: لە محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاریم بیست (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: من تکام وایە بگەڕێمەوە بۆ لای خواو لێپرسینەوەم لەگەڵدا نەکات لەسەر ئەوەی غەیبەتی کەسم کردبێت، واتە هەوڵ دەدەم غەیبەتی کەس نەخەمە نامەی کردەوەکانمەوە.

---

١ الجامع لشعب الايمان (١٠/٢٢٣).

٢ صفة الصفوة (٢/١١٤).

# بەشی سێیەم

## صاڵحان ( ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ) لە نێوان چوار ترسدا دەژین:

١- ترسان لە خوای پەروەردگار.

٢- ترسان لە هاتنی ڕۆژی قیامەت.

٣- ترسان لە ئاگری دۆزەخ.

٤- ترسان لە فەتوادان.

# یەکەم

## ترسان لە خوای پەروەردگار لە لای صاڵحان:

تەقوا واتە ترسان لە خوای بە دەسەڵات و خاوەنی هەموو کەون و کائینات، و ئەم ترسەیش ئەنجامێکی مسۆگەر و بەرهەمی سروشتیی هەست کردنە بە باوەڕێکی قووڵ‌و پتەو کە پەیوەستمان دەکات بە چاودێری بەردەوامی خوای پەروەردگاری —عز جل—و ترسان لە خەشم و قین و توڕەبوون و سزاکانی، و هەڵپەکردن بۆ بەدەستهێنانی لێبوردنی.

لەم بارەیەوە وەك یەکێ لە صاڵحانی نەناسراو دەفەرموویێت: ((اتقاء عذاب الله بصالح العمل، والخشية من الله في السِّر والعَلَن)).[1]

واتە: خۆپاراستن لە سزای سەختی پەروەردگار بە کردەوەی جوان و ترسان لە خوا لە پەنهانی و ئاشکرادا.

قورئانەکەی خوای — عز وجل — پڕیەتی لە باسکردنی تەقوا و هاندانی موسڵمانان بۆ خۆڕازاندنەوە بەو سیفەتە گەورە و گرنگەو سەرەتا پێمان ڕادەگەیەنێت کە تا بۆتان دەکرێت لە خوا ترسانی تەواو لە خۆتاندا بێننەدی:

قال الله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾.[2]

واتە: ئەی کۆمەڵی باوەڕداران لە خوا بترسن بە ئەوپەڕی لە خواترسان و مافی تەواوی پێ بدەن.

هەروەها خۆش حاڵیشمان دەکات بەوەی کە ئەگەر بێتو لە خوا ترسانمان تێدا دروست بێت ئەوا — فورقانمان پێ دەبەخشێت دەبێ ئەو خەڵاتە مەزنە چێ بێ؟

قال الله سبحانه: ﴿إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾.[3]

---

١ تربية الاولاد في الاسلام — عبدالله ناصح علوان (١/٣٥٥).

٢ سورة ال عمران، (الآية: ١٠٢).

٣ سورة الانفال، (الآية: ٢٩).

واتە: هەر کەسێك لە خوا بترسێت – و نەوێرێت سەرپێچی بکات – ئەوا خەڵاتی دەکات بە پێدانی شارەی ئازایەتی – نوط الشجاعة – ی فورقان – کە بە هۆی ئەو خەڵاتەوە ڕێگای ژیانی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە و هەق و ناهەق لە یەك جیادەکاتەوە و گوناه و تاوانەکانیشی بۆ دەپۆشێت و لە گوناهەکانیشی خۆش دەبێت، چونکە خوا خاوەنی خەڵات و بەخششی زۆر گەورەیە و تەنها لە خوا ترسانیش لەو خەڵاتە مەزنانە بەهرەمەند دەبن.

برای صاڵحم ئایا حەز دەکەیت لەگەڵ کاروانی صاڵحاندا بکەویتە ڕێ؟ ئایا حەز دەکەیت لە ناڕەحەترین کاتەکاندا خوا بگاتە فریات؟ و یان دەرووت لێ بکاتەوە؟ یان بە جۆرێك پارە و سەروەت و سامان بڕژێنێت بەسەرتدا کە خۆت سەرسام ببیت و بڵێیت ئەم هەمووە پارەیەم لە کوێوە بۆ هات؟ دەی گوێ لەم ئایەتە مەزنە بگرە:

قال الله تعالى: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ﴾.[١]

واتە: هەر کەسێ لە خوای گەورە بترسێت – و سنورەکانی بپارێزێت و نەیانشکێنێت – ئەوا خوا لەسەر خۆی فەرزی کردووە کە هەردەم لە ناڕەحەتیەکاندا دەرووی لێ بکاتەوە و لە ژیان و گوزەرانیش بێ خەمی بکات و بە جۆرێ ڕزق و ڕۆزی بۆ بنێرێت خۆی سەرسام بێت و هەر بە خەیاڵیشی دانەهاتبێت کە شتی وای دەست بکەوێت.

برای موسڵمان و خوشکی پۆشتەم.. ئایا دەزانی بەهەشتی خوا و دەستکەوتنی خۆشیەکانی ڕۆژی قیامەت بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دنیا ترسنۆکن؟ بەڵام نە لە دروستکراوەکان بەڵکو ترسان لە بەدیهێنەری بوونەوەر، خۆیان بۆمان باس دەکەن و دەڵێن: ئەم خۆشی و ناز و نیعمەتە زۆرەی بە ئێمە بەخشراوە بە هۆی ئەوەوەیە کە لە دنیا خەریك بوو لە پەروەردگار دەتۆقین و نەمان دەوێرا گوناه بکەین نە خۆمان و نە ماڵ و منداڵەکانمان، وەك دەفەرمووێت:

---

١ الطلاق، (الآية: ٢–٣).

قال الله تعالى: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾﴾.[١]

واتە: بەهەشتیەکان – هیچ ئیش و کاریان نییە جگە لە ڕابواردن و سەردانی یەکتری نەبێت و لە یەکێ لەو سەردانانەدا باسی دنیای ڕابردوو دەکەن و هەندێکیان لە هەندێکیان دەپرسن: ئایا ئێوە لە دنیا چیتان کردووە وا خوا بەم زەخامەتە ڕێزی لێ ناون؟

لە وەڵامدا دەیان وت: ئێمە کاتی خۆی لە دنیادا و لە ناو ماڵ و منداڵی خۆماندا زۆر زۆر دەترساین لە خوای گەورە و ناڕەحەتی و نەهامەتیەکانی ڕۆژی قیامەت و سزای سەختی خوا لە ناو ئاگری جەهەنەمدا و ئەوەبوو خوای گەورەیش ئەمانی پێ داین و دڵنیای کردین لەوەی کە کەمترین ناڕەحەتی ناهێنمە ڕێگاتان و لە سزای پڕ لە ئێش و ئازار بە دووری خستین و چونکە کاتی خۆی لە دنیا زۆر هاوارمان تێ دەکرد و ئەویش سەرداری چاکەکاری و بەزەییە.

پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) – زۆر ترساوە لە خوا – چونکە زۆر شتی دەربارەی خوا و سزا سەختیەکانی زانیووە کە ئێمە یەك لە سەدیشیان نازانین، بۆیە بە شەو خەوی لێ نەدەکەوت و شەونوێژی دەکرد و بە ڕۆژیش بە ڕۆژو بوو، و با پێکەوە گوێ بگرین بۆ ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) کە دەربارەی وتارێکی کاریگەری پێغەمبەرمان (ﷺ) ڕیوایەتێکی هەیە کە جێگای تێڕامان و ترسان و ترسنۆکییە:–

* عن أنس – رضي الله عنه – قال: خطبنا رسول الله (ﷺ) ما سمعت مثلها قطُّ، فقال: ((لو تعلمون ما اعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً)) فغطى أصحاب رسول الله (ﷺ) وجوههم ولهم خنين).[٢]

---

١ الطور، (الآية: ٢٥–٢٨).

٢ متفق عليه، رياض الصالحين، (لا: ١١٧).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك – خزمەتکارە دڵسۆزەکەی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: جارێکیان گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتارێکی بۆ دەداین کە وتاری وا کاریگەرم نەبیستبوو تیایدا دەیفەرموو: ((ئەگەر بتانزانیایە ئەو شتانەی من دەیزانم – و بە من پیشان دراوە – زۆر کەم پێکەنینتان دەهات و زۆر زۆر دەگریان)) و لەم کاتەدا هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو سەریان داپۆشیبوو – یان سەریان داخستبوو و لە ژێرەوە پرمەی گریانیان دەهات.

هەردەم سەردارەکەمان (ﷺ) داوای لە خوای گەورە دەکرد لە دوعاکانیدا کە تەقوای پێ ببەخشێت و بیخاتە ڕێزی لە خوا ترسان و بە پلەی دووەم هێناویەتی لە دوای هیدایەت و ڕێنموونی کردن، واتە هەموو خوشك و برایەك پاش موسڵمان بوون – یان گەڕانەوە بۆ لای ئیسلام لە دوای سەرگەردانی و ڕێ هەڵەکردن دەبێت هەوڵ بدات تەقواو لە خوا ترسان لە خۆیدا بێنێتەدی. وەك دەفەرموێت:

* عن ابن مسعود – رضي الله عنه – ان النبي (ﷺ) كان يقول: (اللهم اني أسألك الهدى والتقى والعفاف والغنى).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) کە یەکێکە لە (عبدالله) مەزنەکانی ئیسلام دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) هەردەم دەیفەرموو: ئەی پەروەردگارم من داوای ڕێنموونی و تەقوا و پاك داوێنی و دەوڵەمەندیت لێ دەکەم..

ئەگەر خەریکی هەر شتێك بوویت لە دنیا و ئەو کارە دوو ڕووی هەبوو نەتدەزانی کام ڕووەی چاکە و پێویستە بیکەیت، پێغەمبەرە نازدارەکەت – محمد – (ﷺ) ڕێگایەکی جوان و ناوازەی بۆ داناویت و بیگرەبەر تا خوات لێ ڕازی بێت:

* عن ابي طريف عدي حاتم الطائي – رضي الله عنه – قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: من حلف على يمين ثم راى اتقى لله منها فليأت التقوى.[2]

واتە: (عدی) (خوای لێ ڕازی بێت) کە هاوەڵێکی دڵسۆزی پێغەمبەر بووە (ﷺ) و کوڕی حاتەمی تەی بووە پیاوە ماڵ بەخشەکەی سەردەمی پێش ئیسلام –

---

١ رواه مسلم – رياض الصالحين، (لا: ٣٢).

٢ رواه مسلم، (١٦٥١) رياض.

دەفەرمووێت: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) دەیفەرموو: ئەگەر سوێندتان لەسەر شتێك خوارد – ویستتان بیکەن – بەڵام بۆتان دەرکەوت لە خوا ترسان و تەقوا لەوەدایە پێچەوانەکەی بکەیت، خێرا ئەوەیان بکە کە لە تەقوای خواوە نزیك ترە و ئەوەی پێشتر کە خۆت دەتویست بیکەیت وازی لێ بێنە.

تەقوا واتە: (ناوێریت حەرام بخۆیت، حەرام بڵێیت، حەرام بکەیت، حەرام ببیستیت، سنوورشکێنی بکەیت هەموو ئەمانە لە ترسی خوای گەورە و بەس) و لە هەموو سەردەم و حاڵەت و بوارێکدا بەم چەشنە بیت وەك پێغەمبەری سەرمەشقمان پێمان دەفەرمووێت:

* قال رسول الله (ﷺ): ((إتق الله حيثما كنت واتبع السيئة الحسنة تمحها وخالق الناس بخلق حسن)).[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێت دەفەرمووێت: ((لە هەر کوێ هەیت و هەرچۆنێ هەیت لە خوا بترسە واتە لە ناو خەڵکیدایت، یان بە تەنهایت، حەرام زۆرو حەڵاڵ کەم بێت، کوفر باڵادەست بێتو ئیسلام زەلیل بێ‌و لە کارو پیشەت دەرت بکەن یان داتنەمەزرێنن بە ملکەچی نەبێت بۆ دوور لە خوایان، تۆ هەر لە خوا بترسەو ڕاوەستاوبە.

ئەگەر جارێك لە جاران لە کاروانی صاڵحان لاتدا بەسەر تۆ لە ڕێگەیەك و گوناهێکت لێ دەرچوو خێرا تەوبەی لێ بکە و پەشیمان بەرەوە و نیشانەیەکیش لەسەر ڕاستی پەشیمانییەکەت پیشانی پەروەردگار بدە و چاکەیەك بکە وەك دوو ڕکات نوێژ یان یەك ڕۆژ بەڕۆژو یان پارەیەك بدە بە هەژارێك یان سوڕەتێك لە قورئان دەوربکەرەوە یان سیلەیەکی ڕەحمی پچڕاو پەیوەست بکەرەوە، ئەو کاتە گوناهەکەت دەسڕێتەوە و لە ناو مەردومیشدا بە ڕەوشتی بەرز تێکەڵی خەڵکی بکە.

ئوبەی کوڕی کەعب (خوای لێ ڕازی بێت) جوانترین پێناسەی کردووە بۆ (تەقوا) کە تا ئەمڕۆ پێناسەیەکی وا جوانم نەخوێندۆتەوە و نەمبیستووە، ئوبەی (خوای لێ ڕازی بێت) دەیەوێت بە نموونەیەکی تەمسیلی زۆر جوان عومەرو هەموو لایەکمان لە ڕاستی تەقوا تێبگەیەنێت، بەم جۆرە پێناسەی کرد:

---

[1] رواه البخاري.

* ورد ان عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) سأل أبي بن كعب (رضي الله عنه) عن التقوى، فقال له: (أما سلكت طريقا ذا شوك؟ قال: بلى، قال: فما عملت؟ قال: شمرت واجتهدت، قال: فذلك التقوى).

واتە: عومەری کوڕی خەتاب – دووەم کەسایەتی مەزنی ئیسلام لە دوای پێغەمبەرمان (ﷺ) جارێکیان پرسیاری کرد لە هاوەڵە شارەزا و خوێندەوارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئوبەی کوڕی کەعب (خوای لێ ڕازی بێت) و پێی وت: تەقوا چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: ئایا بە شوێنێکی دڕکاویدا تێپەڕیویت؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: چیت کردووە لەو کاتەدا؟ فەرمووی: خۆم هەڵکردووە و پێم پاراستووە.. فەرمووی: دەی ئەوە تەقوایە.

بە ڕاستی گوناه دڕك و داڵی ڕێگایە و لە خوا ترسانیش ئەوەیە خۆت هەڵکەیت و هەوڵ بدەیت خۆتیان لێ بپارێزیت چاوت لە نەزەر دەمت لە درۆ، سکت لە پارووی حەرام و گوێت لە بیستنی غەیبەت و گۆرانی حەرام بپارێزیت.. ئەوە تەقوایە خۆ تەقوا ئەوە نییە بترسی لە خوا و بە ناوبردنی زراوت بتۆقێ بەڵکو باوەڕدارانی ڕاستەقینە خوایان خۆشدەوێت و حەز بە بیستنی ناوی دەکەن.

(سید قطب) لە کونجی زیندانەکانی فەرمانڕەوایانی دوور لە خوادا بە تەنیایی دەژیاو لەوێ تەفسیرێکی ناوازەی هەموو قورئانی پێشکەش کردین و لە ڕاڤەکردنی ئەو دڕك و داڵەی کە ئوبەی بۆ عومەری باسکرد شتێکی جوان دەفەرموێت و دەڵێت:

* (فذلك التقوى حساسية في الضمير، وشفافية في الشعور، وخشية مستمرة، وحذر دائم، وتوقٍّ لأشواك الطريق، طريق الحياة.. الذي تتجاذبه اشواك الرغائب والشهوات واشواك المطامع والمطامح، واشواك المخاوف والهواجس، واشواك الرجاء الكاذب فيمن لا يملك الرجاء، والخوف الكاذب ممن لا يملك نفعاً ولا ضراً وعشرات غيرها من الاشواك).[1]

واتە: ئەوە ئەوپەڕی مانای تەقوایە، هەستێکی ویژدانی، هەست ناسکی، ترسانی بەردەوام، و ئاگا لەخۆبوونی هەمیشەییو خۆ پاراستن لە دڕك و داڵەکانی ڕێگا، ڕێگاکانی ژیان کە دڕکی شەهوەت و ئارەزوو پەرستی و دڕکی چاوچنۆکی و

١ في ضلال القران – سيد قطب – رحمه الله – (٤٠/١).

هەڵپەهەڵپو دڕکی ترسنۆکی و دڵەڕاوکێو دڕکی ئومێدی درۆینە بە کەسانێك کە ئومێدی چاکەیان لێ ناکرێت، ترسی درۆینە لە کەسانێك کە قازانج و زیان بە دەست ئەوان نیە و دەیان و دەیان دڕکی تریش.

ئایا بۆ سەیران و گەشت و گوزار چویت بۆ کەژ و کۆسار یان بۆ ڕێواز و قنگر کەندن؟ و شوانت دیوە لە لای ڕانەکەی بێت؟ دەی ئەمجارە شوانەکان وانەی تەقوا و لە خوا ترسانمان فێر دەکەن با پێکەوە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتابدا بچین بۆ گەشتێك:-

* عن عبدالله بن دينار: خرجت مع عمر بن الخطاب – رضي الله عنه – الى مكة فعرسنا في بعض الطريق، فانحدر بنا راعٍ من الجبل، فقال له: يا راع بعني شاة من هذا الغنم، فقال: اني مملوك، فقال له – اختباراً – قل لسيدك أكلها الذئب، فقال الراعي: اين الله؟ فبكى عمر – رضي الله عنه – ثم غدا مع المملوك، فاشتراه من مولاه وأعتقه، وقال: اعتقك في الدنيا هذه الكلمة وارجوا ان يعتقك في الاخرة.[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی دینار دەڵێت: بە هاوەڵی عمری کوڕی خطاب لە مەدینە دەرچووین بەرەو شاری مەککە و لە ڕێگا شەومان بەسەر هات و لەجێیەك لاماندا و لە کێوەکەوە شوانێك – بەمەڕەکانیەوە – بەرەو لامان هات و عمر پێی فەرموو: مەڕێکمان لە مەڕەکانت پێ بفرۆشە ئەی برای شوان، شوانەکەش لە وەڵامدا ووتی: من خاوەنیان نیم و منیش بەندەی کەسانی ترم، وعومەریش – خوای لێ ڕازی بێ – وەك تاقیکردنەوەی باوەڕەکەی پێی ووت: بماندەرێ و پاشان بە گەورەکەت بڵێ گورگ خواردی! شوانەکەیش ووتی: ئەی خوا لە کوێ یە!! ئەم وەڵامە دەریایەك بوو لە تەقوا بۆیە عومەر خۆی پێ نەگیرا و دەستی کرد بە گریان و پاشان گەورەکەی دۆزیەوەو لێی کڕیەوە و ئازادی کرد و پێشی فەرموو: ئەم ووشەیە لە دنیا ڕزگاری کردی لە کۆیلایەتی و تکایشم وایە لە ڕۆژی قیامەتیشدا فریات بکەوێت و لە ئاگر بتپارێزێت.

خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەران و لە ڕیزەکەی ئەودا دەوەستن.. دەی ئایا زانیوتە تەنها لە خواترسی و (متقی)یەکانن ئەو

---

١ تربية الاولاد – عبدالله ناصح علوان (٣٥٦/١).

کەسانە؟ دە سەیری ئەم ڕوداوە غەمناکە بکە و هەنگاوەکانتی پێ خێرا بکە بەرەو کاروانە موبارەکەکەی صالْحان – خوایان لێ ڕازی بێ – :–

* عن عاصم بن حميد عن معاذ بن جبل – رضى الله عنه – لما بعثه رسول الله (ﷺ) الى اليمن خرج معه رسول الله (ﷺ) يوصيه ومعاذ راكب ورسول الله يمشى تحت راحلته، فلما فرغ قال: يا معاذ انك عسى ان لا تلقانى بعد عامى هذا، ولعلك تمر بمسجدى هذا وقبرى، فبكى معاذ خشعاً لفراق رسول الله (ﷺ) ثم التفت واقبل بوجهه نحو المدينة فقال: ((ان اولى الناس بى (المتقون) من كانوا وحيث كانوا).[1]

واتە: عاصمی کوڕی حمید لە موعاذی کوڕی جبل ەوە دەگێڕێتەوە کە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بۆ ناو خەڵکی یەمەن تا بانگەوازی ئیسلامیان لە ناودا بڵاو بکاتەوە و کاتێ ڕەوانەی کرد موعاذ بەسواری وڵاخەکەیەوە بوو پێغەمبەری سەروەرمان پیادەبوو لە تەنیشتی یەوە دەڕۆیشت هەر ئامۆژگاری چاکەی دەکرد.

کاتێ لێ بوویەوە لە قسەکانی پێی فەرموو: موعاز لەوانەیە دوای ئەم ساڵ من نەبینیتەوە و لەوانەیە بدەیت بەلای مزگەوتەکەمدا و بەلای قەبرەکەمدا تێ پەڕیت!.

موعاز – دڵی پڕبوو دەستی کرد بە گریان لە بەر پچڕانی لە پێغەمبەری خوا و وەفاتی خۆشەویستەکەی (ﷺ) پاشان سەرداری ئومەت (ﷺ) لای کردەوە بەلای شاری مەدینەدا و فەرمووی: شایانترین کەس بە من (لە خوا ترسەکانن) هەر کەس بن و لە هەر کوێ بن).

ئەتوانین لە یونسی ئاڵتون چی یەوە وانەیەکی گرینگی تەقوا و لە خواترسان فێر ببین و بیکەینە توێشووی کاروانەکە و لەوانەیە صالْحان ببینن پێمانەوە لە ڕیزەکانی خۆیاندا ناو نووسمان بکەن بەڵام لە تەماح و کڕین و فرۆشتن دا – تەقوا – پیاوی خۆی دەوێت وەك یونسی ئاڵتون چی:

* يروى الامام الغزالى فى احيائه انه كان عند يونس بن عبيد – رحمه الله – حلل مختلف الأثمان، منها بأربع مائة درهم ومنها بمئتى درهم، فمر الى الصلاة، وخلف ابن اخيه الدكان، فجاء اعرابى وطلب حلةً باربع مائة، فعرض عليه من حلل المأتين،

---

[1] رواه امام احمد في مسنده (٢٣٥).

فاستحسنها ورضيها واشتراها باربع مائة درهم فمشى بها وهى على يديه فاستقبلته يونس، فعرف حلّته، فقال للاعرابى: بكم اشتريت؟ فقال: بأربع مئة، فقال: لاتساوى اكثر من مائتين فارجع حتى تردها، فقال الاعرابى: هذا تساوى فى بلدنا خمسمائة وانا ارتضيها.

فقال له يونس: انصرف معى فان النصح خير من الدنيا بما فيها، ثم رده الى الدكان وردّ عليه مائتى درهم ، وخاصم ابن اخيه فى ذلك وقال: أما أستحييت؟ أما اتقيت الله، تربح مثل الثمن وتترك النصح للمسلمين، فقال: والله ما اخذها الا وهو راض بها فقال: هلا رضيت له ما ترضاه لنفسك).[1]

واتە: یونسی کوڕی عبید – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – ئاڵتون چی بوو نرخی – خشڵەکانی – جۆراو جۆر بوو، هەیبوو بە (٤٠٠) درهەم و هەشیبوو بە (٢٠٠) درهەم، و جارێك دەڕوات بۆ نوێژی کۆمەڵ و برازاکەی لە سەر دوکانەکەی دانا.. و ئەعرابی یەك هاتوو داوای خشڵێکی (٤٠٠) درهەمی کرد و بەڵام کوڕەکە خشڵێکی (٢٠٠) درهەمی پێداو ئەویش ڕازی بوو کڕی بە (٤٠٠).

کابرای دەشتەکی ڕۆیشت و ئاڵتونەکانی بە دەستەوە بوو، یونس لە مزگەوەت گەڕایەوە و خشڵەکەی بە دەستیەوە ناسیەوە، بۆیە لێی پرسی: ئەم خشڵەت بە چەند کڕیوە؟وتی: بە (٤٠٠) درهەم، یونس ووتی: ئەوە (٢٠٠) زیاتر ناکات بیگێڕەوە بۆ دوکانەکە، کابرا وتی: من خۆم پێی ڕازیم و لە وڵاتی خۆمان (٥٠٠) درهەم دەکات.

یونس پێی دەڵێ: وەرە لە گەڵمدا، لە ئیسلامدا قسەی خێر لە دنیا و لەوەشی تیایدایە باشترە، و لەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆ دوکان (٢٠٠) درهەمەکەی پێدایەوە، و سەرزەنشتی برازاکەشی کرد و پێی وت: ئەوە شەرمت نەکرد؟ ئەی لە خوا نەترسایت؟ دەتەوێ دوو قات زیادە بسەنیت و قسەی خێر بۆ موسڵمانان نەکەیت؟! ئەویش وتی: سوێند بە خوا خۆی پێی خۆش بوو! وتی: خۆزگە ئەوەی بۆ خۆت پێت ڕازی بوو بۆ ئەویش پێت خۆش بووایە.

---

[1] احياء علوم الدين – للامام الغزالي له (تربية الاولاد)، د. علوان (لا: ٣٥٧٠) وەرگیراوە.

حەسەنی کوڕی علی کوڕی ئەبو طالب – خوای لێ ڕازی بێ – زۆر لە خواترس بووەو هەر کاتێ دەست نوێژی گرتبێ ڕەنگی گۆڕاوە چونکە چاك زانیویەتی بۆ مواجەهەی کێ دەچێت، ئەوەش وانەیەکی گەورە صاڵحێکی پێشینەی ئەم ئومەتە مەزنەیە بزانین خۆی چۆن وەڵام دەداتەوە:

* کان الحسن بن علی بن ابی طالب – رضی الله عنهما – اذا توضأ وفرغ منه، تغیّر لونه، وعندما سألوه عن سبب ذالك، قال: حق علی من أراد ان یدخل علی ذی العرش ان یتغیر لونه).[١]

واتە: ئەمیری باوەڕداران حەسەنی کوڕی علی و کچە زای پێغەمبەری سەردارمان (ﷺ) هەر جارێ دەست نوێژی دەگرت ڕەنگی هەڵدەبڕسکا و تێك دەچوو، بە جۆرێ دەوروبەری هەستیان پێ دەکرد و لە هۆکارەکەی پرسیاریان لێ دەکرد، ئەویش لە وەڵامدا دەیفەرموو: هەر کەسێك بیەوێت بچێتە خزمەت خاوەنی عەرش – جل جلاله – شایانی ئەوەیە ئاسایی نەبێت و ڕەنگی تێك بچێت.

برای بەرپرس – ئیتر سەرۆك کۆماری یان سەرۆك وەزیرانی یان وەزیری یان ئەندام پەرلەمانی یان بەڕێوەبەری فەرمانگەیەکی یان سەرۆك بەشی، لەم نیعمەتە گەورەیە خۆت بێ بەش مەکە و دڵ و دەرونت ئاو بدە بە لە خوا ترسان ئەگەر وانەکەیت ڕێز لە ژێر دەستەکانت ناگریت و ستەمیان لێ دەکەیت و مافیان دەخۆیت و خۆت بە زلتر دەزانیت لە هەموویان!! دەی با گوێ بگرین بۆ شازادە فاطمەی کچی عبدالملك بزانین چۆن باسی ئەمیری باوەڕدارانی هاوسەری دەکات کاتێ صاڵحان دەربارەی عومەر پرسیاریان لێ کرد:

* تقول فاطمة بنت عبدالملك متحدثة عن زوجها – عمر بن عبدالعزیز – رحمه الله – والله ما کان باکثر الناس صلاةً، ولا اکثرهم صیاماً، ولکن والله مارأیت أحداً أخوف لله من عمر، لقد کان یذکر الله فی فراشه، فینتفض انتفاضة العصفور من شدة الخوف، حتی نقول: لیصبحنّ الناس ولا خلیفة لهم).[٢]

---

١ حسن بن علي بن ابي طالب، للدکتور الصلابي، (لا: ٢٠٠).

٢ عمر بن عبدالعزیز – للدکتور الصلابي، (لا: ٦٤).

واتە فاطمەی کچی عبدالملك – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەربارەی عمری کوڕی عبدالعزیز – ی هاوسەری دەدوێت و دەڵێت: سوێند بە خوا لە هەمووان زیاتر نوێژ و ڕۆژووی نەبووە، بەڵام وەڵڵاهی ئەم دیوە هیچ کەسێك بە وێنەی عمر لە خواترس بێت، لەناو جێگەدا خوای بیردەکەوتەوە، لەناو جێگەکەی ڕادەپەڕێ وەك چۆلەکە باڵە تەپەی پێ دەکەوت لە ترسی پەروەردگار تا دەمان ووت: سبەینی ڕۆژ دەبێتەوە و بێ خەلیفە دەبین، واتە دەمرێت.

هەر ئەم عمرە مەزنە – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – ئەوەندە لە خوا ترساوە، هەر ڕووداوێکی سروشتی ڕووی بدایە لەرزی لێ دەهات و دەیووت ئەمە خەشم و قین و توڕە بوونی پەروەردگارە لە بەندەکانی و نامەیشی دەنارد بۆ هەموو سەرۆك هەرێمەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئیسلام و پێی دەوتن چیتان لە دەست دێ خێر بکەن خوا قینی هەستاوە:

* حصلت زلزلة بالشام، فكتب عمر بن عبدالعزيز: اما بعد فان هذا الرجف شئ يعاتب الله به عباده، وقد كتب الى اهل الامصار أن أخرجوا يوم كذا من شهر كذا، فمن كان عنده شئ فليتصدق).[1]

واتە: زەمین لەرزەیەك لە وەڵاتی شام ڕوویدا، و لەو بارەیەوە نامەی نووسی بۆ هەموو هەرێمەکانی و فەرمانی پێدان کە لە ڕۆژی ئەوەندەی مانگی ئەوەندەدا هەموو لە ماڵ دەربچن و هەریەکەش لەوەی هەیەتی لێی ببەخشێت.

ئەمە باوکێکی دڵسۆزە و پەروەردەی دەستی هاوەڵانە و کوڕی عمری کوڕی خطابە و یەکێکە لە(عبدالله) مەزنەکانی ئیسلام و وانەیەکی مەزن پێشکەشی کوڕەکەی و هەموو ئێمەش دەکات کە بە نیازین شوێن پێی کاروانی موبارەکی صاڵحان بگرینەبەر و خۆی بە لە خوا ترسان نازانێت کە بێ گومان یەکێك بووە لەو کاروانە موبارەکە:

* عن هشام بن يحيى الغساني قال: جاء سائل الى ابن عمر، قال لابنه اعطه ديناراً، فلما انصرف قال له ابنه: تقبل الله منك يا ابتاه، فقال: لو علمت ان الله يقبل مني سجدة

---

١ عمر بن عبدالعزيز – للدكتور الصلابي، (لا: ٨٦).

واحد او صدقة درهم لم يكن غائب احب اليّ من الموت، أتدري ممن يقبل: انما يتقبـل الله من (المتقين).[١]

واتە: هشامی کوڕی يحيى الغسانی دەڵێ: سواڵکەرێك هات بۆ لای عبـدالله ی کـوڕی عومەر و داوای خێری لێ کرد، و ئەویش بە کوڕەکەی ووت: دینارێکی بۆ بـەرە و پـاش ئەوەی کابرا ڕۆیشتو ووتی بە باوکی: خوا قبوڵی کات لێت.

عبدالله فەرمووی: ئەگەر دەمزانی خوا یەك سوژدە یان خێرکردنـی یـەك درهـەمی لێ وەرگرتووم ئەوە خۆشترین نادیار لە لام مردن دەبـوو، بـەڵام کـوڕی خـۆم ئایـا ئـەزانی لەکێی وەردەگرێت: تەنها تەقوا دارانن کردەوەکانیان لێ وەردەگیرێ و بەس.

هەر تەقوا و لە خوا ترسانە وا لە مرۆڤ دەکات کـە سروشـتی وا ڕابهێنـێ کـە ئەگـەر شتێکی حەڵاڵیشی برد بۆ دەمی هەڵوێستەیەك دەکات و بە خۆی دەڵێ ئایا بە تـەواوی حەڵاڵە؟ ئەگەر گومانیشی تێدا دروست ببێت نایخواتـەوە و دەڵـێ نـەوەك حـەرام بێـت ئەم وانەیەش الحسن البصری – گەورە صاڵحەکەی ئیسلام– پێشکەشمانی دەکات:

* قال الحسن البصري – رحمه الله – (مازالت التقوى بالمتقين حتى تركوا كثيراً من الحلال مخافة الحرام).[٢]

واتە: حەسەنی بەسری – ڕەحمەتی خوای لێ بـێ – دەفـەرموێت: بـەردەوام تـەقوا کاری کردووە بە تەقواداران کە واز لە زۆر شتی حەڵاڵ دەهێنن لە ترسی ئەوەی نـەبادا حەڕام بێت).

زانایەکی صاڵحی تری ئیسلام نـاوی مـەیمونی کـوڕی مەهرانـە و پێمـان دەڵـێ: لـە خواترسی ڕاسـتەقینە ئەوەنـدە ڕەقـە لەگـەڵ نەفـسی خۆیدا لەسـەر بـچووکترین شـت لێپرسینەوە و لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکات و تەشبیهی دەکات بە شەریکێکی چروك و ڕەزیل کە لە بچوکترین شتدا لێپرسینەوەی لەگەڵ شەریکەکەیدا دەکات:

* عن ميمـون بـن مهـران – رحمـه الله – قـال: (المتّقـي أشـد محاسـبةً لنفـسه مـن الشريك الشحيح لشريكه).[٣]

---

١ صفة الصفوة (١/٢٩٤).

٢ جامع العلوم والحكم (ل: ١٤٩).

٣ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

واتە: مەیمون ی کوڕی مەهران – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێ: (لە خوا ترس بە جـۆرێکی وا وردەکـاری لێپرسـینەوە لەگـەڵ دڵ و دەروونـی خۆیـدا دەکـات وەك شەریکێکی چرۆك و بەخیل چۆن لەسەر یەك فلس لێپرسینەوەی لەگەڵ شـەریکەکەی خۆیدا دەکات).

ئێمە ئەگەر هاوار بکەینە خوای گەورە، ئیتر وا دەزانین هیچمان نەهێشتۆتەوە بەڵام صاڵحان هاواریان کردۆتە خوا بەڵام جاری وا هەبووە نەیان وێراوە هـاواری تێبکـەن لـە ترسی ئەوەی نەوەك جوابیان نەداتەوە و بڵێ نەخێر بـانگم مەکـە تـۆم نـاوێ و دڵسۆز نیت (پەنا بەخوا):

* عن عبدالله بن الجلاء: كنت بذى الحليفة وانا اريد الحج والناس يحرمون فرأيت شاباً يريد الاحرام وانا أنظـر اليـه فقـال: يـارب أريـد ان أقـول: لبيـك اللـهم لبيـك، واخـاف ان تجيبنى لا لبيك ولا سعديك).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی جلاء دەڵێ: لە ناوچەی (ذو الحليفة) بووم و نیازی حەج کردنم هەبوو و خەڵکیش خـەریکی پۆشـینی بـەرگی ئیحـڕام بـوون، گـەنجێکم بینـی خـەریکی پۆشینی ئیحرام بوو، من سـەیرم دەکـرد دەیـووت: ئـەی پـەروەردگارم ئەمـەوێت بڵـێم (لبيك اللهم لبيك) واتە: ئەوا هاتم بە دەمتەوە پەروەردگارم واهاتم بەدەمتەوە، ئەترسم تـۆش لـە وەڵامـدا بڵێـی : (لا لبيـك ولاسـعديك) واتـە: بـەڵام نـەدێم بـە دەمتـەوە و نـە بەختەوەریتم دەوێت.

برا و خوشکی موسڵمانم ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە بە چ ڕوویەکەوە دەگەڕێیتەوە بۆ لای خـوا لـە کاتێکدا ئـەو هـەموو گونـاه و سەرپێـچی و کەمتەرخەمییانـەت لـە ژیانـدا ئەنجامداوە، بۆیە باش وایە بڵێیت: خوایە گیان وام لێ بکە ڕووم بێت بمرم و بێمـە بـەر دەستت، ئەمە ژنە صاڵحەیەکە و لەم بارەیەوە وانەیەکی ناوازەمان پێ دەبەخشێت:

* عن احمد بن ابي الحوارى قال: قلت لأم هارون: أتحـبين المـوت؟ قالـت: لا، قلـت: ولم؟ قالت: لو عصيت آدمياً ما احببت لقاءه.. فكيف احب لقاء الله وقد عصيته).[2]

---

١ صفة الصفوة (٣٢٩/٤).

٢ صفة الصفوة (٢٥١/٢).

واتە: ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری دەڵێ: بە دایکی هاروونم ووت: – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – حەز لە مردن دەکەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی:نەخێر ، دەڵێ ووتم: بۆچی حەز ناکەیت؟ ووتی: – کوڕی خۆم – من ئەگەر سەرپێچی ئادەمیزادێکم کردبێت حەز ناکەم ڕوو بەڕووی ببمەوە.. چ جای حەز بکەم بگەڕێمەوە بۆ لای خوا کە سەرپێچی زۆریم کردوە؟!.

لە خوا ترسەکان خۆیان لە سەرپێچی کردنی خوا دەپارێزن لە قەرەباڵغی و لە پەنهانیدا وەك ئەو کەسە وان کە دەیەوێت شتێك بدزێت کە سەر هەڵدەبڕێت دەبینێ لە هەموو لایەکەوە کامێرەی چاودێری دانراوە و سەیری دەکەن ئایا چی دەکات؟ بێگومان دەست لە تاوانەکەی هەڵدەگرێت سەیری ئەم خوشکە صاڵیحە بکە چۆن لە چاودێری خوایی دەترسێت:

* قال العتبی: لقی رجل اعرابیة فأرادها علی نفسها، فأبت وقالت: أی ثکلتك أمك! أما لك زاجر من کرم؟ أما لك ناه من دین؟ قال: قلت: والله انا لا یرانا الا الکواکب! قالت: واین موکبها؟[1]

واتە: عەتەبی دەڵێ: پیاوێك لە جێ یەکی چۆڵدا دەگات بە ژنێکی دەشتەکی و داوای کاری بەدڕەوشتی لێ دەکات، ئەو خوشکەیش لە وەڵامدا دەڵێ: دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، ئایا کەرەم و ڕێزت بەرگریت لێ ناکەن لەم کارە؟ یان ئیسلامەتیت بەرگریت لێ ناکات؟ ئەویش ووتی: سوێند بە خوا جگە لە ئەستێرەکانی ئاسمان کەس نامان بینێت، ئافرەتەکەش ووتی: ئەی ڕاگیرکەری ئەو ئەستێرانە لە کوێ یە؟! کابرا سەری داخست و ڕۆیی.

خوشك و برایانم.. توخوا با تەقوا و لە خواترسان لە ناو دڵماندا دروست بکەین چونکە زۆر سروشتیە کە لەوێ دەست دەکات بەنەشتەرگەری و ئارەزوو پەرستی و دنیاچێتی و ڕق و کینە و حەسودی دەکات و ئەو وەرەمە سەرەتانیانە دەسوتێنێ و ئیبراهیمی کوڕی شەیبان ئەم ڕاستیەمان لە دێڕێکی کورتدا بۆ دەردەخات:

---

١ الجامع لشعب الایمان – (٢/٥٠٦).

* قال ابو بكر الرازي: سمعت ابراهيم بن شيبان – رحمه الله – يقول: الخوف اذا سكن القلب احرق موضع الشهوات منه، وطرد رغبة الدنيا عنه واسكت اللسان عن ذكر الدنيا).[١]

واتە: ئەبو بەکری ڕازی – زانا مەزنەکەی ئیسلام – دەڵێ: لە ئیبراهیمی کوڕی شەیبانم بیست کە دەیفەرموو: (هەرکاتێ ترسی خوا لە ناو دڵمدا ڕیشکی داکوتا شوێنی ئارەزوو پەرستی دەسوتێنێ و دنیا پەرستی ئەفڕێنێ و زمانیش لاڵ دەکات لە باسکردنی شتی دنیایی).

حەز دەکەیت بزانیت کێ لە خواترسە و تەقوای لە ناو دڵدا هەیە؟ دەی عبدالله ی کوڕی زوبێر – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – جوابی ئەم پرسیارەت دەداتەوە و نیشانەکانیت بۆ ڕۆشن دەکاتەوە:

* عن وهيب بن كسال قال: كتب اليّ عبدالله بن الزبير – رحمه الله – بموعظة، فقال: أما بعد فان لاهل التقوى علامات يعرفون بها من أنفسهم: من صبر على البلاء، والرضا بالقضاء، والشكر للنعمة، والذلّ لحكم القرآن).[٢]

واتە: وەهیبی کوڕی کەسال دەڵێ: عبدالله ی کوڕی زوبێر – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – نامەیەکی ئامۆژگاری بۆ نووسیم و تیایدا فەرمووی: (پاشان.. لە خواترسەکان چەند نیشانەیەکیان هەیە کە پێی ناسراون و لە خۆیان باشتر دەناسرێن پێیان: یەکەم: بە سەبر و ئارامن لەسەر نەهامەتی و بەڵا و موسیبەت، دووەم: ڕازین بە قەزا و قەدەری خوایی، سێ یەم، هەردەم سوپاس گوزاری خوان لەسەر نیعمەت و بەخششەکانی. چوارەم: سەرکزن لەبەردەم حوکم و فەرمانی قورئانی کەریمدا).

ئەی برای کاروان سەرام.. ئەگەر بمانەوێت بچینە ناو کاروانەکەوەو لە قیامەتیشدا لە ئەهلی بەهەشت بیت: ئەوا دڵت با پڕ بێت لە ترس و خەفەت، خەفەتی ئەوەی نەوەك نەچیتە بەهەشت! نەوەك کردەوەی چاکت لێ وەرنەگیرابێت! نەوەك ئیخلاصت

١ الجامع لشعب الايمان – (٢/٥٠٩).

٢ جامع العلوم والحكم (لا: ١٤٩).

**نەبووبێت! ئەوەك (سوء الخاتمة) بیت! چونکە بەهەشتیەکان سوپاسی خوا دەکەن کە خەفەتیان نەماوە:**

عن بكير عن ابراهيم قال: ((ينبغي لمن لم يحزن ان يخاف ان لا يكون من اهل الجنة لأنهم قالوا: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ﴾[١] (فاطر: ٣٤).

**واتە: بەکیر دەڵێ: ئیبراهیم فەرموویەتی: (شایانە ئەو کەسەی کە دڵی خەفەتبار نییە بۆ خوا و دواڕۆژی خۆی لە قیامەتدا کە لەوە بترسێت ئەهلی بەهەشت نەبێت چونکە بەهەشتیەکان لە بەهەشتدا دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ترس و دڵەڕاوکێی لە دڵەکانماندا لابرد و نەیهێشت.**

**سێ جۆر لە خوا ترسان هەیە کە جۆری سێیەمیان تەنها لە صاڵحاندا بەدی دەکرێتو بەس، با بزانین ئەو سێ جۆرەی کە گەورە صاڵحی ئومەت لە بەغداد چۆن باسی لێوە دەکات:**

* أخبرنا ابو عبدالرحمن السلمي فيما حكى عن السري السقطي – رحمه الله – قال: الخوف على ثلاثة أوجه: خوف في الدين وهو موجود في العامة يعلمون إنه يجب الخوف من الله تعالى، وخوف عارض عند تلاوة القران والقصص رقة كرقة النشائس لها ثبوت، وخوف مزعج مقلق ينحل القلب والبدن ويذهب بالنوم والطعم ولا يسكن خوف الخائف ابداً حتى يأمن ما يخاف.[٢]

**واتە: (عبدالرحمن السلمی) لە پیاو صاڵحی مەزنی شاری بەغداد – سەری سەقەتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: سێ جۆر ترسان لە خوای گەورە هەیە: یەکەم: ترسێکە لە ئیسلامدا بە گشتی هەموو موسڵمانان هەیانە و دەزانن کە پێویستە لە خوا بترسێت. دووەم: ترسێك کاتییە و لە کاتی قورئان خوێندن و چیرۆکی کاریگەردا دڵی نەرم دەبێت و دەترسێت لە پەروەردگار. سێیەم: ترسێکی بێزارە و دڵەڕاوکێیەتی و خەریکە دڵ و گیانی لە ناو دەبات، و خەو و خۆراکی لێ**

١ الجامع لشعب الايمان – (٢/٥١٦).

٢ الجامع لشعب الايمان – (٢/٥٢١).

هەڵدەگرێت و ئەم ترسەیشی هەمیشەییە و لە کۆڵی نابێتەوە تا دڵنیای دەکەن لەوەی لێی دەترسێت.

ئایا ئەزانی لە خوا ترسان و تەقوا ئەگەر لە ناو دڵدا هەبوو جێگەی عەقڵ و ژیری دەگرێتەوە و کەسەکە دەباتە ڕێزی عاقڵ مەندان و چاك لە ناو کرۆکی دنیا تێدەگات ئەمەش خوشکێکی موسڵمانی لادێی ئەم وانەیەمان تێ دەگەیەنێت:

* عن ابو عبدالرحمن القرشيٍ عن رجل من بني ثعلب قال: شهدت إمرأة من أهل البادية توصي إبناً لها أراد سفراً فقالت: يا بني أوصيك بتقوى الله، فان قليلها إجدى عليك من كثير عقلك.[1]

واتە: (عبدالرحمن القریشی) لە پیاوێکی بەنی سەعلەبەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئافرەتێکی خەڵکی بیاباننشینم بینی ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد کە نیازی سەفەرێکی هەبوو، پێی وت: کوڕی خۆم وەسیەتت پێ دەکەم بە تەقوای خوا چونکە کەمێ تەقوای خوات هەبێت لە زۆرێك لە عەقڵ و ژیری باشترە.

برای موسڵمانم، خوا زۆر لەوە شایانتر کە ئێستا لێی دەترسیت.. ئەم ترسەمان زۆر کەمە و ناتوانێ بمانباتە ڕیزی صالحانەوە، بەڵکو هەر عەیبە بچینە ناو کاروانەکەیانەوە، کورە خوا زۆر لەوە گەورەترە و دەبێت زۆر زیاتر لێی بترسین.. براکەم خوا هەڕەشەی زۆر گەورەمان لێ دەکات بۆ ئەو ڕۆژەی دەچینەوە بەردەستی، بەوە مەخەڵەتێ کە لێرە بێ گوێیی خوا دەکەیت و بێ دەنگە لە ئاستت و ناتکات بە بەراز و سەگ! ! هەڵی دەگرێ بۆ ڕۆژی خۆی، سەیری پیاوصالحی ئوممەتەکەت بکە – حەسەنی کوڕی صالح – بزانە چۆن هەڕەشەکانی پەروەردگار ئەیهەژێنێ و ئەیگرێنێ و ئەیتەزێنێ؟

قال احمد بن يحيى الصولي قال: حدثني جعفر بن محمد بن عبيدالله، قال: سمعت جدي عبيدالله بن موسى يقول: كنت أقرأ على (علي بن صالح) – رحمه الله – فلما بلغت الى قوله (فلا تعجل عليهم)* سقط الحسن بن صالح يخور كما يخور الثور، فقام اليه عليّ فرفعه ومسح على وجهه ورش عليه الماء واسند اليه).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/٢١٩).

* مريم: ٨٤.

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/٥٤٣).

واتە: احمد ی کوڕی یحیی الصولی دەڵێ: جعفری کوڕی محمدی کوڕی عبیداللە دەیووت: لە باپیرمم بیستووە – عبیداللە ی کوڕی موسی – کە دەیووت: ڕۆژێك قورئانم دەخوێند بەسەر علی کوڕی صالح دا – کە لەو کاتەدا حسن ی کوڕی صالحی برایشی لەوێ بوو – گەیشتمە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: (فلا تعجل علیهم) واتە: پەلەم لێ مەکە بۆیان! ! ڕۆژی خۆیان دێ – ئەزانم چیان لێ دەکەم – ، بە بیستنی ئەو ئایەتە حسن کەوتە سەر زەوی و وەك گا دەیبۆڕاند و دەگریا و لە هۆشی خۆی چوو، تا ئەوە بوو علی کوڕی صالح ی برای هەستا و دەم و چاوی سڕی و ئاوی پرژاند لێی و پاڵی دایەوە بە دیوارەکەوە..

ئاخر – برای خوێنەری صالح – چۆن وانەبێت – حەسەن – ؟! ئەی لە ئایەتێکی تردا خوای رب العالمین ئاگادارمان ناکاتەوە لە ترسناکی و خەشم و قینی خۆی؟ وەك پادشایەك کە خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لە زەبر و زەنگی خۆی بۆ سەرپێچی کارانی فەرمانەکانی:

* قال الله تعالی: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥ﴾.[1]

واتە: خوای – عز وجل – لە تورەبوون و خەشم و قینی خۆی و سزا سەخت و سوتێنەرەکانی ڕۆژی قیامەت و دابەزاندنی بەڵا و موسیبەت بۆ سەرپێچی کارانی لە دنیایشدا – ئاگادارمان دەکاتەوە و دەمان ترسێنێت.. ئەمەش خۆشەویستیەکی تری خوایە بۆ بەندەکانی و وەك چۆن مامۆستایەك قوتابییەکانی خۆی خۆش دەوێت و پێیان دەڵێ: ئاگاداربن ، پرسیارەکانم قورسە سەعی زۆر بکەن و فلان بابەت و فلان بابەت زۆر بخوێننەوە چونکە زۆرگرنگن..

(سبحان الله) ترسان لە خوای گەورە – موعجیزە دروست دەکات – غیرەت و جوامێری لە موسڵمانانەدا دروست دەکات ئەگەر دڵی یەکلابکاتەوە بۆ خوا و تەنها و تەنها ترسی ئەوی تێدا بێت، بێگومان لە هیچ شتێکی تر ناترسێت و بە زۆری و پڕ چەکی سوپای کافران، مسقالە زەرەیەك ترس نەچووەتە دڵی.. دە سەیری ئەم

---

[1] سورة ال عمران: (٢٨).

نموونەیە بکە و ئەوجا مەپرسە موسڵمانان چۆن چاری ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕوم و هند و چینیان کردووە:

* عن زيد بن وهب – قال – غزونا فمررنا باجمة في مكان مخوف، فاذا رجل نائم عند فرسه قلنا ابا عبدالله مالك؟ قال: ومالي؟ قلنا: فى مثل هذا المكان تنام؟ قال: اني لأستحي من ربّي ان يعلم اني اخاف شياً غيره).[١]

واتە: زەیدی کوڕی وەهەب دەڵێ: لە غەزادا بووین زۆر ترسناك بوو دامان بە لای کونێکدا – لە ناو جەرگەی جەنگەکەدا بوو – دەبینین پیاوێك لێی خەوتووە لە پاڵ ئەسپەکەیدا! و ڕۆیشتینە سەری و پێمان ووت: ئەوە چیتە برا گیان؟ – ترسابوون بریندار بێت یان نەخۆش – ووتی: بۆچی من چیمە؟ ووتیان: لەم گەرمەی جەنگەدا بەبێ خەم خەوتوویت و ناترسیت – ئایا ئەمە کاتی خەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی: من شەرم دەکەم لە پەروەردگارم کە بزانێت لە شتێکی تر دەترسم جگە لە خۆی.

ئەمەش خەلیفە صاڵحە چاکسازەکەی ئیسلامە و عمری کوڕی عبدالعزیزە– ڕەحمەتی خوای لێ بێ – لە ووتەیەکی کورتدا پشتگیری ئەو پیاوە بەغیرەتە نەترسە دەکات و دەفەرموێت:

* عن علي بن عثام: قال عمر بن عبدالزيز – رحمه الله – ((من خاف الله أخاف الله منه كل شي، ومن لم يخف الله خاف من كل شئ ))[٢].

واتە: علی کوڕی عوسام دەڵێ: عمری کوڕی عبدالعزیز فەرموویەتی: هەر کەس لە خوا بترسێت، خوایش وای لێ دەکات هەموو شتێك لێی بترسێت، و هەر کەسیش لە خوا نەترسێ، لە هەموو شتێکی تر دەترسێت).

ئەگەر هەورێکی ڕەش لەگەڵ ڕەشەبایەکی توند هەڵیکردایە پێغەمبەرە نازدارەکەمان (ﷺ) ڕەنگی تێك دەچوو – ترس ڕووی تێ دەکرد و خەمی لێ دەهات، کاتێ هەورەکە دەبوون بە باران ئەوجا دڵنیا دەبوو کە خەشم و قین و توڕەیی پەروەردگار نەبووە:

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/٥٥٤).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٥٥٥).

* عن عطاء بن أبي رباح أنه سمع عائشة زوج النبي (ﷺ) تقول: كان رسول الله (ﷺ) اذا كان يوم ذا ريح وغيم عرف ذلك في وجه رسول الله (ﷺ) فاقبل وأدبر، واذا مطرت سرّي عنه وذهب عنه ذلك، قالت: سألته، فقال: اني خشيت ان يكون عذاباً سُلّط على أمتي).[1]

واتە: گەورە تابعینی لە خوا ترس: عەتای کوڕی ئەبی ڕیباح – لە عائیشە خاتوونی خێزانی پێغەمبەری خوای بیستووە کە دەیفەرموو: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر کاتێ هەورێکی ڕەش و با و بارۆتە بهاتایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەنگی تێك دەچوو – ئۆقرەی لێ دەبڕا و دەهات و دەچوو، بەلام هەر کە هەورەکە دەبوو بە باران پێغەمبەر(ﷺ) هێور دەبوویەوە و ڕەنگی دەهاتەوە سەرخۆی، و کاتێ لە هۆی ئەوەم پرسی لێی: لە وەلامدا فەرمووی: من لەوە ترسام کە سزا و تووڕەبوونێکی خوا بێت و بۆ سەر ئوممەتەکەم دابەزیبێت.

هاوەلانی بەڕێزیش – خوایان لێ ڕازی بێت – نوسخەیەکی (طبق الاصل)ی پێغەمبەرەکەیان بوون – بۆیە ئەوانیش لە کاتی ڕوودانی کارەساتە سروشتیەکاندا ڕەنگیان تێك دەچوو، دەستیان دەکرد بە گریان و لە خوا دەپاڕانەوە کە خەشم و قین‌و تووڕەیی خۆی نەبێت بۆ مرۆڤە سەرکەشە تاوانبارەکان:

* عن ثمامة: عن انس بن مالك – رضي الله عنه – قال: كنت أصنع خبزةً لهم فسمعت نقيض الارض فخرجت فاذا الأرض قد تشققت، واذا أصحاب رسول الله (ﷺ) يبكون ويدعون، حتى ذهبت.[2]

واتە: سەمامە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: من لە ژوورەوە بووم نانم ئەکرد، گوێم لە دەنگێك بوو لە زەویەوە دەرچوو، بە پەلە هاتمە دەرەوە دەبینم زەوی قلیشێکی گەورەی تێکەوتووە، و لەو لایشەوە هاوەلانی پێغەمبەرم بینی – خوایان لێ ڕازی بێت – دەگریان و دوعایان دەکرد، تا زەوی هێمن‌و ساکت بوویەوە.

---

١ اسناده صحيح، الجامع (٢/٥٦٤).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/٥٦٥).

**هاوەڵانی پێغەمبەرمان – پێشەوایانی صالْحان –ئەوەندە لە خوا ترساون هەر کە ڕووداوێکی سروشتیان بینیبێت خێرا بەرەو مزگەوت ڕایان کردووە و دەستیان کردووە بە نوێژ و گریاون و قورئان خوێندن و پاڕانەوە نەوەك خەشم و تووڕەیی (رب العالمین) بێت لە بەندەکان:**

* حدث عبيدالله بن النضر قال: حدثني ابي: انها كانت ظلمة على عهد انس حتى كان النهار مثل الليل، قال: فأتيته بعد ما أنجلت، فقلت: يا ابا حمزة هل كان يصبكم مثل هذا في عهد رسول الله (ﷺ)؟ قال: معاذ الله، إن كانت الريح لتشدّ، فنبتدر الى المسجد أينا يدخله أولاً.[١]

**واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی نەزر دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم کە لە سەردەمی ئەنەسی کوڕی مالیکدا – خوای لێ ڕازی بێت – بە جۆرێك دنیا تاریك بوو کت و مت وەك شەوە زەنگی لێهات، دەڵێ: لە پاش ئەوەی دنیا ڕووناك بوویەوە هاتم بۆ لای ئەنەس و لێم پرسی: ئایا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتی وا ڕووی دەدا؟ لە وەڵامدا فەرمووی: پەنا بە خوا لە شتی وا، ئێمە لەو کاتەدا ڕەشەبایەکی توندیش هەڵی بکردایە، خێرا بەرەو مزگەوت ڕامان دەکرد پێشبڕکێمان بوو لەوەی کە کێ زووتر خۆی بکات بە مزگەوتدا.**

---

**١ اسنادە لا باس بە – الجامع لشعب الایمان (٢/٥٦٦).**

# دووەم

## لە هاتنی ڕۆژی قیامەت ترساون:

خوای گەورە لەبەر حیکمەتێکی زۆر گەورە، ڕۆژی قیامـەتی ترسـناك كـردووە و بـە ناهەموارترین ڕۆژ وەسفی دەكات بۆمان و لـە لامـان ترسـناكی دەكـات بـە جـۆرێ كـە هەموو ناڕەحـەتی و بوردومـان و بومەلـەرزە و لافـاو هەیـە هیـچی ناگاتـە یـەك لەسـەر سەدی ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە..

چونكە لە دنیا كەس نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی دایك لە منداڵەكەی ڕا بكات و سك پڕ سكەكەی فڕێ بدات و خەڵكی وەك سەرخۆشان عەقڵ لە دەست بدەن و كوردی خۆمان جوانیان وتووە كە ئەگەر كارەساتێ ناهەموار بێت دەڵێت: ئەڵێی ڕۆژی قیامەتە! یان لە ڕۆژی حەشر دەچوو:

* قال سبحانه وتعالى في قرانه الكريم: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢﴾.[1]

واتە: خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی خەڵكینە ئەی نەوەكانی ئادەم، ئەی ئەو داماوانەی لەسەر ئەستێرەی زەوی دەژین، ژێر بن لە خوا بترسن و لە ڕووداوی ترسناكی هاتنی ڕۆژی قیامەت بترسن كە وەك زەمین لەرزەیەكی وا گەورەیە پێوەری ڕێختەر نەیخوێنێتەوە — ئەو ڕۆژە ڕۆژێكە هەموو شیردەرێك لە كۆرپەكەی ڕا دەكات و حەز ناكات بیبینێت، و ئافرەتانی سك پڕ لە ترسناكی ئەو ڕۆژە سكەكەیان لەبار دەچێت و خەڵكی ئاگایان لە خۆیان نامێنێت و وەك سەرخۆش وان كە لە ڕاستیدا سەرخۆش نین — ئارەق و مەی لەوێ چی دەكات؟ — بەڵام سزا و ئەشكەنجەكەی خوا زۆر سەخت و پڕ لە ئێشە.

---

١ سورة الحج، (الآية: ١-٢).

ئەگەر پاشایەك لە شوێنێكدا داتبنێت و بڵێ ئەم كارانە بكە و ئەم كارانەش مەكە و دوای یەك ساڵی تر بانگتان دەكەمەوە بۆ لای خۆم و بزانم كامێرە شاراوەكانم دەڵێ چیتان كردووە لەو كارانەی داومە بەسەرتاندا و چیشتان نەكردووە لەو كارانەی قەدەغەم كردوون؟.

جا بۆ نەگبەتی ئەم داماوانە، قەدەغەكراوەكان زۆر خۆش و بە لەزەتن و دەروون حەزی پێیانە هەرچەند زیان بەخشن بەڵام كارە فەرمان پێكراوەكان زۆر وشكو ناڕەحەتو قورسن لەسەر دەروون، بۆیە هەندێ لەو كەسانە لە بیریان چوو كە دەگەڕێنەوە بەردەمی ئەو پاشایەو لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكات! بۆیە پیس دەستیان دایە كارە قەدەغەكراوەكان و تا لووتیان تیا غەرق بوون..

بەڵام كەمینەیەكی كەم هەر خەیاڵیان لە لای ئەو ساتە بوو كە ساڵەكە تەواو دەبێتو دەگەڕێنەوە بەردەستی پاشا، بۆیە زۆر لەو ساتە وەختە دەترسان كە دەگەڕێنەوە بەردەمی پاشایان و فەرمانی لە سێدارەدان دەردەكات بۆ سەرپێچیكارانو فەرمانی پێشوازی گەرمو ڕووی خۆش و خەڵات و بەخششی لە سنوور بە دەریش دەدات بەو كەمینەیەی كە خۆیان لە قەدەغەكراوەكان پاراستبوو و دەستیان دابوویە كردنی كارە فەرمان پێكراوەكان..

دەی برای موسڵمانم.. ئەزانی پاشای هەموو جیهان – رب العالمين – بە سۆزێكەوە لە قورئانە پیرۆزەكەیدا پێت دەڵێت.. ڕۆژێكی زۆر ترسناكتان لە پێشە و لە یادی مەكەن، ئەو ڕۆژەی دێنەوە بەردەستم بە كێوێ گوناهەوە و ئەو كاتە هیچ فریاتان ناكەوێت:

* قال رب العزة في محكم كتابه العزيز: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ﴾.[1]

واتە: ئەی هەموو خەڵكی سەر زەوی – چ لە ئەورووپای یان لە ئاسیای یان لە ئەفریقیای ڕەش پێستی یان لە دوو ئەمریكاكەیت یان لە هەر جێیەكی تریت – دەخیلتان بم.. تا بۆتان دەكرێت لەو ڕۆژە بترسن كە دەگەڕێنەوە بەردەمی پەروەردگارو دادگایی وردتان لەگەڵدا دەكات بۆیە خۆتان بگرنو زاڵ بن بەسەر

---

١ سورة البقرة، (الآية: ٢٨١).

دەروونتانـاداو سەرپێـچیم مەکـەن چـونکە لـە دنیـا چاوپۆشـیتان لێ دەکـەم بـەڵام هەموویتان بۆ کۆدەکەمەوە بۆ قیامەت و خۆم ئـەزانم چ سـزاگەلێکم بـۆ ئامـادەکردوون کە بەرد و ئاسنیش بەرگەی ناگرن چ جای خوێن و گۆشتی مرۆڤی بێ ئاگاو داماو!.

لە جێگەیەکی تری قورئانەکەیدا وەك باوکێکی بە سۆز بۆ جگەرگۆشەکەی کە چەند جار دوو بارەی دەکاتەوە کە سزات ئەدەم ها ئەگەر بە گوێم نەکەیت و فلان کارمان بۆ نەکەیت و وات لێ دەکەم وات لێ دەکەم..

خوای – عز وجل – پێمان دەفەرموویێت: ئاخر چۆن لە خوا ترس و بە تەقوا دەردەچن لە کاتێکدا کە باوەڕتان نەبێت بە ڕۆژێکی ئەوەندە سەخت کە منداڵی بچووك سەر سپی دەکات تیایدا! ئەی خوایە بمانپارێزە لەو ڕۆژەدا.. دەبێ چ ڕۆژێ بێت کە منداڵ لە (٤٠) ساڵی بە دواوە تەڵەتەڵە سپی دەکەوێتە سەر و ڕیشی؟!

* قال الله سبحانه وتعالى: ﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾﴾[١].

واتە: مەحاڵە ئێوە ببنە پیاوی باش و لە خوا ترس و بچنە ڕیزی صاڵحانەوە لە کاتێدا باوەڕتان نەبێت یان کز بێت بە ڕۆژی زیندووبوونەوە ئەو ڕۆژەی کە ئەوەندە سامناك و ترسناك و ناهەموارە منداڵی ناو بێشکە پیردەکات و سەری سپی دەبێت!!

یاالله.. بمانپارێزە لەو ڕۆژەدا.. یاالله باوەڕمان بەو ڕۆژە پتەو بکە و بمانخەرە ڕیزی ئەوانەی کە بە چاوی مەڕحەمەت و سۆزەوە لە ناو مەحشەردا بۆمان دەڕوانیت.

دیسان پەروەردگارمان لەسەر زمانی ئیمام عەلی و فاطمەی خێزانی وانەیەکی قیامەتزانی مەزنمان دادەدات، کە ئەوەندە باوەڕیان بەو ڕۆژە پتەو بووە هەموو کارێکی خێریان لەبەر ئەو ڕۆژە ناهەموارە کردووە.

قال الله تعالى: ﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾﴾[٢].

---

١ سورة المزمل، (الآية: ١٧).

٢ سورة الانسان، (الآية: ١٠–١١–١٢).

واتە: ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوای لێ ڕازی بێت) و فاطمەی خێزانی – خانەوادەیەك لە تەقوا، خێزانێك لە موسڵمانەتیو کاری چاکە، پاروە نانەکەی دەمیان– کە دەبوایە بەربانگیان پێ بکردایەتەوە دایان بە سواڵکەرێکی هەتیووی بێ باوكو لە ڕۆژی دووەمدا خەریك بوو بەربانگ بکەنەوە لە دەرگا دەبینن ئەسیرێکەو ڕزگاری بووە بەڵام برسیەتیو داوای خواردن دەکات، سەیرێکی یەکتریان کردو پێکەوە نانەکەیان بەخشی پێیو لە ڕۆژی سێیەمدا ویستیان بەربانگ بکەنەوە دیسان هەژارێکی برسی دای لە دەرگاو چوون بە دەمیەوە دەبینن زۆر برسیەتیو داوای پاروە نانێ دەکات! ئەمانیش چونکە پەروەردەی دەستی پێغەمبەری دەستو دڵ جوان بوون خێرا بەبێ سێ و دوو نانەکەیان بەخشی پێی و بە برسێتی مانەوە.

پاشان پێکەوە ڕوویان کردە قیبلەو وتیان: ئێمە لەم کارەماندا لە خوای خۆمان دەترسینو ڕۆژێکی ترسناك و عەبوسو ناشیرینو قەمتەریرمان لەبەر دەمدایەو دەبێت پارووی دەممانی لە پێناودا ببەخشینو سەری خۆمان ڕزگار بکەین لە ئاگری دۆزەخو خوایش لە خراپەی ئەو ڕۆژە پاراستنیو خستنیە ناو بەهەشتی خۆشی نەبڕاوە و پڕ لە کامەرانیەوە..

ئەی خوشك و برای موسڵمانم.. من و تۆ لەم سەردەمە بێ بڕوایەدا هێشتا بە تەواوی نامانەوێت لەو ڕۆژە ناهەمواره بترسین و کاری چاکەی بۆ بنێرین و لە کردەوەی خراپ خۆمان بە دوور بگرین.. کەچی پێشەوا و سەرمەشقە ئازیزەکەمان– محمد المصطفی– ﷺ– نەیتوانی وە دڵی خۆش بێت و ژیان بە پێکەنین و خۆشی و ڕابواردن بەسەربەرێت و لەو بارەیەوە فەرموویەتی:

* قال رسول الهدی(ﷺ): ((کیف أنعم و صاحب الصور قد التقم القرن وحنی الجبهة واصغی بالأذن ینتظر حتی یؤمر فینفخ)).[1]

واتە: پێغەمبەری ڕێنمونی(ﷺ) دەفەرموێت: ((چۆن دڵخۆش بم.. چۆن کامەرانو بێ خەم بم کە فریشتەی خاوەنی (صور) کە کاری ئەو کۆتایی پێ هێنانی دنیایەو بەردەوام شاورەکەی بە دەمەوەیەو سەری داخستووە بۆ زەویەکەو گوێی هەڵخستووە

[1] احیاء علوم الدین (٥١٢) الحدیث اخرجه الترمذي و قال حدیث حسن.

و لەژێرەوە بە چاویش سەیری عەرش دەکات بزانێت کەی ئامـاژەی پـێ دەدرێت لەلایەن خواوە و فوو بکات بە شاورەکەداو دنیا خاپور بکاتو هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی بمرێنێت.

ئەمیری صالّحان – عمری کوڕی عبدالعزیز– خوای لـێ ڕازی بـێ– زۆر لە ڕۆژی قیامەت ترساوە و لە هیچ ڕۆژێکی تر نەترساوە ئەوەنـدەی لـە ڕۆژی قیامـەت ترساوە وەك خۆی ئەم ڕاستیە دەردەبڕێت:

* كان جلّ خوف عمر بن عبدالعزيز– رحمه الله– من يوم القيامة، فيدعو الله و يقول: (اللهم ان كنت تعلم اني أخاف شيئاً دون القيامة فلا تؤمن خوفي).[1]

واتە: زۆربەی زۆر ترسی عمری کوڕی عبدالعزیز– ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ– لـە هاتنی ڕۆژی قیامەت بوو، بۆیە لە پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو: ئەی پەروەردگارم ئەگـەر دەزانیت لە شتێکی تـر دەترسـم زیـاتر لـە ترسـم لـە ڕۆژی قیامـەت، دەی خوایـە ئـەو ترسەم لەسەر لانەبەیت و بێ ترسم نەکەیت.

یەکێك لە گەورە صالّحانی ئیسلام– عطاء السلمي–یە– ڕەحمەتی خـوای لـێ بـێ– زۆر ترساوە لە هاتنی ڕۆژی قیامەت و زۆر خەمی ئەوەی بووە کە بکەوێتـە ئـەو ڕۆژەو خوای گەورە حسابی چاکەکارانی بۆ نەکات، لەبەر ئـەوە پـڕ بـە دڵ ئـارەزووی ئـەوەی هەبوو کە خوا زیندووی نەکاتەوە و لەبەردەمی میزاندا نەیوەستێنێ:–

* عن بشر بن منصور قال: كنت أوقد بـين يـدي (العطـاء الـسلمي)– رحمـه الله– في غداة باردة، فقلت له: يا عطاء أيسرك الساعة لو أنك أمرت ان تلقى نفسك في هـذه النـار ولا تبعث الى الحساب؟ فقال لـي: إي و رب الكعبـة ثـم قـال: والله مـع ذلـك لـو أمـرت بـه لخشيت ان تخرج نفسي فرحاً قبل ان أصل اليها).[2]

واتە: بشری کوڕی مەنسور دەڵێ: لە خزمەت مامۆستا عـەتای سولەیمی دا بـووم و خەریك بوو ئاگرم بۆ خۆش دەکرد چونکە ڕۆژێکی تا بڵێی سارد بوو، ڕووم تێکرد و پێم

---

[1] عمر بن عبدالعزيز للدكتور الصلابي لا:٦٤.

[2] صفة الصفوة (٢/٢١٩).

وت: ئایا ئەگەر پێت بڵێن عەتا برۆ ناو ئەو ئاگرە ئەگەر بڕۆیتە ناویەوە لە قیامەتدا زیندووت ناکەینەوە ئایا وا دەکەیت؟

عەتا وتی: ئەرێ بە ڕەبی کەعبە وا دەکەم، پاشان وتی: نەك هەر ئەوە بەڵکو واللە لەوە دەترسم کە لە خۆشیاندا نەگەمە ناو ئاگرەکە گیانم دەربچێت.

پێشەوای صاڵحان- عمری کوڕی خطاب- خوای لێ ڕازی بێ- هەموو جارێ کە بیری ڕۆژی قیامەتی دەکردەوە دڵی دەکەوتە لەرزە و بە دەم خۆیەوە حەزی دەکرد دارێ بەردێ بوایە و لێپرسینەوەی لەسەر نەبوایە:

* قال عمر بن الخطاب- يوماً- ياليتني كنت شجيرة في ارض الحجاز لا لي و عليّ)).[1]

واتە: عمری کوڕی خطاب- خوا لێی ڕازی بێ- کە دووەم کەسایەتی مەزنی ئیسلامە لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بە شاهیدی هەموو هاوەڵان (پیاو صاڵحێکی مەزنی ئەم ئوممەتە بووە) کەچی هێشتا لەوە ترساوە کە بەهەشتی نەبێت و لە لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەتدا ڕزگاری نەبێت بۆیە دەیووت: خۆزگایە من مرۆڤ نەدەبووم بەڵکو دارێکی بچووك دەبووم و لە بیابانی حیجازدا دەڕوام و پاشان وشك دەبووم و هیچ لێپرسینەوەیەکم لەسەر نەبوایە و هیچ پاداشتێکشم پێ نەدرایە.

زۆر سەیرە ئێمە باوەڕمان وایە ئەم ژیانە کاتیەو ڕۆژبەڕۆژ لێمان تەواو دەبێت و ڕۆژبەڕۆژیش لە قیامەت نزیك دەبینەوە کەچی کاری چاکەی بۆ ناکەین و خەفەتی بۆ ناخۆین‌و خەیاڵمان نی یە لەلای بەڵکو خەیاڵمان لەلای خانووە! و دوکان! و سەیارە! ماڵی جوان! پۆست‌و بەرپرسیارێتی و شتی دنیایی ترە پەنا بە خوا!!.

ئەم سەرسامیەش صاڵحێکی پێشەوامان بە ناوی(شمیطی کوڕی عجلان) دەری دەبڕێت و دەفەرمووێت:

* قال شميط بن عجلان- رحمه الله-: ((العجب كل العجب لمصدق بدار الحق وهو يسعى لدار الغرور).[2]

---

[1] عمر بن عبدالعزيز للدكتور الصلابي لا: ٦٤.

[2] صفة الصفوة بەرگی(٢/٢٣١).

واتە: شمیطی کوڕی عەجلان– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دەفەرمووێت: ((جێگای سەرسوڕمانە، جێگای هەموو سەرسوڕمانێکە بۆ کەسێك باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت هەیە کەچی هەموو هەوڵ و تەقەلای بۆ ئەم دنیا دەست خەڕوکەرەیە!!.

ئایا دەزانن شت و مەکی ڕۆژی قیامەت لە دنیادا هەرزانە و دەستکەوتنی زۆر ئاسانە، و مرۆڤ دەتوانێت بە گونێ و فەردە و تەن و لۆری لێی بکڕێت و کۆی بکاتەوەو پێشی خۆی بخات چونکە لەوێ شت کڕین نامێنی بەڵکو شت فرۆشتن دێتە ئاراوە گەر چاك بێت چاك‌و ئەگەر خراپ بێت خراپ:

* عن محمد بن اسحاق الموصلي قال: قال أبو حازم – رحمه الله – (( ان بضاعة الآخرة كاسدة فاستكثروا في أوان كسادها، فانه لو جاء يوم نفاقها لم تصل منها لا بقليل ولا الى كثير)).[1]

واتە: یەکێکی تر لە زانا صاڵحەکانی ئیسلام–ئەبو حازم– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دەفەرمووێت: کاڵا و شت و مەکی قیامەت لە دنیا هەرزانە و بێ نرخە و مشتەری و کڕیاری کەمە.. دەستم دامێنتان ئێوە زۆری لێ بکڕن و زۆری لێ کۆبکەنەوە تا هەرزانە ئەگینا ڕۆژی قیامەت هات لەوێ پارەی چاك دەكات بەڵام هەرچیت لە دنیا نەکڕیبێ لەوێ نە زۆر و نە کەم هیچت دەست ناکەوێت.

برا و خوشکم.. خوای گەورە منیش و ئێوەش لەناو کاروانی صاڵحاندا قبوڵ بکات.. با نرخی دنیا بزانین و بەپێی ئەو نرخە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین‌و قیامەتیش بزانین تا بەپێی ئەو نرخە مامەڵەی لەگەڵ بکەین.. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە عومری دنیاکەمان کەم دەبێتەوە و ڕۆژبەڕۆژ بەرەو ڕووی قیامەتی پڕ لە نەهامەتی ئەڕۆین.

دیسان ئەوە ئەبو حازمە– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– وانەیەکی تر پێشکەشی کاروانچیانی ئەم ڕێگا موبارەکەی صاڵحان دەکات:

* عن حفص بن مسيرة قال: قال ابو حازم– رحمه الله– ( عجباً لقوم يعملون لدار يرحلون عنها كل يومٍ مرحلة، و يدعون ان يعملوا لدار يرحلون اليها كل يومٍ مرحلة).[2]

---

[1] صفة الصفوة بەرگی(٢/٢٣١).

[2] صفة الصفوة(٢/٢١٢).

واتە: ئەبو حازیم– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دەڵێت: سەرم سوڕدەمێنێ لە کەسانێك کار بۆ لانەیەك دەکەن کە هەر ڕۆژی قۆناغی لێی دووردەکەونەوە و بەجێی دێڵن و کار ناکەن بۆ لانەیەك کە هەموو ڕۆژێك قۆناغێ بەرەو ڕووی دەڕۆن و لێی نزیك دەبنەوە.

پێشەوا صالّحەکانمان سەرمەشقن بۆ ئێمەی موسڵمانی سەدەی بیست و یەك و ئەوان هەمیشە خەیاڵ و داڵغە و خەمیان لە لای قیامەتیان بووە و تەنانەت ئەگەر گوێشیان لە مۆسیقا بوایە هەر قیامەتیان بیر دەکەوتەوە ئەم وانەیەش سەعیدی کوڕی جوبەیری شەهیدی دەستی حجاج ی ستەمکار پێشکەشمانی دەکات:

* قال الحجاج بن يوسف الثقفي للعالم المجاهد الصالح– سعيد بن جبير– رحمه الله– عندما وقف أمامه:( هل رأيت شيئاً من اللهو؟ قال: لا أعلم، فدعا الحجاج بالعود و الناي فلما ضرب بالعود و الناي، بكى سعيد، قال الحجاج: ما يبكيك؟ قال: هو الحزن، ذكرتني أمراً عظيماً اما هذه النفخة فذكرتني يوم النفخ في الصور).[1]

واتە: کاتێ زانای مەزنی تابعین سەعیدی کوڕی جوبەیری موجاهید و پیاوچاکیان بە قۆڵ بەستراوی هێنایە بەردەستی ستەمکاری عێراق– حەجاجی کوڕی یوسف و ئەویش لێی پرسی: ئایا تا ئێستا گوێت لە عود و کەمان گرتووە؟ مامۆستایش ووتی: وا نازانم گوێم لێ بووبێت.

حجاج فەرمانی دا عود و کەمان بێنن و مۆسیقا لێ بدەن لەبەردەمیدا، و ئەوانیش هاتن و دەستیان کرد بە مۆسیقا ژەنین.

لەم کاتەدا مامۆستای شەهید دەستی کرد بە گریان، و حەجاج لێی پرسی: ئەوە بۆچی دەگریت ئەویش لە وەلامدا وتی: دڵم تەنگ بوو، شتێکی زۆر گەورەی وەبیرهێنامەوە و ئەم فو کردنە بەم ئامێرەدا ئەو ڕۆژەی خستەوە یادم کە (اسرافيل) فو دەکات بە نەفخی صور دا و هەموو گیان لەبەران دەمرن.

صالّحان– ڕەحمەتی خوایان لێ بێ– هەر بەوەوە ناوەستن کە ڕۆژی قیامەتیان لەبیردا بێت و لە یادی نەکەن و خۆیانی بۆ ئامادە بکەن، بەڵکو بەردەوام وەبیری خەڵکیشی دەهێننەوە و لەو ڕێگایەوە چەندان ڕەگی دنیا پەرستیان لە موسڵماناندا

---

١ من روائع القصص لا(٩٥).

دەرهێناوە و بەرەو صاڵح بوونیان بردوون و عمری کوڕی عبـدالعزیز یـەکێك بـووە لـەو کەسانە و بە حوکمی ئەوەی ئەمیری باوەڕدارانیش بووە زیاتر قسەکانی کاریگەر بووەو توانیویەتی والی و کاربەدەستەکانی پێ چاك بکات و لە گەنـدەڵی ئیـداری و دارایـی بـە دووریان بگرێت:

* کتب عمر بن عبدالعزيز– رحمه الله– الى اخ لـه: ( يـا أخـي إنـك قـد قطعـت عظـيم السفر و بقي أقله، فاذكر يا أخي اهل المصادر و الموارد، فقد أوحي الى نبيك –ﷺ– في القرآن إنك من اهل الورود، و لم يخبر انـك مـن اهـل الـصدور و الخـروج، و ايـاك ان تغـرك الدنيا، فان الدنيا دار من لادار له و مال من لامال له).[١]

واتە: عمری کوڕی عبدالعزیز– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– نامەی نووسـی بـۆ برایـەکی موسڵمانی پێی فەرموو: ئەی برای شیرینم تۆ زۆربەی ڕێگاکەت بڕیوە و کەمێکت ماوە، لە بیرت بێ براکەم تۆ کۆمەڵێ کاری ناڕەحـەت و ڕێگـای قورسـت لەبەردەمدایە، نیگـا کراوە بۆ پێغەمبەرەکەت (ﷺ) لە قورئاندا تۆ بەسەر پردی سیراتدا تێ دەپەڕی بەڵام پێی نەوتوویت لێی تێ دەپەڕیت یان دەکەویتە ناو ئاگرەکەوە، نەکەی دنیا لە خشتەت بەرێت، دنیا ماڵی کەسانێکە ماڵی تریان نی یە و سامانە بـۆ کەسـانێك لـە جێیـەکی تـر سامانیان نی یە.

هەروەها نامەی نوسـی بـۆ سـەرۆکی هـەرێمی بەسـرە و ڕۆژی نامـەواری قیامـەتی وەبیر هێنایەوە و دەیویست کاربەدەستەکانی قیامـەتیان لـەبیر نەچـێت چـونکە ئـەوە سەردەکێشێ بۆ گەندەڵی ئیداری و مالی و ڕەوشتی و، پێی وت:

* کتب عمر بن عبدالعزيز– رحمه الله– الى عدي بـن ارطـاة– والـي البـصرة–: ( أمـا بعد، فاني اذكرك ليلة تمخض بالـساعة و صـاحبها القيامـة، فيالهـا مـن ليلـة و يالهـا مـن صباح، كانا على الكافرين عسيرين).[٢]

واتە: عمری کوڕی عبدالعزیز نامەی نارد بۆ والی بەسرە(عـەدی کـوڕی ئەرتـەئـەت) و پێـی وت: ( پاشـان، مـن شـەوێکی وات دەخەمـەوە بـیر کـە پێـی تـێ بخـەیتو لـە

١ عمر بن عبدالعزيز للدكتور الصلابي لا: ٢٥٧.

٢ هەمان سەرچاوە لا: ٩٦.

بەیانیەکەیدا قیامەت بێت دەی دەبێ چ شەوێکی ترسناک و چ ڕۆژێکی ترسناک بێت؟! لەسەر بێ باوەڕان زۆر زۆر ناڕەحەتە).

صاڵحان لە خۆشترین کات و ئەوپەڕی کامەرانیدا.. هەر خەفەت بارن و دڵیان خۆش نیە و غەمی هاتنی ڕۆژی قیامەت جێگەی هەموو خۆشیەکی گرتۆتەوە لەناو دڵیانداو خوشکێکی سەرمەشق بەناوی عەفیرەوە ئەم دەرسەمان بە کردەوە دادەدات:

* عن يحيى بن راشد قال: ( كنا عند (عفيرة العابدة)- رحمها الله- فقدم ابن اخ لها طالت غيبته فبشرت به، فبكت! فقيل لها: ما هذا البكاء؟! اليوم يوم فرح و سرور، فبكت أكثر وقالت: والله ما أحد للسرور في قلبي مسكناً مع ذكر الآخرة، و لقد اذكرني قدومه يوم القدوم على الله، فمن بين مسرور و مثبور ثم غشي عليها).[١]

واتە: یەحیای کوڕی ڕاشید دەڵێ: لە خزمەت- (عفيرة العابدة) دابووین کە ئافرەتێکی زۆر خواناس بوو- لەو کاتەدا مژدەیان هێنا کە برازاکەت چەند ساڵە وون بوو، وا هاتەوە، و ئەویش دەستی کرد بە گریان!

پێیان ووت: ئەوە چی یە دەگریت! ئەم ڕۆ ڕۆژی خۆشی و سرورە- برازاکەت هاتۆتەوە، ئەو زیاتر دەستی کرد بە گریان ووتی: سوێند بە خوا ڕۆژی قیامەت شوێنێکی چۆڵی لەناو دڵمدا نەهێشتۆتەوە بۆ خۆشی و سرور دەربڕین، و هاتنەوەی برازاکەم.. هاتنەوە گەورەو ترسناکەکەی خۆمانی بیر خستمەوە کە دەچینەوە بەردەمی (الله) جل جلاله. و ئیتر لە نێوان خۆشی و سرور و خەفەت و دڵتەنگی داین لەو ڕۆژەدا و پاشان لە هۆش خۆی چوو.

جارێکی تر سەعیدی کوڕی جوبەیر زانا شەهیدەکەی گەورە تابعین و پیاوچاکی سەردەمی خۆی لەپاڵ حەجاجی ستەمکاردا ئەم وانەیە دەڵێتەوە و بە کردەوە خەفەتی ڕۆژی دوایی دەردەبڕێت:

---

[١] صفة الصفوة (٤/٢١).

* قال الحجاج بن يوسف الثقفي. لسعيد بن جبير– رحمه الله– مالك لم تضحك قط؟ قال: لم أر شيئاً يضحكني، و كيف يضحك مخلوق من طين، و الطين تأكله النار، و منقلبه الى الجزاء).[1]

واتە: حجاج کە فەرمانڕەوای ئومەویەکان بوو لە عێراق و فەرمانی دەستگیرکردنی گەورە زانای سەلەفی صالح– سەعیدی کوڕی جوبەیری دا و هێنایانە بەر دەستی و پرسياريان لێ کرد: چیتە وا دەڵێن قەد پێنەکەنیویت؟ سەعید فەرمووی: هۆکارێکی وا نەبوو بمکەنێنێ، ئێ کەسێ لە قوڕ دروست کرا بێت و قوڕەکەش ئاگر چاوەڕوانی بکاتو لێپرسینەوەشی لەبەردەمدا بێت چۆن پێ دەکەنێت..

کەسایەتی یەکی ناو کاروانە موبارەکەکەی صاڵحان (أبي عبدالله البراثي)یە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ترسی تەنها یەك دیمەنی ڕۆژی حەشر هەمیشە گریاوە، بزانین ئەو دیمەنە چی یە؟

* عن أبي مريم قال: قلت لابي عبدالله البراثي: كم تبكي؟ كم هذا البكاء؟ فأخرج– البراثي– اليّ يديه واذا على أصبعه شعرة ملفوفة فنشرها ثم قال: اذا كان المجاز على مثل هذه فايّ قدم يثبت على مثل هذا؟ ثم بكى).[2]

واتە: ئەبی مریەم دەڵێ: بە (ئەبو عبدالله البراثي)م ووت: چەندێ دەگریت؟ تا کەی دەگریت؟ ئەبو عبدالله یش: دەستەکانی دەرهێنا بۆم و یەك تاڵ مووی بە دەستەوە بوو لوول بوو بوو، درێژی کردەوە و پاشان فەرمووی: ئەگەر تێپەڕ بوونێك هەبێت بەسەر ئەمەدا لە ڕۆژی قیامەتدا کە ناوی (پردی سیراتە) دەی چ پێیەك دەتوانێ لەسەری بووەستێت؟ و ئەمەی وت و دەستی کرد بە گریان.

خوشك و برای صاڵحم، ئایا تۆ هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان بە تەنها بوویت و بیر لەوە بکەیتەوە کە خۆزگە لە ڕۆژی قیامەتدا لە میوانخانەکەی خوادا دەبیت؟ یان پەنا بە خوا لەناو سزاخانەکەیدا دەبیت؟ و بیخە خەیاڵی خۆت وا مەحشەرە و خەڵکی پۆل پۆل بەرەو بەهەشت دەبرێن کەچی تۆ سەیریان دەکەیت و کردەوەکانت بەشی ئەوە

---

[1] من روائع القصص لا: ٩٥.

[2] صفة الصفوة (٢/٢٣٤).

ناكات لەگەڵ ئەو پۆلانەدا بچیتە بەهەشتەوە؟!. دەی گوێ بگرە بۆ پیـاو صـالّحەكەی بەسرە– مالیكی كوڕی دینار– و پەندێكی لێ وەربگرە:

* عن جعفر قال: رأيت مالك بن دينار يتقنـع بعبـاءة ثـم يقـول: إلـه مالـك قـد علمـت ساكن الجنة من ساكن النار فايّ الدارين دار مالك؟ واي رجلين مالك؟[1]

واتە: جەعفەر دەڵێ: مالیك ی كوڕی دینارم بینی خۆی لە عەبایەك پێچابوویەوە و هاواری دەكرد: ئەی خوای مالیك، تۆ دانیشتووانی بەهەشت و دانیشتووانی دۆزەخ دەناسیت خۆزگە مالیك لە دانیشتووانی كامیانە؟ و مالیك پیاوی كام ماڵەیانە.

هەقی خۆیەتی خەمی ڕۆژی دوایی بخۆین.. چونكە وەك دنیا نییە.. ئەگەر سەیارەكەت وەرگەڕا.. سەیارەیەكی جوانتر دەكڕیتەوە.. ئەگەر خانووەكەت ڕووخا.. خانوویەكی جوانتر دەكەیتەوە.. ئەگەر خێزانەكەت وەفاتی كرد.. دەتوانی ژنێكی جوانتر بێنیتەوە.. ئەگەر لە قوتابخانە كەوتیت.. دەتوانی ساڵی داهاتوو بە نمرەیەكی بەرزەوە دەربچیت.. و ئەگەر لە كاسپیەكدا زەرەر بكەیت.. لە كاسپیەكی تردا جێگاكەی پڕ بكەیتەوە.. بەڵام.. ئەی ئەگەر – پەنا بە خوا – ڕۆژی قیامەتت لە دەست چوو! خۆ دنیایەكی تر نایەتەوە تا كردەوەی جوانی تێدا بكەیت و ئاخیرەت بە دەست بێنیتەوە.. ئای كە مەحاڵە شتی وا ڕووبدات.. و خواناسێكی خەڵكی بەحرەین ئەم وانەیەمان دادەدات:

* عن سمع بن عاصم قال: سمعت عابداً من اهل بحرين في جوف الليل يبكي ونحن على مقربة منه في بعض السواحل يقول: يا أختاه ابكوا على فوت الآخرة حيث لا رجعة ولا حيلة.[2]

واتە: مەسمەعی كوڕی عاسیم دەڵێ: جارێكیان لە نیوە شەودا بوو لە نزیكی یەكێ لە خواناسەكانی بەحرەینەوە بووین لە كەناری دەریا گوێم لێ بوو دەیووت: ئەی برا موسڵمانەكانم، بگرین لە ترس لە دەستچوونی ڕۆژی قیامەت چونكە نە گەڕانەوە هەیەو نە فرت و فێڵیش دەخوات.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٩٣).

٢ هەمان سەرچاوە.

برا و خوشکی خوێنەرم ئەزانی باوکێك بیری ڕۆژی قیامەتی کردەوە و دەستی کردە گریان و هەموو ماڵەکەیشی کردە گریان و کەسیش نەیدەزانی بۆچی دەگرین بەڵام باوکە کۆس کەوتەکە چاك دەیزانی بۆچی دەگری ئەو پیاوەش عمری کوڕی عبدالعزیز بوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

* بكى عمر بن عبدالعزيز – ر حمه الله – فبكت فاطمة، فبكى اهل الدار، لا يدري هؤلاء ما ابكى هؤلاء، فلما تجلّى عنهم الصبر، قالت فاطمة: بأبي انت يا امير المؤمنين، ممَّ بكيت؟ قال: ذكرت – يا فاطمة – مصرف القوم من بين يدي الله، فريق في الجنة وفريق في السعير، ثم صرخ وغشي عليه.[1]

واتە: جارێکیان عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەستی کرد بە گریان و فاطمەی خێزانیشی کە عمری بینی دەگری ئەویش دەستی کرد بە گریان و هەموو ئەندامانی تری ماڵەکەش بە دوای ئەواندا دەستی کرد بە گریان، و کەسیش نەیئەزانی هۆی گریانەکەیان چییە؟ و پاش ئەوەی هێور بوونەوە و ئارامیان بۆ هات.

فاطمە لە عمری پرسی:باوکم بە ساقەت بێت پێم بڵێ بۆچی گریایت؟ فەرمووی: ئەی فاطمە ئەو خەڵکەم یاد کەوتەوە کە لەبەر دەستی خوادا وەستاون و تاقمێکیان بەرەو بەهەشت دەبرێن و تاقمێکیش بەرەو ئاگری دۆزەخ، ئەمەی وت و هاوارێکی کردو لە هۆش خۆی چوو.

هەروەها عمری کوڕی عبدالعزیز لە ناو هاوڕێکانیدا دانیشتبوو ئەوان قسەی خۆشیان دەکرد و پێدەکەنین بەڵام ئەو بێدەنگ بوو هەر بیری دەکردەوە خۆزگە بیری لە چی کردبێتەوە:

* عن سفيان قال: كان عمر بن عبدالعزيز – رحمه الله – يوماً ساكتاً وأصحابه يتحدثون، فقالوا له: ما لك لا تتكلم يا امير المؤمنين؟ قال: كنت مفكراً في أهل الجنة كيف يتزاورون، وفي أهل النار كيف يصطرخون فيها؟ ثم بكى.[2]

---

١ الرقة والبكاء ص: ٧٦، لە کتێبی عمر بن عبدالعزيز / الصلابي – لا (٩٩) وەرگیراوە.

٢ عمر بن عبدالعزيز للدكتور الصلابي لا (١٠٠)

واتە: سوفیان دەڵێ: جارێکیان عمری کوڕی عبدالعزیز لە ناو هاوڕێکانیدا دانیشتبوو ئەوان لە ناو خۆیاندا قسەیان دەکرد بەڵام ئەو هەر بێدەنگ بوو، تا وایان لێهات پرسیاری لێ بکەن و بڵێن: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆچی بێدەنگی و قسە ناکەیت؟ عمریش فەرمووی: بیرم لە دانیشتوانی بەهەشت دەکردەوە کاتێ سەردانی یەکتر دەکەن دەبێ چۆن بچن بۆ ماڵی یەکتری؟ و بیریشم لە خەڵکی ناو جەهەنەم دەکردەوە کە چۆن هاوار دەکەن و دەقیڕێنن؟! پاشان دەستی کرد بە گریان.

ئەمەش پێشەوایەکی تری کاروانی صاڵحانە و ناوی (سوفیانی سەوری)یە و وەك برا صاڵحەکانی تری تەنها بە گریان و بێدەنگی و خەفەتەوە نەوەستاوە لە باسکردنی ناهەمواریەکانی ڕۆژی قیامەتدا بەڵکو لەم بوارەدا ژمارەی پێوەری شکاندووە و لەو باوەڕەدا نیم کەسی پێ گەیشتبێت:

* قال یوسف بن أسباط: كان سفیان الثوري – رحمه الله – اذا أخذ ذكر الآخرة یبول الدم.[1]

واتە: یوسف ی کوڕی ئەسبات دەڵێ: هەر کاتێ مامۆستا سوفیانی سەوری – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – باسی ڕۆژی قیامەتی بکردایە میزی دەبوو بە خوێن.

دوکتۆرە باوەڕپێکراوەکانیش دانیان بەم ڕاستیەدا ناوە و هۆکارەکەشیان گەڕاندۆتەوە بۆ ترسێکی بێ سنوور کە کاری لە جگەری کردووە:

* زید بن ابي زرقاء یقول: حمل ماء سفیان الى طبیب في علته، فلما نظر قال: هذا ماء رجل قد احرق الخوف جوفه.[2]

واتە: زەیدی کوڕی ئەبی زەرقاء دەڵێ: کەمێ لە میزی سوفیانی سەوریان برد بۆ لای دکتۆر لە کاتی نەخۆشیەکەیدا و کاتێ سەیری کرد وتی: ئەم ئاوە هی کەسێکە زۆر ترساوە و ترس ناو سکی سووتاندووە، بێگومان ترسی ڕۆژی قیامەتی بووە.

هەندێ لە صاڵحان – ڕەحمەتی خوایان لێ بێت – ئەوەندە لە ڕۆژی قیامەت ترساون و خەمیان خواردووە هەرگیز پێکەنینیان نەهاتووە و سوێندیان خواردووە تا نەزانێ لە ڕۆژی قیامەتدا بەهەشتی یە یان دۆزەخی!:

---

١ الجامع لشعب الایمان (٢/٥٤٥).

٢ هەمان سەرچاوە (٢/٥٤٦).

* عن الحارث القنوي قال: آلى ربعي بن حراش الغطفاني ان لايضحك حتى يعلم أفي الجنة هو أم في النار.[١]

واتە: حارسی قەنەوی دەڵێ: پیاوصاڵح و خواناس – ڕەبعی کوڕی حەراشی غەتەفانی سوێندی خوارد کە تا لە ژیاندایە پێ نەکەنێت تا نەزانێت لە بەهەشتدایە یان لە دۆزەخ.

برای صاڵح و خوشکی صاڵیحەم، ئەگەر منو تۆ لە جێیەکی گەرمدا بین وەك گۆڕەپانی مەشقی سەربازی لەوانەیە ماندوو ببین و ئارەق بکەین، یان ئەگەر کرێکاری بکەین لەوانەیە کەمێ ئارەق بکەین.. یان لە هاویندا کارەبا ببڕێتو بخەوین هەندێ ئارەق دەکەین.. و وەزعمان ناخۆش دەبێت و ناڕەحەت دەبین!

ئەی قوڕی دنیا بەسەرمان ئەمانە ناخۆشن لە لامان ئەی چی دەکەیت لە ئارەق کردنی مرۆڤەکان لە کاتی وەستانی ڕۆژی مەحشەردا بۆ چاوەڕوانی لێپرسینەوە:

* عن ابن عمر – رضي الله عنهما – قال: ان رسول الله (ﷺ) قال: ((يقوم الناس لرب العالمين حتى يغيب أحدهم في رشحه الى انصاف أذنيه)).[٢]

واتە: عبدالله ی کوڕی عمری کوڕی خطاب (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی بە پێوە وەستاون لەبەر دەمی خوای – عز وجل – دا و ئەوەندە گەرمایانە و ئارەقیان کردووە هەیانە تا نیوەی گوێچکەی لە ناو ئارەقی خۆیدا نقوم بووە.

برای بەڕێزم و خوشکانی پاك داوێن.. ئێمەی مرۆڤ لە دنیا هەڵەیەك دەکەین سەیری ئەملا و ئەولا دەکەین بزانین کەس چاوی لێ نەبوو! ئیتر کەمێ دڵخۆش دەبین کە حەیامان نەچووە و ئەگەر یەکێك بزانێت پێمان حەز ناکەین ببێت بە دوو کەس، ئەی قوڕ بەسەرمان ئەگەر فریشتەی خوای گەورە کامێرەمان بۆ نەصب بکەن و بە دەنگ و ڕەنگەوە نەقڵی بکەن بۆ ناو نامەی کردەوەکان و بە بەر چاوی سەدان ملیار کەسەوە حەیاو ئابڕوومانی پێ دەبەن:

---

١ هەمان سەرچاوە.

٢ متفق عليه في رياض الصالحين لا: ١١٦.

* عن ابي هريرة – رضي الله عنه – قال: قرأ رسول الله (ﷺ) ﴿يومئذ تحدث اخبارها﴾، ثم قال: اتدرون ما اخبارها؟ قالوا: الله ورسوله أعلم، قال: فان أخبارها ان تشهد على كل عبد أو امة بما عمل على ظهرها، تقول: عملت كذا وكذا في يوم كذا وكذا، فهذه أخبارها.[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەو هاوەڵە مەزنە بوو کە زۆرێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەری لەبەر کردبوو لە پاش مردنی سەردارمان (ﷺ) بۆ بەرەکانی دوای خۆی گێڕایەوە – و دەفەرمووێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایەتی: ﴿یومئذ تحدث اخبارها﴾ی خوێند واتە لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو هەواڵ و کردار و ڕووداوەکانی سەر زەوی تاوتوێ دەکرێت و ئاشکرا دەکرێت – و لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەزانن وشەی (اخبارها) یانی چی؟

هاوەڵان وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: (اخبارها) واتە شایەتی دەدرێت لەسەر هەموو ژنێك یان پیاوێك کردەوەیەکی لەسەر زەوی کردبێت و زەویەکە دەڵێ: فڵان کار و فڵان کردەوەت کرد لە ڕۆژی ئەوەندە و ئەوەندەدا، و ئا ئەمە مانای (أخبارها).

وەستانێکی زۆر گەورە و قورس و گرانمان لەبەردایە، حاکمەکەش کێ بێت؟ بەدیهێنەری هەموو بوونەوەر، (رب العالمين) شکاتکەرو حاکمەکەیشەو شایەتەکانیش پارچە گۆشتەکانی لەشی خۆمان، دەست و قاچ و چاو و زمان و گوێ و پێستو پێمانن..

صالّحان (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر زۆر ترساون لەو وەستانە.. خۆ هەقی خۆیشیەتی لێی بترسین.. چونکە دادگاییەکی گەورەی جیهانییە و (لاهای) گچکەترین دادگایە لە چاو ئەو هۆڵە مەزنەی لە یەکەمین مرۆڤەوە کە باوکە ئادەممانە تا دوایین کۆرپەلەی لە دایك بوو بە هەموو ڕەگەز و زمان و نەژادەوە بە ڕووت و قوتی و بە پێوە دەوەستن و چاوەڕوانی دواڕۆژی نادیاریان دەکەن وای بە حاڵمان ئەگەر خوا ڕەحممان پێ نەکات لەو ڕۆژەدا.

---

[1] رواه الترمذي وقال حديث حسن – رياض الصالحين لا: ١١٨.

دەی سەیری ئەم گەنجە صاڵحە بکە و پەندێکی لێ وەربگرە و تۆش ناڵێم وەك ئەوت لێ بێت و بە ناوبردنی دادگاییەکە دڵت بوەستێت و بمری بەڵام خۆ دەتوانی لە ترسی ئەو ڕۆژە گریانت بێت و گوناه کردن واز لێ بێنیت.

* عن ابن سماك قال: دخلنا البصرة فقال لي صاحبي: هاهنا عجوز هل لك فيه؟ قال: فدخلنا عليه، فقالت العجوز: لاتذكروا لابني شيئاً، من ذكر الجنة والنار فتقتلوه عليَّ فانه ليس لي غيره.

قال: فدخلنا على شاب عليه لباس الشعر، طويل الصمت، منكس الرأس، فرفع راسه الينا ثم قال: اما ان للناس موقفاً لابد ان يقفوه؟ قال: قلت بين يدي من رحمك الله؟ قال: فشهق شهقة فمات.[١]

واتە: (ابن سماك) دەڵێ: چووینە ناو شاری بەسرەوە و هاوڕێکەم پێی وتم: ئا لێرەوە بڕۆین کوڕی پیرەژنێکی لێیە حەز دەکەیت سەردانی بکەین؟ – لەو کاتەدا خەڵکی سەردانی صاڵحانیان دەکرد تا گوڕوتین بکەوێتە باوەڕەکەیان و ئەوانیش صاڵحاوی بن – دەڵێ: چووین بۆ لای و دایکە پیرەکەی پێی وتین: تکاتان لێ دەکەم باسی بەهەشت و جەهەننەمی لە لادا مەکەن و مەیکوژن چونکە من – لە دوای خوا – تەنها ئەو کوڕە شك دەبەم.

دەڵێ: چووینە ژوورەوە بۆ لای ئەو گەنجە و دەبینین بەرگێکی توکنی لەبەردایە، بە بێدەنگیەکی بەردەوامەوە و سەری داخستبوو، سەری هەڵبڕی بۆ لامان و وتی: ئایا خەڵکەکان وەستانێك قەرزار نین و دەبێت ئەو وەستانە ئەنجام بدەن؟ دەڵێ: وتم: لەبەردەمی کێدا ڕەحمەتی خوات لێ بێ؟ دەڵێ: هەر کە ئەو وەڵامەی لێ بیستم یەك هاواری گەورەی کرد و گیانی دەرچوو.

ئەگەر چوویت بۆ دەشت و دەر و لەوێ کوللەیەکی زۆرت بینی کە سەدان و هەزاران دەبوون و بە کۆمەڵ دەفڕین ئایا چی شتێکی ڕۆژی قیامەتت بیردەخاتەوە؟ و کام ئایەتی قورئانت وەبیردەهێنێتەوە؟ دە گوێ بگرە بۆ پێشەوایەکی صاڵحان بزانە چی دەڵێ و چی بیردەکەوێتەوە:

---

١ الجامع لشعب الایمان (بەرگی دووەم/٥٣٢).

* عن صلت بن مسعود قال: خرج الحسن بن صالح بن حي – رحمه الله – يوماً من بيتنا فنظر الى جراد يطير فقال: ﴿يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾.[1] ثم خرَّ مغشياً عليه.[2]

واتە: سەلت ی کوڕی مەسعود دەڵێ: ڕۆژێکیان حەسەنی کوڕی صالحی کوڕی حەی لە ماڵی ئێمە دەرچوو لە ڕێگا چاوی کەوت بە کۆمەڵێك کوللە کە پێکەوە دەفڕین یەکسەر ئەم ئایەتەی بۆ هات کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ((لە قیامەتدا خەڵکی لە گۆڕەکانیانەوە دێنە دەرەوە وەك کوللەی پرش و بڵاوەیان لێ هاتووە)) و پاشان لە هۆش خۆی چوو.

ئەمەش هاوەڵە شیرینەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) و ئەبو بەکری (صدیق)ە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەوەندە لە ڕۆژی قیامەت دەترسێ حەز دەکات باڵندەیەك بووایە لەسەر درەختەکان:

* عن يعقوب بن يزيد و عمر بن عبدالله قالا: نظر ابو بكر الصديق ... الى طير حين وقع على شجرة، فقال: ما انعمك يا طير! تأكل وتشرب! وليس عليك حساب يا ليتني كنت مثلك.[3]

واتە: ئەبو بەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) جارێکیان باڵندەیەکی بینی کاتێ لەسەر درەختەکە نیشتەوە فەرمووی: چەند خۆشحاڵیت ئەی باڵندەکە! ئەخۆیت و ئەخۆیتەوە! و لێپرسینەوەت لەسەر نییە و خۆزگە منیش وەك تۆ دەبووم.

---

١ سورة القمر، (الاية: ٧).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/٥٢٧).

٣ الجامع لشعب الايمان (٢/٤٥٨).

# سێیەم

## لە ئاگری دۆزەخ زۆر ترساون

برای موسڵمانم.. ئەگەر خوای – عز وجل – بە تەنها دۆزەخی دروست بکردایە و بەهەشتی بۆ ئامادە نەکردیتایە و بەڵکو هەر کەسێ کردەوەی خراپی بکردایە بخرایە ناو ئاگر و هەر کەسێ چاکەکار بووایە زیندوو نەکرایەتەوە.. هەر ئەوە بەس بوو کە پەندی لێ وەربگرین و ڕێگای چاکە و خێرمان بگرتایە..

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾[1].

وەڵامی ئەگەر لە هەموو قورئاندا تەنها ئەم ئایەتە باسی ئاگری دۆزەخی بکردایە بەس بوو دەست لە خراپە هەڵگرین و ڕێگای خوا بگرینە بەر. کە خوای ئەرز و ئاسمانەکان داوامان لێ دەکات کە خۆمان و ماڵ و منداڵمان لەو ئاگرە بپارێزین چونکە کۆمەڵێ فریشتەی بە سەرەوەیە زۆر توند و تیژن و بەهێزیشن.. یەك سەرپێچی خوا ناکەن و هەرچیان پێ بووترێت جێبەجێی دەکەن و نەگریان و باوکەڕۆی جەهەنەمییەکان دڵیان نەرم دەکات و نە زۆری خەڵکەکەی ناو ئاگر ماندوویان دەکات و نە لەبەر ئەم و ئەو فەرمانی خوا دەشکێنن و نە واسیتە و بەرتیلیش وەردەگرن.

ئەبێ چ هۆڵێك بێت؟.. وا ئەوەندە گەورە و فراوانە جێگەی سەدان ملیار کەس دەبێتەوە و لە دوای چوونە ژوورەوەی هەموو هەواداران و جەماوەرەکەی خۆی.. هێشتا هەر هەڵپەی دێ و برسیەتی بۆ جەستەی تر – پەنا بە تاقە خوا –:

* قال سبحانه وتعالى: ﴿يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ٣٠﴾[2].

واتە: خوای گەورە بۆ ئەوەی زیاتر بمانترسێنێت و زیاتر هەوڵ بدەین نەبینە دانیشتووانی ئەو ماڵە عەبووسە ناخۆشە – بەوەی باسێکی ڕۆژی قیامەتمان بۆ

---

١ سورة التحريم، (الآية: ٦).

٢ سورة ق، (الآية: ٣٠).

دەکات، ئەو کاتەی کە جەهەننەمییەکان هەموو بە سزای ڕەوای خۆیان گەیشتن و مەحشەر کەسێکی تیا نەما کە شایستەی ناو ئاگرەکە بێت لەو کاتەدا خوای زەوی و ئاسمانەکان لە جەهەننەم دەپرسێت: ئایا پڕ بوویت؟ ئیتر کەسی ترت ناوێ؟ جەهەننەمیش لە وەڵامدا دەڵێت: هی تر ماوە؟ ئەگەر ماوە بۆم بهێنن من هەرگیز پڕ بوونم بۆ نییە..

لە سورەتی فورقاندا خوای – عز وجل – کۆمەڵێ مەرجی داناوە بۆ قبووڵ بوون لە کاروانی موبارەکی (عبادالرحمن)دا کە ئەوانیش بەشێکن لە کاروانە مەزنەکەی صالّحان، و یەکێ لەو مەرجانە ئەوەیە کە بەردەوام لەو سزایە ناڕەحەتە دەترسن کە خوای گەورە لە دۆزەخدا ئامادەی کردووە بۆ سەرپێچی کار و گوناهباران و هەردەم داوا لە خوای خۆیان دەکەن کە بیانپارێزێت لەو سزایە چونکە:

* قال الله تعالى: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾﴾.[١]

واتە: یەکێ لە سیفاتەکانی تری – عبادالرحمن – خوا بمانکات بە یەکێ لەوان – ئەوە هەمیشە لە ئاگری دۆزەخ زیرەیان کردووە و بەردەوام لێی دەترسن و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لە سزای سەختی جەهەننەم بمانپارێزە چونکە بە ڕاستی سزایەکی زۆر سەختە و خوێن و ئێسقانی ئێمە بەرگەی کڵپەیەکی ناگرێت.

برای موسڵمانم، خوشکی باوەڕدارم.. وەیل بۆ ئێمە ئەگەر ئەو سزا سەختەمان لەبیر بچێت کە ئەوەندە ناڕەحەتە خەڵکی ئاواتی ناڕەحەتترین سزای دنیا دەخوازن کە مردنە و لە (مالك) دەپارێنەوە و دەڵێن: ڕجات لێ دەکەین.. تکات لێ دەکەین.. داوا لە پەروەردگارت بکە کە ڕەحممان پێ بکات بەوەی بە یەکجاری بمانکوژێت و لە سزای بەردەوام و نوێ بوونەوەوە ڕزگارمان بکات:

* قال تعالى – على لسان جهنّميّن –: ﴿يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ﴾.[٢]

---

١ سورة الفرقان، (الآية: ٦٥).

٢ سورة الزخرف، (الآية: ٧٧).

واتە: جەهەننەمییەکان ئەوەندە وەڕەس و بێ تاقەت دەبن لە ناو سزا سەختەکاندا تا وایان لێ دێ لە مالیك – کە سەرپەرشتیاری دۆزەخە – دەپاڕێنەوە کە داوا لە خوا بکات بیانکوژێت!!

ئەی خوایە –بمانپارێزە لەو ئاگرە–ی کە بەردەوام خواردن و خەو تیایدا سزا و ئەشکەنجەیە و ساتێك نییە کە (of)یان هەبێت یان بۆنەیەکی وا کە ڕۆژێ یان ساتێ سزای تێدا بوەستێت! نەك هەر ئەوەندە بەڵکو زانستی ئەمڕۆمان ئەو موعجیزە قورئانییەی ئاشکرا کردووە کە بە تەنها پێست هەست بە سزا و ئێش دەکات و ئەگەر پێست سوتا و نەما ئیتر سزاکان ئاسایی دەبن لە لای مرۆڤ و لەگەڵیاندا ڕادێت، بزانین خوای گەورە بۆ ئەم مەسەلەیە چی دەکات:

* قال الله تعالى: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾.[1]

واتە: هەر کاتێ پێستەی جەهەننەمیەکان دەسوتێت و ڕەق دەبێت خێرا ئێمە پێستی تازەیان دەکەینەوە بە بەردا بۆ ئەوەی بەردەوام پێستیان هەبێت و سزا بچەژن –پەنا بە خوا–.

برای مرۆڤم.. وەڵاهی تەحەمولی ئەو ئاگرە ناکەین.. دەی ئیتر بۆچی لێی نەترسین‌و بۆچی خۆمان لە گوناە نەپارێزین و واز لە سەرکەشی و سەرپێچی نەهێنین، سەیرکە بزانە لە جوزئی تبارکدا خوای پەروەردگار چۆن وەسفێکی کاریگەری جەهەننەم دەکات کە جێگای خۆیەتی کاتێ دەدەیت بە لای فڕنی مریشك برژاندندا کە خۆشبەختانە لە دەرەوەی دوکانەکانیانەوە دایان ناوە تا سرنجمان ڕابکێشن و بیکڕین..

بەڵام بۆ من و تۆ بەسوودە و ئەگەر چەند چرکەیەك لە پاڵیدا بوەستین چۆن مریشکەکان دەسوڕێنەوەو دەبرژێن‌و چەوریەکانیان تك تك دەکەوێتە خوارەوە، پێستەکەیان سووردەبێتەوە بەڵام مریشك خۆشبەختە بە مردوویی دەیبرژێنین بەڵام

---

[1] سورة النساء، (الآية: ٥٦).

قـوڕ بەسـەر مرۆڤـەکان —بەدبەختـەکان— کـە بـە زینـدوویی دەبرژێنـرێن و گیانیـان دەرناچێت:

* قال الله — سبحانه وتعالى — في سورة المعارج: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُواْ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾﴾.[١]

واتە: خوای گەورە وەسفی جەهەنەم دەکاتو دەفەرمووێت: نەخێر ئەو ئاگرە زۆر سووتێنەرەو گۆشتو پێستی ڕوومەت دەبرژێنێو دەیخاتە خوارەوە و بانگی ئەو کەسانە دەکات کە لە دنیا سەرپێچی خوایان کردووە و پشتیان لە ئیسلام هەڵکردووە.

پێغەمبەرە نازدارەکەشمان (ﷺ) لە یەك فەرموودەدا کە لە دێڕێك زیاتر نییە بەڵام جەرگ و دڵ و هەناو دەردەهێنێ و کەیانی مرۆڤە دەروون زیندووەکان دەهەژێنێ و صالّحانیش دەخاتە گریان.

* قال النبي (ﷺ): ((ولو ان قطرة من الزقوم قطرت في بحار الدنيا افسدت على اهل الدنيا معايشهم)).[٢]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی چێشتخانەکەی نـاو ئـاگری جەهەنـەم کە نـاوی — زەقوم — ە و لـە کـێم و جەراحـەتو خوێنـاو چـەوری جەهەنەمییـەکان خواردنیـان بـۆ دروست دەکەن و دەرخواردیان دەدەن، و لـەو بـارەوە دەفـەرمووێت: یـەك تکـە لـە — زەقوم — تێکەڵی دەریاکانی دنیا ببێت هەموو ئاوەکـانی سـەر ڕووی زەوی بـە کـەڵکی خواردنەوە و بەکارهێنان نامێنێ و ژیانی خەڵکەکە تێك دەچێت، ئەی خوایە گیان ئـەو چێـشتخانەیە نەکەیتـە نـسیبمانو مـاڵ کـاولی بـۆ ئـەو کەسـەی سـێ ژەمـە زەقـومی دەرخوارد بدرێت!!.

پیاوانی مەزنی وەك (الحسن البصري) لە ئاگری دۆزەخ ترساوە و جار بە جار لە ناو خەڵکیـدا گریـانی هـاتووەو خـۆی پـێ نـەگیراوەو بـەو هـەموو خواناسـیو کـردەوە

---

١ سورة المعارج، (الآية: ١٥—١٧).

٢ اخرجه الترمذي وقال حسن صحيح.

جوانانەیەوە هێشتا هەر ترساوە خوای گەورە گرنگ نەبێت بە لایەوە فڕێی بداتە ناو ئاگرەوە و ئەمەش وانەیەکی مەزنە بۆ خوێندکارانی قوتابخانەی صالّحان و وەرگرتن لە کاروانە موبارەکەکەدا:

* عن حفص بن عمر قال: بكى الحسن، فقيل له: ما يبكيك؟ فقال: اخاف أن يطرحني غداً في النار ولا يبالي.[1]

واتە: حەفسی کوڕی عومەر دەڵێ: ئیمام حەسەنی بەسری (ڕحمەتی خوای لێ بێت) گریا، لێیان پرسی: بۆچی دەگریت؟ فەرمووی: ئەترسم سبەینێ لە قیامەتدا خوا فڕێم بداتە ناو ئاگری جەهەنەم و گرنگ نەبم بە لایەوە.

ئەمەش پیاوصالّحێکی ترە و مامۆستایەکی ترە بۆ ئێمەی تازە کاروانچیان کە ناوی (دينار العيار)ە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و شەو تا بەیانی شەونوێژی کردووە و کەچی بە دایکی دەڵێ ئەترسم لە قیامەتدا:

* كان دينار العيار (رحمه الله) يصلي الليل الى الصباح. وقالت له امه: يا بنيّ خذ لنفسك راحة، قال: لست لراحة أطلب، كانّي يا اماه، غداً بالخلائق يساقون الى الجنة، وانا اساق الى النار فاخذ في البكاء والعبادة وقراءة القرآن.[2]

واتە: (دينار العيار) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) شەو تا بەیانی شەونوێژی دەکرد.. تا ئەوەبوو دایکی دڵی بۆی سوتا و بە هێمنی پێی وت: کوڕی خۆم تۆزێ وچان بە خۆت بدە، ئەویش سەری هەڵبڕی بە لای دایکی و پێی دەووت: وچانم ناوێ بۆ چیمە، دایەگیان ئەڵێی لەبەرچاومە قیامەت هەستاوە و لەبەر چاومە هەموو خەڵکی پۆل پۆل بەرەو بەهەشت دەبرێن و تەنها من نەبێت بەرەو ناو ئاگری جەهەنەم دەبرێم، و ئەمەی ووت و پاشان دەستی دەکردەوە بە گریان و خواناسی و قورئان خوێندن.

هەر ئەم گەورە صالّحەی ئیسلامە – کە ناوی دينار العيار – ە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەموو شەوێ لەگەڵ دەروونی خۆیدا چنگی دەداو دەستی دەکرد بە پرسیارلێکردنی و شپرزەکردنی و پێی دەووت: ئەی نەفسەکەم:

---

١ صفة الصفوة (٢/١٢٧).

٢ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

* اذا جن الليل على دينار العيار – رحمه الله – أخذ في البكاء والعويل ويقول لنفسه: ويحك يا دينار، ألك قوة على النار؟ كيف تعرضت لغضب الجبار.[1]

واتە: هەر کە شەو دادەهات (دينار العيار) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەستی دەکرد بە گریان و هاوار و بە خۆی دەوت: ئەی دینار: ئایا تەحەمولی ئاگری جەهەنەم دەکەیت؟ ئایا خۆت پێ ڕادەگیرێت، دەی بە چ غیرەتێك وێراوتە خوای بە دەسەڵات و جەبار تووڕە بکەیت؟.

ئەی خوشك و برای موسڵمانم.. وەرن با پەندێك وەربگرین لە گەنجێکی خواناسی کەم تەمەنەوە کە ئەوەندە لە ئاگری دۆزەخ ترساوە، بەیعەت بە پێغەمبەری خوا نادات و ئەوەش بە هەل دەزانێت تا پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ بکات کە خوا لە ئاگری دۆزەخ بیپارێزێت:

* عن ميمون بن مهران عن ابن عباس – رضي الله عنه – قال: قدم على رسول الله وفد من العرب فيهم شاب، فقال الشاب للكهول: اذهبوا فبايعوا رسول الله وانا أحفظ لكم رحالكم، فذهب الكهول فبايعوه، ثم جاء الشاب فأخذ بحقوى رسول الله (ﷺ) فقال: يا رسول الله استجيرك من النار، فقال القوم: دعه يا غلام! فقال: والذي بعثه بالحق لا أتركه حتى يجيرني من النار، فاتى جبريل فقال: يا محمد اجره، فان الله قد اجاره.[2]

واتە: عبدالله ی کوڕی عەباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموویێت: وەفدێکی عەرەب هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا بەیعەتی پێ بدەن، یەك گەنجیان تیابوو وتی بە پیرەکان: ئێوە بڕۆن بەیعەتی پێ بدەن من ئاگام لە شتەکانتان دەبێت، و ئەوانیش ڕۆیشتن و بەیعەتیان پێدا و پاشان گەنجەکەش هات شانی پێغەمبەری خوای گرت و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا لە ئاگری دۆزەخ بمپارێزە و هۆزەکەیشی وتیان: کوڕەکە واز لە پێغەمبەر بێنە! ئەویش وتی: سوێند بەو کەسەی ناردوویەتی بە پێغەمبەر بەری نادەم تا لە ئاگری دۆزەخ نەمپارێزێت.. لەو کاتەدا –جبريل– سەلامی

---

١ المستطرف (١/١٤٨) لە (قبسات من تجارب الشعوب) لا: ١٩٢ وەرگیراوە.

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/٤١٦).

خوای لێ بیِّ– هات فەرمووی: ئەی محمد پەنای بگرە لە ئاگر، چونکە خوای گەورە پەنای داوە لە ئاگر.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆرجار هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی لە ترسناکی و ناهەمواری ئاگری دۆزەخ ئاگادار دەکردەوەو دەیترساندن لێیو داوای لێ دەکردن کە بە خێرکردن و کردەوەی جوان خۆتانی لێ بپارێزن و لەم ڕووداوەی عدی کوڕی حاتەم دەیگێڕێتەوە ورد بەرەوە و خێری زۆر بکە:

* عن عدي بن حاتم ان رسول الله (ﷺ) قال: اتقوا النار ثم التفت ثم قال: اتقوا النار، قال: ثم أعرض واشاح ثلاثاً حتى قلت انه ينظر اليها ثم قال: ((اتقوا النار ولو بشق تمرة، فان لم تجدوا فبكلمة طيبة)).[1]

واتە: عدی کوڕی حاتەمی تەی (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی تێ کردین و فەرمووی: ((خۆتان لە ئاگری جەهەنەم بپارێزن)) ڕووی وەرچەرخاندو ئەمجارەش فەرمووی: ((خۆتان لە ئاگر بپارێزن))، پاشان پشتی هەڵکردو ڕەنگی گۆڕا سێ کەڕەت، تا وام لێهات کە بڵێم بە چاوی سەیری ئاگرەکە دەکات پاشان فەرمووی: ((خۆتان لە ئاگر بپارێزن با بە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێت ئەگەر ئەوەشتان لە دەستدا نەبوو با وتەیەکی جوان و قسەیەکی خۆش کە دڵی موسڵمانێکی پێ خۆش بکەن)).

خوشك و برایانم.. بۆ ئەوەی دڵمان نەرم بێت و ترسی ئاگری دۆزەخی تێ بکەوێت و نەوێرین گوناه و خراپە بکەین، باش وایە لەبەر ئەوەی بە نیازیت کاروانی صاڵحان بگریتەبەر جاربەجار سەردانی ئاسنگەرە کورەدارەکان بکە یان کاتێ دەچیت بۆ نانەوا نان بکڕیت داوای یارمەتی بکە لە نانەواچیەکە و بڕۆ ژوورەوە بۆ ماوەی دوو تا سێ چرکە سەیری ناو تەنوورەکە بکە و بزانە چۆن ئاسنو بەردی سوورکردوەتەوە ئەوجا بە خۆت بڵێ قوڕ بەسەری من کە ئاگرێکی ئاوا چاوەڕوانم دەکات لە قیامەتدا:

* قال الاعمش: مرَّ ربيع بن خيثم – رحمه الله – في الحدادين فنظر الى الكير فصعق، قال الاعمش: فمررتُ بالحدادين لاشبه به فلم يكن عندي خير.[2]

---

١ اخرجاه في الصحيحين.

٢ صفة الصفوة (٢/٤٣).

زانای خواناس – ئەعمەش – دەڵێت: پیاوچاك و خواناسی مەزن – ڕەبیعی کوڕی خەیسەم – (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) جارێکیان لە ناو بازاڕی ئاسنگەرەکانەوە تێپەڕیو هەر کە چاوی کەوت بە کورەی ئاسنگەرێك کە هەموو ئاسنەکان سووربووبوونەوە لە هۆش خۆی چوو و کەوتە زەویەکەوە.. منیش کە ئەو ڕووداوە زۆر کاری تێکردمو ویستم چاو لەو خواناسە گەورەیە بکەمو ڕۆیشتم بۆ ناو ئاسنگەرەکان تا سەیری کورەکەیان بکەم و کەمێ لە هۆش خۆم بچم.. بەڵێ سەیرم کرد بەلام هەستم کرد زۆر ئاساییم و هیچم لێ نەهات و ئیتر زانیم من ئەو پیاوە نیم و خێرم تیا نییە.

ئێمە کە سەرەتاین و دەمانەوێت لە سفرەوە دەست پێ بکەین بە گەڕانەوە بۆ لای خوا و گرتنەبەری کاروانی صالّحان بۆیە ئاساییە کە یەك جار و دەیان جار سەیری تەنوور بکەین لە هۆش خۆمان ناچین بەلام بە لەوە خوارتریش ڕازین کە ئاگرە سەختەکەی پەروەردگارمان بیربخاتەوە و لە گوناه کردن بمانگەڕێنێتەوە هەر باشە.

چونکە صالّحان پشتوێنی ڕەشیان بڕیووە و قۆناغێکیان بڕیوە و من و تۆ نابین بە زانا و خواناسی ئیسلام (عطاء السلمي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و من و تۆ هێشتا پشتوێنی سپیمان نەبەستووە، بۆیە هێشتا لە قۆناغی پڕۆڤە داین:

* عن العلاء بن محمد قال: دخلت على عطاء السليمي – رحمه الله – وقد غشي عليه، فقلت لامرأته (ام جعفر) ما شأن عطاء؟ فقالت: سجرت جارتنا التنور فنظر إليه فخر مغشياً عليه.[1]

واتە: عەلائی کوڕی محمد دەڵێ: جارێکیان چووم بۆ ماڵی مامۆستا عەتای سولەیمی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە هۆش خۆی چووبوو ڕاکشابوو، وتم بە خێزانەکەی کە (دایکی جەعفەر)یان پێ دەگوت: ئەمە خێرە مامۆستا عەتا چیەتی؟ ئەویش وتی: ژنی دراوسێکەمان تەنووری گەرم کرد و عەتا سەیرێکی کرد و پاشان ئاوای بەسەر هات و لە هۆش خۆی چوو.

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٢٠).

ترسناکترین سزا ئەوەیە کەسێك بە ئاگر بسوتێنی چونکە هەموو بەشەکانی لەش هەست بە ئێشەکەی دەکەن و ماوەی گیان دەرچوونیشی دووردرێژە و مرۆڤی سوتاو بە ئاسانی گیانی دەرناچێت، بۆیە خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەرمان کە بە ئاگر سزای هیچ کەس یان گیانلەبەرێك بدەین‌و ئەو سزایەی تایبەت کردووە بە خۆیەوە و وەك سزای شاهانەی لیّ هاتووە و پێغەمبەرمان لەم بارەوە فەرموویەتی:

* قال رسول الله (ﷺ) (لا يعذبُ بالنار الاّ رب النار).[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بۆ هیچ کەسێك نییە سزای تاوانبارێك بدات، بە ئاگر بیسوتێنی‌و بۆ کەسیش نیە بە هۆی سوتاندنەوە کەسێك بکوژێت با شایستەی کوشتنیش بێت ئەو کەسە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە براکانم، سوتاندن ناخۆشترین و بە ئێشترین سزایە، دەی موسڵمانیش فەرمانی پێدراوە کە ئەگەر کەسێکی کوشت یان گیانلەبەرێکی سەربڕی با بە جوانترین شێوە و بە کەمترین ئێش ئەو کارە ئەنجام بدات وەك دەفەرموێت: ((اذا قتلتم فاحسنوا القتلة)) و (واذا ذبحتم فاحسنوا الذبحة).

ئێمە کە بە نیازین خۆمان‌و خێزان و ماڵ‌و منداڵمان بکەونە سەر سکەی کاروانی صالّحان‌و بە پیاوچاکی‌و ڕەوشت بەرزی‌و دەست‌و دڵ‌و دەروون پاکیەوە بژین، دەبێت خۆمان پێش منداڵەکانمان‌و خزم‌و کەس‌و دراوسێکانمان ترسی تەواوی ئاگری دۆزەخ‌و سزای پڕ لە ئێش‌و ڕیسواکەرو سەختی پەروەردگار لە دڵماندا بچەقێت ئەوجا خەڵکی لیّ بترسێنین..

ئەوە بۆچی تۆ بە منداڵەکەت دەڵێیت: مەگەر نەیەیتەوە دەبێت ئەوەندەت لیّ بدەم هەموو گیانت بشکێنم!، ئەو منداڵەش هەر لەو کاتەوە دەست دەکات بە گریان‌و باوکەڕۆ ئەمە چیە؟ وەڵاهی باوکم بە نیازە لێم بدات چونکە بیّ پرسی ئەو چوومەتە کۆڵان ئەشزانم قسەی خۆی دەباتە سەر..

ئەی بۆچی من و تۆش هەر لە ئێستەوە خەممان لیّ نەیەت و نەگرین و ترس دامان نەگرێت کە خوای هەموو کەون و کائینات هەڕشەی لێدانێکی سەختمان لیّ دەکات کە زیندانی کردنە لە ژووری پڕ لە ئاگردا و خواردنی ئاگر و خواردنەوەی ئاگر.

---

[1] رواه ابو داود باسناد صحيح.

من و تۆ ئەگەر بگرین بۆ خۆمان باشە، ئەگینا خوا هیچ سوودی لێ نابینێ و خوای گەورەیش سەدان و هەزارانی وەك (شێخ یەزیدی کوڕی مورسەد) هەیەو بەردەوام لە ترسی سزای ئاگری جەهەنەم فرمێسك وشك نابێتەوە لە چاوەکانیان و هەردەم دەگرین:

* قال عبدالرحمن بن يزيد بن جابر: قلت ليزيد بن مرثد مالي أرى عينيك لاتجف؟ قال: وما مسألتك؟ قلت: لعل الله تعالى ينفع به، قال: ان الله توعدني ان انا عصيته ان يسجنني في النار، والله لو توعدني ان يسجنني في الحمام كنت حرياً ان لا يجف لي دمع.[1]

واتە: عبدالرحمن ی کوڕی یەزیدی کوڕی جابر دەڵێ: لە یەزیدی کوڕی مەرسەدم پرسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەمە چیە دەبینم چاوەکانت بەردەوام فرمێسکیان لێ دێو وشك ناکات؟ ئەویش فەرمووی: بۆچی دەپرسیت؟ وتم: بەڵکو خوای تەعالی سوودێکم پێ بگەیەنێت، فەرمووی: خوای گەورە هەڕشەی لێ کردووم ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکەم لە ناو ئاگردا زیندانم دەکات، دەی سوێند بە خوا ئەو هەڕشەی لێ بکردمایە کە لە ناو حەمامێکشدا زیندانیم بکات جێگای خۆی بوو کە بەردەوام بگریامایە و چاوەکانم فرمێسکیان لێ نەبڕایە.

عەون ی کوڕی عبدالله یش وانەیەکی گرنگ پێشکەشی ترسنۆکان دەکات ئەوانەی لە ئاگری جەهەنەم دەترسن، هەر کاتێ لە ترسی خوا و ڕۆژی دوایی و سزای جەهەنەم گریانی هاتبێ جوان بە فرمێسکەکانی دەم و چاوی خۆی پێ سڕیوە، ئەمە لەبەرچی با گوێ لە خۆی بگرین وەڵامان دەداتەوە:

* عن ابي معشر قال: رأيت (عون بن عبدالله (رحمه الله)) في مجلس (ابي حازم) (رحمه الله) يبكي ويمسح وجهه بدموعه فقيل له لم تسمح وجهك بدموعك قال بلغني انه لا تصيب دموع الانسان مكانا من جسده الا حرّم الله عز وجل ذلك المكان على النار.[2]

واتە: ئەبی میعشەر دەڵێ: (عەونی کوڕی عبدالله)م بینی لە یەکێ لە کۆڕە ئیمانیەکانی (أبی حازم)دا دەگریا و بە فرمێسکەکانی خۆی دەموچاوی خۆی دەسڕی،

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/٥١٩).

٢ صفة الصفوة (٣/٥٠).

لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ کردو ئەویش فەرمووی: پێم گەیشتووە کە فرمێسکی مرۆڤ بەری هەر بەشێکی لەش بکەوێت خوای گەورە ئەو جێگایە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێت، چونکە لە ترسی پەروەردگار و ترسی جەهەنەم گریاوە.

ئەگەر حەزت لە شتێك کرد و دەستت کەوت، سوپاسی خوای میهرەبانی لەسەر بکەو ئەوەت یاد بکەوێتەوە کە دۆزەخیەکان –پەنا بە خوا– هەرچی شتێك حەزی لێ بکەن و دڵیان بۆی لێ بدات لێیان دەشارنەوە و (ابن عمر)یش لە کاتی هاتنەدی حەزەکانیدا دەستی دەکرد بە گریان ئاخۆ بۆچی؟

* عن سمير الرياحي عن ابيه قال: شرب عبدالله بن عمر ماءً بارداً، فبكى بكاءً فاشتد بكاءه، فقيل له: ما يبكيك؟ فقال: ذكرت اية في كتاب الله عز وجل: ﴿وحيل بينهم وبين مايشتهون﴾ فعرفت ان اهل النار لا يشتهون شيئاً شهوتهم الماء البارد، وقد قال الله عز وجل: ﴿افيضوا علينا من الماء او مما رزقكم الله﴾.[1]

واتە: سەمیر الریاحی لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خطاب (خوا لێی ڕازی بێت) جارێکیان ئاوی ساردی خواردەوە، دەستی کرد بە گریان و گریانێکی بەکوڵ! لێیان پرسی: هۆی گریانەکەت چیە؟ فەرمووی: ئایەتێکم لە کتێبەکەی خوای – عز وجل – یاد کەوتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وحيل بينهم وبين مايشتهون﴾، (واتە: ئارەزوو و حەزەکانیان دەخرێتە ژێر پێ و جێبەجێ ناکرێت بۆیان)و دەی من زانیومە کە جەهەنەمییەکان هیچ شتێکیان حەز نیە بە ئەندازەی ئاوی سارد –سەهۆڵاو– و خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿افيضوا علينا من الماء او مما رزقكم الله﴾، (واتە: بە بەهەشتیەکان دەڵێن: تکاتان لێ دەکەین کەمێ لەو ئاوە سازگارەی لە لاتانە بیبەخشن پێمان یان لەو خواردنانەی کە خوا پێی بەخشیون).

وەرن یاران، ئەی شەیدایانی کاروانی صاڵحان.. وەرن لە لای خوشکێکی موسڵمان یەکێ لە ئافرەتە پێشەواکانی کاروانەکە وانەیەکی ترسان لە سزای جەرگ بڕی پەروەردگار بخوێنین و ئەو ساتەتان بیربێتەوە کە خوای ئەرز و ئاسمانەکانی حوکمی

---

[1] صفة الصفوة (١/٢٥٤).

زیندانی ئەبەدیان لە ناو ئاگردا دەدات بەسەردا – پەنامان بە خوا – و فەرموون لەگەڵ (ام هارون)دا بن:

* قال احمد بن أبي الحواري: خرجت ام هارون – رحمها الله – من قريتها تريد موضعها فصاح صبيّ بصبيّ (خذوه) فسقطت ام هارون فوقعت على حجرٍ فدميت فظهر الدم من مقنعتها.[1]

واتە: ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری دەڵێ: (ام هارون) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە لادێکەی خۆیانەوە بەرەو شوێنە تایبەتیەکەی خۆی کە بۆ خواناسی تایبەتی کردبوو دەڕۆیشت، لە ڕێگا چاوی کەوت بە چەند منداڵێك یاریان دەکرد، یەکێکیان بە یەکێکی تریانی وت (خذوه)، واتە: بیگرن! بە بیستنی ئەو وشەیە – بیگرن – (ام هارون) کەوتە سەر زەویەکە و سەری دای بە بەردێکدا و سەری شکا و خوێنی سەری لە سەرپۆشەکەیەوە دایدا!

چونکە ئەو ئایەتەی هاتەوە بیر کە خوای – عز وجل – بە مەلائیکەتەکانی دەفەرموێت: (بیگرن و بیبەن زنجیری کەن و فڕێی بدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە و دەفەرموێت: ﴿خذوه فغلوه ثم الجحيم صلوه﴾.

براکانم توخوا با لەو ئاگرە بترسین کە لە ڕۆژێکدا (٧٠) هەزار جار بە دەم سووتانەوە دەمانبرژێنێت و دەمانخوات – بە خوا مەشهەدێکی ترسناکە و کاریگەرە بۆ دڵێك پەردەکەی لەسەر دڵی خۆی لادابێت با گوێ بگرین بۆ پیاوە صاڵحە ناودارەکەی بەسرە و لەم بارەیەوە دیمەنێکی ترسناك نقلێ دەکات:

* قال البيهقي – رحمه الله – روينا في كتاب (البعث) عن الحسن البصري – رحمه الله – انه قال من هذه الاية(*) تاكلهم النار كل يوم سبعين ألف مرة كلما أكلتهم قيل لهم عودوا فيعودون كما كانوا.[2]

---

١ صفة الصفوة (٤/٢١٤).

* ﴿كلما نضجت جلودهم بدلناهم جلوداً غيرها﴾.

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/١٦٠).

واتـە: ئیمـامی بەیهـەقی (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرمووێت – لـە باسـی (زیندووبوونەوەدا) باسمان کردووە و لە حەسەنی بەسریەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هێناومانـە کـە دەربـارەی ئایـەتی ﴿كلمـا نـضجت جلـودهم بـدلناهم جلـوداً غيرهـا﴾. دەفەرمووێت واتە: ئـاگر لـە هـەموو ڕۆژێکـدا (٧٠) هـەزار جـار دەیانبرژێنێـت و پاشـان دەیانخوات و هەر جارێکیش دەیـانخوات پیـان دەوترێـت: وەك خۆتانتـان لێ بێتـەوە ! خێرا وەك خۆیانیان لێ دێتەوە.

ئەگەر بەم لەش و جەستەی ئێستاشمانەوە بمانخەنە ئاگری دۆزەخ –پەنا بە خـوا– ئێش و ئازارمان لـە ڕادەبـەدەر دەبێـت.. بـەڵام بـەوەوە ناوەسـتن جەسـتەمان گـەورە دەکەن بۆ ئەوەی زیاتر و جوانتر سزاکان بچەژین و ئێشی زیاترمان پێ بگـات، دەی بـا پێکەوە ئەم فەرموودەیە بخوێنینەوە موچڕکێك بـە گیانمانـدا بێـت بـەڵکو ئەمـە ببێتـە هۆی ئەوەی شایانی ناو کاروانە موبارەکەکەمان بکات:

* روى البيهقي عن المقدام عن النبي (ﷺ) في الكافر قال: (يعظـمّ للنـار حتـى يـصير جلده أربعين باعاً، وحتى يصير ناب من انيابه مثل أحد.[١]

واتـە: ئیمـام بەیهـەقی لـە میقـدام ەوە ئـەویش لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەربارەی جەسـتەی بێبـاوەڕ لـە نـاو ئـاگری دۆزەخـدا دەفـەرمووێت: لەشیان ئەوەندە زەبەلاح دەکرێت کە پێستیان دەبێتە (٢٠) گەز و یەك ددانیـشیان بـە ئەندازەی کێوی ئوحود گەورە دەکرێت.

زمانیشیان درێژ دەبێت.. ئەوانەی لە دنیا دەربارەی خوا و پێغەمبەر بێ حورمەتانە زمان درێژیان کردووە و بێباوەڕ بوون با بزانین چەندێ درێژ دەبێت:

* عن عبدالله بن عجلان المحاربي قال: سمعـت عبـدالله بـن عمـر – رضـي الله عنـه – يقـول: قـال رسـول الله (ﷺ): (ان الكـافر ليجـرُّ لـسانه فرسـخين يـوم القيامـة يتوطّـأُه الناس).[٢]

---

١ الجامع لشعب الايمان (١٦١/٢).

٢ رواه الحاكم وصححه وحسنه الترمذي (٣) الجامع (١٦٢/٢).

واتــە: عبــدالله ی کــوڕی عــەجلانی موحــاریبی لــە (عبــدالله ی کــوڕی عمــر)ەوە دەگێڕێتــەوە کــە پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی: زمــانی کــافر لــە نــاو ئــاگری جەهەنەمدا بە ئەندازەی دوو فەرسەخ[١] درێژ دەبێـت تـا وای لێ دێـت خـەڵکی بەسـەریدا تێدەپەڕن و دێن و دەچن.

خوشك و برایانم.. با مەسەلەکە بـە سـوك نـەگرین، چـونکە مەسـەلەکە زۆر لـەوە گەورەترە کە ئێمە بیری لێ دەکەینەوە.. و ئاگری دۆزەخ زۆر زۆر قوڵە و بێ بنە، من و تۆ لە دەریـای ئاویشدا نـاوێرین مەلـە بکـەین ئـەڵێین قووڵـە! ئەگـەر ڕۆژێـك بـچین بـۆ مەلەوانگەیەك تا چەند جار نەپرسین لە خاوەنەکەی چەند مەتر قوڵە؟ ناوێرین خۆمانی تێ فڕێ بدەین؟ ئەمە بۆ ئاو ئەی هاوار ئەی ئەگەر ئاگر بێت:

* عن ابي هريرة – رضي الله عنه – قـال: كنـا مـع رسـول الله (ﷺ) إذ سمـع وجبـة فقال: هل تدرون ما هذا؟ قلنا: الله ورسوله أعلم، قال: هـذا حجـر رمـى بـه في النـار منـذ سبعين خريفاً فهو يهوي في النار الان حتى انتهى الى قعرها، فسمعتم وجبتها.[٢]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لە تەك پێغەمبـەری خـوادا بـووین –بۆ جێیەك دەڕۆیشتین– لە ڕێگا دەنگێك هاتە بەر گوێمـان و پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: ئەزانن ئەم دەنگە چی بوو؟ ئێمەش وتمان: خوا و پێغەمبەرەکـەی دەزانـن، فەرمووی: ئەمە بەردێك بوو (٧٠) ساڵ لەمەوبەر فڕێ دراوەتە ناو ئاگری دۆزەخ ئێـستا گەیشتە بنەکەی و ئێوەش گوێتان لە دەنگی کێشان بە بنەکەیدا بوو.

ئەبێ بە جۆرێك لە سزای سەختی جەهەنەم بترسین کە ئەگەر خەڵکی بمانبینێ بڵـێ ئەڵێ بە چاوی خۆی کڵپە و گەرمای سەختی جەهەنەمی بینیووە! و ئەگەر توانیمان وا لە خۆمان بکەین ئەوە دەرونیشمان بێزی دەێتەوە لـە گونـاهکردن و ئەگـەر وەك ئـەبو داودی حەفریمان لێ هات بە دڵنیاییەوە لە زانکۆی صاڵحاندا ناونووس کراوین.

* قال ابن عبدوية: ( سمعت عباساً الدوري يقول: حدثنا أبو داود الحفـري ولـو رأيـت أبا داود لرأيت رجلاً كانه اطلع الى النار فرأى ما فيها).[٣]

---

١ فەرسەخ نزیکەی (٥–٦) کیلۆمەتر دەکات.

٢ رواه مسلم في رياض الصالحين، (لا: ١١٧).

٣ صفة الصفوة (١١٧/٢).

واتە: ئیبن عبدویە کە پیاوێکی فارسیە و دەڵێ: جارێك گوێم لە عەباسی دوری بوو دەیووت: ئەبو داودی حەفری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) قسەی بۆ دەکردین و ئەگەر بتبینیایە وات دەزانی ئەم پیاوە لە ناو ئاگری دۆزەخەوە گەڕاوەتەوە بۆ دنیا و هەموو جۆرە سزاکانی ناوی بە چاوی خۆی دیوە — ئەوەندە لێی دەترسا.

ئێش و ئازار و سزاکانی ناو ئاگری دۆزەخ ئەوەندە ترسناکن کە مرۆڤ ئاواتەخوازە خوای گەورە نەیخاتە ناویەوە ئیتر گرنگ نییە بەهەشتی بەرینی پێ بدات یان نا، صاڵحان لە ترسی ئاگری دۆزەخ خۆشی و کامەرانی ناو بەهەشتیان لە بیرنەماوەو هەر خەمی ئەو سزا سەختەیانە (ابن ابي هذيل) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) داوای بەهەشتی لە خوا نەکردووە:

* عن العوام بن حوشب عن ابن ابي هذيل قال: لقد شغلت النار من يعقل عن ذكر الجنة.[1]

واتە: عەوامی کوڕی حەوشەب دەڵێ: (ابن ابي هذيل) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: بە ڕاستی ئاگری دۆزەخ ژیرمەندانی وا ترساندووە کە نایانپەرژێت داوای بەهەشت و باسی بەهەشت بکەن.

عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالب (خوا لە خۆی و باوك و باپیری ڕازی بێت) لە کاتی ئاگر کەوتنەوەشدا هەر خەیاڵی لە لای ئاگرەکەی قیامەت بوو و هاواریان کردووە ئاگر ئاگر ئەی نەوەی پێغەمبەری خوا ئاگر کەوتەوە:

* عن أبي نوح الانصاري قال: وقع حريق في بيت فيه (علي بن حسين) (رضي الله عنهما) وهو ساجد، فجعلوا يقولون له: يا ابن رسول الله النار، يا ابن رسول الله النار، فما رفع رأسه حتى اطفأت، فقيل له: ما الذي الهاك عنها؟ قال: ألهتني عنها النار الآخرة.[2]

واتە: ئەبی نوحی ئەنصاری دەڵێ: ئاگرێ کەوتەوە لەو خانووەدا کە عەلی کوڕی حوسەینی تێدا میوان بوو، لە نوێژدا بوو سەری لە سوژدەدا بوو، هاواریان کرد: ئەی نەوەی پێغەمبەری خوا ئاگر، ئاگر، ئەی نەوەی پێغەمبەری خوا ئاگر، ئاگر، ئەو هەر

---

١ صفة الصفوة (٢/٣٠).

٢ صفة الصفوة (٢/٦٧).

لە نوێژەکەی خۆیدا بوو سەری هەڵنەبڕی تا ئاگرەکەیان کوژاندەوە، و دواتر کە لێ بوویەوە لێیان پرسی: قوربان چی شتێك خەیاڵی لە لای ئاگرەکە نەهێشتی؟ و ئەویش فەرمووی: ئەوەی ئەم ئاگرەی لە بیردا نەهێشتم ئاگرەکەی ڕۆژی قیامەت بوو.

سەرمەشقە مەزنەکەی ئیسلام –پێغەمبەری خوا (ﷺ)– زۆر لە ئاگری دۆزەخ ترساوە چونکە خۆیشی بە چاوی خۆی لە شەوی میعراجدا ئەو سزا سەختەی بینیوە بۆیە زۆرجار حەزی دەکرد هاوەڵانی مەزنی لێ بترسێنێت و هەوڵ بدەن بە کردەوەی جوان و ماڵ بەخشین و قسەی شیرین و هەنگوینی خۆیانی لێ بپارێزن و هەژارترین کەسیان لەو پێناوەدا ماڵ ببەخشێت و نەڵێ پارەم نییە! خۆ هەموو کەسێ لەتێ خورما و وتەی شیرینی پێیە:

* عن عدي بن حاتم – رضي الله عنه – ان رسول الله (ﷺ) قال: (اتقوا النار) ثم التفت ثم قال: (اتقوا النار)، قال: ثم أعرض واشاح ثلاثاً حتى قلت انه ينظر اليها ثم قال: ((اتقوا النار ولو بشق تمرة، فان لم تجدوا فبكلمة طيبة)).[1]

واتە: عدی کوڕی حاتەمی تەی (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لە ئاگری دۆزەخ بترسن))و لای کردەوە بۆ ئەولاوە و پاشان فەرمووی: ((لە ئاگری دۆزەخ بترسن))، پاشان پشتی هەڵکرد و ڕەنگی گۆڕا سێ جار، تا وام لێهات بڵێم بە چاوی خۆی سەیری ئاگری دۆزەخی دەکرد، پاشان فەرمووی: ((خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئیتر با بە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێت و ئەگەر ئەوەشتان لە دەستدا نەبوو با بە قسەیەکی خۆشیش بێت)).

خوشکان برایان وەرن با پێکەوە لە ئاگری دۆزەخ بترسین و بە خوا – کوڕینە – ترسان لەو ئاگرە جێگەی شانازییە! و عەیب نییە و کەمی نییە! ئێمە لە مار دەترسین! لە وەرگەڕانی سەیارەکانمان دەترسین! لە بڕینی موچە دەترسین! لە پۆلیس و ئاسایش دەترسین! لە زەرەری بازرگانی دەترسین! لە کارەباگرتن دەترسین! لە ئاوی دەریا دەترسین! لە نەخۆشی ئەنفلۆنزا دەترسین!

---

١ اخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما.

بەبێ ئەوەی جارێ تاقیمان کردبێتەوە! بەبێ ئەوەی کەس ترساندبینی لێی! بەبێ ئەوەی لەبەر هیچ کەس و بۆ ڕیا لێیان بترسین!

دەی توخوا یارانم ترسان لە ئاگری دۆزەخ جێگای خۆی نییە؟ حەق نییە لێی بترسین؟ کە پێغەمبەرێك ترساندوینی لێی لە ژیانیدا ئەوەندەی گەردیلەیەك درۆی لێ نەبینراوە ئیتر بۆ باوەڕ ناکەی؟ ئیتر بۆ ناترسی؟ دەی سەیری ئەم فەرموودە کورتە بکە و کەمێ بترسە وەڵڵاهی بۆ هەردوو دنیا قازانجتە:

* عن ابن مسعود – رضي الله عنه – قال: قال رسول الله (ﷺ): (يؤتى بجهنّم يومئذٍ لها سبعون الف زمام، مع كل زمام سبعون ألف ملك يجرونها).[١]

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) – کە یەکێکە لە (عبدالله) مەزنەکانی ئیسلام – دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا جەهەنەم دەهێنن کە حەفتا هەزار قوڵپی هەیە! و هەر قوڵپێکیش حەفتا هەزار مەلائیکەت هەڵیان گرتووە، جا بزانە چەندان ملیۆن مەلائیکەت دەسکەکانیان گرتووە ئەگینا ئەوەندە توڕەیە لە خەڵکی سەرکەش و تاوانبار خەریکە خۆی دەکێشێ بەسەر خەڵکە وەستاوەکەی ڕۆژی حەشردا.

پیاوچاك و پیاو صاڵحی ئیسلام (حمزة الزيات) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) خەوێکی خۆش دەبینێ و لە خەودا خوای – عز وجل – دەبینێ و ئەویش ڕێگای خۆ پاراستنی لە ئاگر و سزای سەختی جەهەنەم پێ نیشاندا و ئێمەش چاوەڕوانین هەمان وانەی لێ وەربگرین:

* رأى حمزة بن عمارة الزيات – رحمه الله – سبحانه وتعالى في المنام فقال له: يا حمزة وعزتي وجلالي لا أعذب لساناً تلا القران بالنار ولا قلباً وعاه ولا اذناً سمعته ولا عيناً نظرته، فقلت سبحانك سبحانك.[٢]

واتە: یەکێ لە صاڵحان بە ناوی حەمزەی کوڕی عومارەی زەیاتەوە لە خەودا خوای پەروەردگاری بینی کە پێی وتبوو: ئەی حەمزە سوێند بە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆم،

---

١ رواه مسلم (٢٨٤٣).

٢ صفة الصفوة (٣/٧٨).

زمانێك قورئان بخوێنێت بە ئاگری جەهەنەم سزای نادەم، و دڵێکیش لێی تێگەیشتبێت و لێی ورد بووبێتەوە و گوێ یەکیش گوێی بۆ گرتبێت و چاوێکیش سەیری ئایەتەکانی کردبێت، حمزە دەڵێ: منیش وتم: پاك و بێگەردی بۆ تۆ، پاك و بێگەردی بۆ تۆ.

خوایە بمانپارێزە لەو ئاگرەی کە پێغەمبەری ڕاستگۆ (ﷺ) هەواڵی پێداوین کە سووکترین سزا لە ناو دۆزەخدا سەختترین سزای دنیایە کە تا ئێستا زانستی نوێ نەیتوانیوە جوتێ پێڵاوی ئاگرین دروست بکات کە پێش ئەوەی قاچی بسوتێنێت مێشکی بکوڵێنێ — خوایە ڕەحممان پێ بکە و لەو سزایە بمانپارێزە:

* عن النعمان بن بشير — رضي الله عنه — يقول: ان اهون اهل النار عذاباً يوم القيامة لرجل يوضع في أخمص قدميه جمرتان يغلي منهما دماغه ما يرى ان أحداً اشدّ منه عذاباً، وانه لأهونهم عذاباً.[1]

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێی ڕازی بێت) کە یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە — دەفەرموێت: (سووکترین سزای ناو ئاگری جەهەنەم لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەیە پیاوێك دەهێنن و دوو پشکۆ دەخەنە ژێر پێی ئەوەندە بە ئێشە لە پێشدا مێشکیشی دەکوڵێنێ و خۆیشی وا ئەزانێ کەس نییە سزاکەی لە سزای ئەو قورستر بێت —پەنامان بە تۆ پەروەردگار—) کەچی سزاکەی سوکترین سزایە.

ئەی خوشکی صالیحەم، ئەی برای صالحم، با هەوڵ بدەین لە هاوەڵانی پەروەردگار بین.. ئەزانی لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگار هاوەڵی هەیە، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی پێشبڕکێ دەکات لە شەرەفمەندبوون بە هاوڕێیەتی خوا و دوورکەوتنەوە لە هاوەڵانی جەهەنەم (أصحاب السعير).

* عن ابي العوام عن كعب قال: ((يجاء بجهنّم يوم القيامة كانها متن إهالة، حتى اذا استوت عليها اقدام الخلائق، نادى منادٍ: خذي أصحابك ودعي أصحابي، قال: فيخسف بأولئك)).[2]

---

١ متفق عليه (رياض الصالحين، ص: ١١٦).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/١٢٧).

واتە: ئەبی عەوام دەگێڕێتەوە لە کەعبەوە کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا جەهەنەم دەهێنن بۆ ناو ساحەی مەحشەر و وەك بەزی تواوەی بنی تاوە وایە و ئیتر کاتیّ جەهەنەمییەکان دیاری کران و جیاکرانەوە لە خەڵکەکەی تر خوای – عز وجل – دەفەرمووێت: ئەی جەهەنەم ئا دەی هاوڕێکانت بەرە لەگەڵ خۆت و هاوڕێکانی خۆمم بۆ بەجیّ بهێڵە، دەڵیّ: دواتر هاوەڵانی جەهەنەم دەبرێن بە ناخی زەویدا – پەنا بە خوا –.

ئەی خوشك و برایانم ئەزانن ئەگەر ترسان لە ئاگری جەهەنەمتان تیا بێت خەڵکی لە دوورەوە هەستی پیّ دەکەن؟ و بە گوڕ و تینێکی گەورەترەوە دێن بۆ لاتان و گوێتان لیّ دەگرن؟:

* عن حفص بن عبدالرحمن قال: اتيت مسعر بن كدام – رحمه الله – ليحدثني فكأنه رجل أقيم على شفير قبر ليدفع فيه، وقال – مرة اخرى – على شفير جهنم ليلقى فيها.[1]

واتە: حەفس ی کوڕی عبدالرحمن دەڵیّ: چوومە خزمەتی موسعیری کوڕی کودام (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) بۆ ئەوەی ئامۆژگاری و قسەی خێرم بۆ بکات، قسەی بۆ کردم بەڵام بە شێوازێك وەك بڵێی لەسەر قەراغی گۆڕێکە و دایدەهێڵنە خوارەوە بۆ ناوی یان ئەڵێی کەسێکە کە لە لێواری جەهەنەمدا دانراوە و خەریکن فڕێی دەدەنە ناو ئاگرەکەوە.

خوشکێکی تری سەرمەشقی کاروانەکەمان ناوی (ئامینەی کچی موریع)ە (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) هەر کاتیّ باسی ئاگری جەهەنەم بکرایە لە لای خێرا دەستی دەکرد بە گریان و دەیوت:

* قال رباح بن الجراح الموصلي: كانت آمنة بنت المورع من الخائفين وكانت إذا ذكرت النار واهل النار بكت وابكت وقالت: ادخلوا النار، واكلوا من النار، وشربوا من النار، وعاشوا في النار ثم تبكي.[2]

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/٥٤٥).

٢ الجامع لشعب الايمان (٢/٥٤٩).

واتە: ریباحی کوڕی جەراح دەڵێ: ئامینەی کچی موریع لەو کەسانە بوو کە زۆر دەترسا — لە ئاگری جەهەنەم — و هەر کاتێ باسی ئاگری جەهەنەم و دانیشتووانی بکرایە، دەستی دەکرد بە گریانو خەڵکەکەشی دەکردە گریان و دەیفەرموو: دەخرێنە ناو ئاگرەوە، و خواردنیان ئاگرە، خواردنەوەیان ئاگرە و ژیانیان لە ناو ئاگردایە.. پاشان دەستی دەکردەوە بە گریان.

برا و خوشکانی کاروانچی، هەموو کاتەکان بە هەل بزانە و بە هەموو هۆکارێك هەوڵ بدە لە ئاگری سەختی دۆزەخ بە دوور بیتو هۆکارێکی دوعا و پاڕانەوەی صالحان و خواناسانە بۆت لە ناو پاصدا یان لە سەرەی نانەوایەکدا یان لە سەردانی نەخۆشێکدا یان لە بازاڕدا یان لە هەر کوێ گەیشتی بە یەکێ لە صالحان خێرا تاکە داواکاریت لێی ئەوەبێت کە لە خوا بپاڕێتەوە بۆت کە لە ئاگری دۆزەخ بتپارێزێت و داوای دوعای تری لێ مەکە کە پێویست ناکات:

* عن جعفر بن محمد صاحب بشر قال: لما اعتل بشر بن الحارث — رحمه الله — فعادته امنة الرملية — رحمها الله — من الرملة فانها لعنده اذ دخل احمد بن حنبل — رحمه الله — يعوده، فقال: من هذه؟ فقال: هذه آمنة الرملية بلغها علتي فجاءت من الرملة تعودني قال فسلها تدعوا لنا، فقالت: اللهم بشر بن الحارث واحمد بن حنبل تستجيرانك من النار فأجرهما، قال احمد فانصرفت فلما كان من الليل طرحت اليّ رقعة مكتوب فيها: ((بسم الله الرحمن الرحيم: قد فعلنا ولدينا مزيد)).[١]

واتە: جەعفەری کوڕی محمد کە هاوڕێی — بشری کوڕی حارث — ە دەڵێ: کاتێ بشر نەخۆش کەوت (ئامینە الرملية) لە شاری ڕەملەوە هات بۆ سەردانی و لەو کاتەدا کە ئەو لەوێ بوو ئیمام احمدی کوڕی حەنبەل یش هات بۆ سەردانی و لەوێ وتی: ئەم خوشکە کێیە؟ بشریش وتی: ئەمە ئامینەی ڕەملیە و کاتێ زانیویەتی من نەخۆشم لە ڕەملەوە بەڕێ کەوتووە بۆ لای من تا سەردانم بکات، احمد وتی: دەی داوای لێ بکە با دوعای خێرمان بۆ بکات.

---

١ صفة الصفوة (٢١٥/٤).

ئامینەیش دەستی بەرزکردەوە بۆ لای خوا و فەرمووی: ئەی پەروەردگارم بشری کوڕی حارث و احمدی کوڕی حەنبەل داوات لێ دەکەن لە ئاگری دۆزەخ بیانپارێزیت، دەی — خوایە — بیانپارێزە لێی، احمد دەڵێ کاتێ گەڕاینەوە بۆ ماڵ و شەو داهات لە شەودا پارچە وەرەقەیەك فڕێ درایە باوەشم و تیایدا نووسرابوو: بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەو نزایەمان قبوڵ کرد و زیاتریشمان لە لا هەیە.

خوشکی باوەڕدارم.. خۆت بە کەم مەزانە دەتوانیت نەك هەر صالیحە بیت بەڵکو دەتوانیت پێشەوایەتی کاروانی صالحانیش بکەیت، قەد مەڵێ ناگەمە براکەم یان هاوسەرەکەم یان باوکم لە خواناسی و بەندایەتیدا! بەڵکو خاتوو (عەبدە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە خوشکی گەورە پیاوصالحی ئیسلام (أبو سليمان الداراني)یە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و (أبو سليمان) دەڵێ: ئەو خوشکەم زۆر زۆر لە ئاگری دۆزەخ دەترسا:

قال ابو سليمان الداراني — رحمه الله — وصفت لاختي عبدة قنطرة من قناطر جهنم فاقامت يوماً وليلة في صيحة واحدة ما تسكت ثم انقطع عنها بعد فكلما ذكرت لها صاحت قلت من اي شيء صياحها؟ قال: مثلت نفسها على قنطرة وهي تكافأ بها.[1]

واتە: ئەبو سولەیمانی دارانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: دیمەنێکی دۆزەخم بۆ عەبدەی خوشکم باس کرد، شەو و ڕۆژێك بەبێ برانەوە هاواری کرد و پاشان بێ دەنگ بوو، لەو ڕۆژە بە دوا هەر کاتێ باسی ئاگری دۆزەخم بکردایە هەمان هاواری دەکردەوە، ڕاوی دەڵێ لێم پرسی: لە ترسی چی ئەو هاوارەی دەکرد؟ ئەویش فەرمووی: بە خەیاڵ خۆی وا دادەنا کە خراوەتە ئەو شوێنەوەو سزا دەدرێت.

١ صفة الصفوة (٢١١/٤).

# چوارەم

## صاڵحان لە فەتوادان ترساون

خۆزگە بۆچی مەسەلەی فەتوادانم بە گرنگ زانیوە بۆ خوشکان و برایانی ناو کاروانە موبارەکەکەی صاڵحان و بە دوای سێ ترسی زۆر گەورەدا هێناومە؟

چونکە فەتوادان زۆر ترسناکە، لێژگاییەکی سەختە، هەڵدێریکی مسۆگەرەو تیاچوونی قیامەتی مرۆڤی پێوە بەندە، و سزای سەختی لەسەرە، بۆیە خواناسان‌و صاڵحانی ئەم ئوممەتە وەسەتە خۆیان بە دوور گرتووەو فەتوادانیان بە کارێکی ترسناک سەیر کردووە، چونکە هەر لە ڕێگەی فەتواوە خوێنی خەڵکی، ماڵی خەڵکی، ناموسی خەڵکی حەلاڵ دەکرێت‌و حەرامی خوا حەلاڵ دەکات‌و ئەگەر زۆر وریا و زانا نەبێت.

* قال الله تعالى: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾﴾[1].

زمان بەملا و بەولادا مەچەرخێنن و مەڵێن ئەمە حەرامە و ئەوە حەلاڵە – بەبێ بەڵگەو لە خۆتانەوە – و بەم کارەتان بوهتان بە دەم خواوە بکەن، و ئاگاداربن و بترسن لە فرێدانی فەتوا بە لای چەپ و ڕاستدا چونکە ئەو کەسانەی بە ناوی خواوە شت هەڵدەبەستن تیاچووی ڕۆژی حەشرن و ڕزگاربوونیان بۆ نییە، بەڵێ لە دنیا کەمێ سوودی مادی دەبینن لەو فەتوایەو لە لای کاربەدەستان شتێکتان دەست دەکەوێت چونکە شتیان بۆ حەلاڵ دەکەن و ستەمەکانیان بە ڕەوا دادەنێن و ئیتر ئەوەیان لەبیر چۆتەوە کە سزای سەخت لە پێشوازیاندایە.

ئای لەو کەسانەی کە ئەمڕۆ شتێك حەرام دەکەن و شەڕی لەسەر دەکەن و خۆیان سوور دەکەنەوە و دژایەتی تا سەر ئێسقانی ئەو کەسانەیش دەکەن کە مەسەلەکە بە

---

[1] سورة النحل، (الآية: ١١٦–١١٧).

خیلافی دەگرن‌و دەڵێن: لای کۆمەڵێ لە زانایان دروستە، بەڵام پاش ماوەیەك مەسەلەکە پێچەوانە دەبێتەوە و تا سەر ئێسقان حەلاڵی دەکات و بە خەستی لوتی تێ دەنێ!!.

* قال الله تعالى: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَـٰلِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾.[1]

واتە: خوای — تەعالا — دەفەرموێت: ((یەکێ لە کارە باوەکانی سەردەمی نەفامی ئەوە بوو کە ئەگەر بیانویستایە شەڕ لەگەڵ هۆزێکدا بکەن لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا دەچوون بۆ شەڕەکە و دەیان وت ئەم مانگە دوا دەخەین بۆ مانگێکی تر و بەو شێوەیە حەلاڵیان دەکرد جەنگ تیایدا، بەو کارەیان ساڵێك حەلاڵیان دەکرد و ساڵێك حەرامیان دەکرد بۆ ئەوەی دەستکاری مانگە قەدەغەکراوەکان بکەن و ئەوەی خوا حەرامی کردووە ئەوان حەلاڵیان کردبوو، پەنا بە خوا ئەو کارەیشیان بە جوان و چاك دەزانی و خوایش ڕێنموونی بێباوەڕان ناکات.

کاتێ لە مەسەلەیەکی فەتوا و حەرام و حەلاڵدا پرسیارت لێ دەکرێت.. خێرا فەتوا مەدە و مەسەلەکە مەخە بە لایەکدا، بەڵکو صاڵحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) هەر تێك چوون و ڕەنگیان برسکاوە چونکە دەیانزانی ئەو کارە وەك دەڵێن دەبێتە وتەبێژی خوا، محمدی کوڕی سیرین خەوپەرژێنکەرەکەی ئیسلام بەم جۆرە بووە:

* قال الأشعث: كان محمد بن سيرين (رحمه الله) اذا سئل عن شيء من الفقه، الحلال والحرام تغير لونه وتبدل حتى كانه ليس بالذي كان.[2]

واتە: ئەشعەس دەڵێ: محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەر کاتێ دەربارەی مەسەلەیەکی فیقهی لە حەلاڵ و حەرام پرسیاری لێ بکردایە ڕەنگی تێك

---

١ سورة التوبة، (الآية: ٣٧).

٢ صفة الصفوة (١١٧/٢).

دەچوو دەگۆڕا و هەڵدەبریسکا و بە جۆرێکی وای لیّ دەهات لەو کەسەی پێشوو نەدەچوو.

پاك و بێگەردی بۆ خوا، زانا بەرز و مەزنەکان بۆ ئەوەی لە فەتوادان خۆیان بپارێزن زۆرجار خۆیانیان شکاندۆتەوەو بە وشەی نازانم! یان: لەو مەسەلەیەدا شارەزاییم نییە! یان بڕۆن لە فلاّن زانا بپرسن ئەو لە من شارەزاترە! یان: (انشاء الله) لەم بارەیەوە پرسیارتان بۆ دەکەمو قاسمی کوڕی محمد (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّت) کوڕەزا زاناکەی ئەبو بەکری صدیق (خوا لیّی ڕازی بیّت) بزانین چی دەڵیّ؟.

* عن ايوب قال: سمعت قاسم بن محمد — رحمه الله — يسأل بمنى فيقول: لا أدري، لا أعلم، فلما اكثروا عليه، فقال: والله لا نعلم كل ما تسألونا عنه ولو علمنا ما كتمناكم وهل حل بنا أن نكتمكم؟.[1]

واتە: ئەیوب دەڵیّ: خۆم گوێم لە قاسمی کوڕی محمد بوو کە لە مینا بوو لە کاتی حەجدا خەڵکی چواردەورەیان لیّ گرتبوو هەر کەسە و بۆ خۆی پرسیاری شەرعیان لیّ دەکرد و ئەویش هەر دەیفەرموو: نازانم، شارەزاییم لیّی نییە! بەلاّم ئەوەبوو خەڵکەکە زۆریان بۆ هێنا و پرسیار بارانیان کرد ئەویش لە تاودا فەرمووی: وەڵلاّهی ئێمە وەلاّمی هەموو پرسیارێکتان نازانین، خۆ بیزانین لێتان ناشارینەوە بۆچی حەلاڵو دروستە بۆمان لێتانی بشارینەوە؟!.

خەڵکانێك هەن حەز دەکەن پرسیاریان لیّ بکەیتو خۆیان بە وەلاّمەکەیەوە هەڵدەنێن و خۆیانی پیّ دەبەنە پێشەوە، بەو کارە کەیف خۆش و مەسرور دەبن! بەلاّم ئەوانە لە ترسناکی فەتوادان حاڵی نەبوون ئەگینا وەك قاسمی کوڕی محمد دەبوون کە دەبوایە ڕەنگیان تێك بچوایە و پێیان ناخۆش بوایە:

* عن أبي الزناد قال: ما كان قاسم بن محمد يجيب الاّ في الشيء الظاهر.[2]

واتە: ئەبی زەناد دەڵیّ: مامۆستا قاسمی کوڕی محمد وەلاّمی هیچ پرسیارێکی نەدەدایەوە مەگەر وەلاّمەکەی زۆر ئاشکرا بوایە.

---

١ صفة الصفوة (٢/٦٤).

٢ صفة الصفوة (٢/٦٤).

هەرگیز حەز لە فەتوادان نەکەیت هەر بەوەی دوو سێ کتێب و ناميلکەی ئيسلامی بخوێنيتەوە يان هەر بەوەی کە ماوەيەك بەشداری دەرسێکی گشتی زانايەکت کردووە، يان هەر بەوەی کە دەرچووی زانکۆيەکی ئيسلامی يان پەيمانگەيەکی ئاينيت!!

فەتوادان زانستێکی قوڵ و خوێدنەوەيەکی بەردەوامی قورئان و فەرمووده و کتێبە فيقهيەکانی دەوێ سەيری زانای خاوەن مەزهەبی – ماليکی – ئيمام ماليکی کوڕی ئەنەس بکە، کە چۆن نەيوێراوە فەتوا بدات تا (٧٠) لە زانايانی ئەو سەردەمە ڕوخسەتی فەتوايان داوە:

* عن ابي مصعب قال: سمعت مالكاً قال: ما افتيت حتى شهد لي سبعون اني اهل لذلك.[١]

واتە: ئەبو موسعەب دەڵێ: گوێم لێ بوو ماليك دەيووت: نزيکی فەتوادان نەکەوتمەوە تا (٧٠) زانای ئيسلام شايەتيان بۆ دام کە من شايانی ئەو کارەم ئەوجا فەتوام دا.

هەر ئەم زانا پايە بەرزەی ئيسلام کە خاوەنی (موطأ)ە و مامۆستای ئيمامی شافعييە، کەچی ئامادە نەبووە وەڵامی يەك پرسيارى شەرعی بداتەوە تا لە چەندان زانای ئەو سەردەمەی پرسيار نەکردبێت و پێی نەوتبێت کە ئايا من شايانی ئەو کارەم؟!:

* عن ابي مصعب ايضاً ان مالكاً قال: (ما اجبت في الفتيا حتى سألت من هو اعلم منّي: هل يراني موضعاً لذلك؟ سألت ربيعة، سألت يحيى بن سعد فأمراني بذلك، فقلت يا ابا عبدالله فلو انهوك؟ قال: كنت انتهي لا ينبغي للرجل ان يرى أهلاً لشيء حتى يسأل من هو اعلم منه).[٢]

واتە: دووبارە ئەبو موسعەب دەڵێ: پێشەوا – ماليك – (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: وەڵامی پرسياری شەرعی کەسم نەداوەتەوە تا پرسيارم لەو کەسانەی لە خۆم زاناتربوون نەکردايە کە ئايا من شايانی ئەو مەقامەم؟ لە ڕەبيعە و لە يەحيای کوڕی

١ هەمان سەرچاوە (١/١٢٠).
٢ هەمان سەرچاوە (٢/١٢٠).

سەعیدم پرسی لەو بارەیەوە، ڕێگایان پێ بدەم کە فەتوا بدەم، دەڵی پێم وت: ئەی ئەگەر نەیانهێشتایە فەتوا بدەیت؟ دەفەرمووێت: منیش فەتوام نەدەدا، چونکە کەس نابێ خۆی بە شایانی مەقامێك بزانێت تا پرسیار لە کەسانی سەرووی خۆی نەکات لەو بارەیەوە.

هەر ئەم پێشەوا گەورە و مەزنەی ئیسلام لەگەڵ ئەو مەقام و پایە بەرزیەیدا کەچی زۆر ئاسایی بووە لە لای کە بە پرسیارکەرێکی وتبێت: لەو مەسەلەیەدا شارەزایی تەواوم نییە و با هەموو خەڵکیش پێم بزانن کە لەو مەسەلەیەدا شارەزا نیم:

* عن ابن المهدي قال: سأل رجل مالكاً عن مسألة، فقال: لا أحسنها!، فقال الرجل: انّي ضربت اليك كذا وكذا لاسألك عنها، فقال له مالك: فاذا رجعت الى مكانك وموضعك فأخبرهم اني قلت لا أحسنها.[1]

واتە: (ابن المهدی) دەڵێ: جارێکیان پیاوێك پرسیارێکی شەرعی لە پێشەوا مالیك دەکات، و پێشەوایش زۆر بە ئاسایی پێی فەرموو: لەو مەسەلەیەدا هیچی لێ نازانم یان باش نیم تیایدا!.

پیاوەکەش بە سەرسوڕمانەوە بە پێشەوای وت: مامۆستا گیان من لە فلان شوێنی دوورەوە کەوتوومەڕێ بۆ لای جەنابتان تەنها بۆ ئەو پرسیارە کەچی تۆ دەڵێی نایزانم!؟ پێشەوای مەزنیشمان ڕووی تێکرد و پێی فەرموو: ئەگەر گەڕایتەوە بۆ وڵات و شارەکەی خۆت پێیان بڵێ: کە من وتوومە لەو مەسەلەیەدا باش شارەزا نیم!.

براکانم ئەگەر زانا و لە ئیسلام شارەزایان وەڵامی هەموو پرسیارێك بدەنەوە و تەنها جارێك وشەی –نازانم– بەسەر زمانیاندا نەیەت لە وەڵامی هیچ پرسیارێك ئەوە خۆی دەکوژێ و تووشی دەردی کوشندە بووە:

* محمد بن صباح يقول: انبأ سفيان بن عيينة: (اذا ترك العالم لا أدري أصيبت مقاتله).[2]

---

١ صفة الصفوة (١٢١/٢).

٢ هەمان سەرچاوە (١٥٦/٢).

واتە: محمدی کوڕی صباح دەڵێ: زانای صالح و خواناس (سوفیانی کوڕی عویەینە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەواڵی داوە کە: هەر کاتێ زاناکان وازیان لە وشەی — نازانم— هێنا ئەوە تیریان ناوە بە دڵ و جەرگی خۆیانەوە.

ئەمڕۆ خەڵکانێك دروست بوون — پەنا بە خوا — حەزیان لە فەتوادانە و چێژی لێ وەردەگرن و چی لە فیکریاندا هەبێت هەر لەسەر ئەو بنەمایە وەڵامەکان دەدەنەوە ئیتر با دژی قورئان و سوننەتی صحیحیش بێت.. بەڵام (إبن عمر) ( خوای لێی ڕازی بێت) پرسیاری لێ کراوە خۆی لێ کەڕ کردووە وەك بڵێی نەیبیستووە!:

* عن نافع ان رجلاً سأل ابن عمر عن مسألة، فطأطأ رأسه ولم يجبه حتى ظنّ الناس انه لم يسمع مسألته، فقال له: يرحمك الله اما سمعت مسألتي؟ قال: بلى ولكنكم ترون ان الله تعالى ليس يسألنا عما تسألونا عنه؟ اتركنا رحمك الله حتى نتفهم في مسألتك، فان كان لها جواب عندنا والاّ اعلمناك انه لا علم لنا به.[١]

واتە: نافیع دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پیاوێك پرسیارێکی ئاڕاستەی عبدالله ی کوڕی عومەر کرد، عبدالله (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەری داخستبوو، بێ دەنگ بوو — خەڵکەکە وایان گومان برد کە گوێی لە پرسیارەکەی نەبووە — بۆیە پیاوەکە پێی وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەوە گوێت لە پرسیارەکەم نەبوو؟ (عبدالله) فەرمووی: بەڵێ — گوێم لێ بوو — بەڵام بۆ ئێوە وا دەزانن خوا لێپرسینەوەمان لەگەڵ ناکات لەسەر وەڵامی ئەو پرسیارانەتان؟ دەی لێم گەڕێ با لە پرسیارەکەت بکۆڵمەوە و تێبگەم لە وەڵامەکەی ڕەحمەتی خوات لێ بێت، ئەگەر وەڵامی هەبوو لە لامان ئەوە وەڵامت دەدەمەوە، ئەگەر نەشمان زانی ئەوە پێت دەڵێم کە وەڵامەکەی نازانم.

خوشك و براکانم دەخیلتان بم، نەکەین حوکمی بەهەشت و دۆزەخی خەڵکی دەربکەین و بڵێین فلان بە دوو چاو بەهەشت نابینێ!! یان فلان کەس بە ئاگری دۆزەخ ناسوتێ!! نا نەکەیت، ئەنجامی خەڵکی لە لای خوایە و بەس:

١ صفة الصفوة (١/٢٨٩).

* عن معتمر بن سليمان عن أبيه عن أبي عمران، عن جندب قال: (وطئ رجل على عنق رجلٍ وهو يصلي، فقال الرجل: والله لا يغفر الله لك هذا ابداً، فقال الله (عز وجل): من هذا الذي يتألى عليّ ان لا اغفر له، فقد اغفرت له واحبطت عملك).[1]

واتە: لە (جندب)ەوە (خوای لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: جارێکیان پیاوێك نوێژی دەکرد و پیاوێکی تر لە کاتی سوژدەدا پێی خستە سەر ملی و پێی وت: سوێند بە خوا هەرگیز خوا لێت خۆش نابێت! خوای گەورەیش فەرمووی: ((ئەمە کێیە سوێند بە من دەخوات کە لە فلان کەس خۆش نابم؟ دەی ئەوا لە ئەو خۆش بووم و هەموو کردەوە چاکەکانی تۆشم سوتاند و پوچەڵم کردەوە)).

زانا صالحەکان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ئەگەر وەڵامی مەسەلەیەکیان نەزانیبێت، زۆر بە ئاسانی دەیان وت: لەو بارەیەوە شارەزاییم نیە! بڕۆ بۆ لای فلان زانا و ئەم پرسیارە لەو بکە ئەو لە من زیرەکترە!! یان لەوەش زیاتر هەندێ جار دەیان وت: بڕۆ بۆ لای کوڕەکەم یان کچەکەم یان قوتابیەکەم وەڵامی دروست لە لای ئەوانە!!

(یا سبحان الله) چ وانەیەکی خۆبەبچووك زانییە و محمدی کوڕی سیرین پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات لە کاتێکدا ئەو پیاوە یەکێکە لە زانا مەزنەکانی سەردەمی تابعین:

* عن هشام بن حسان ان ابن سيرين اذا اشكل عليه شيء من القراءة قال: اذهبوا فسئلوا حفصة كيف تقرأ – اي ابنته –).[2]

واتە: هیشامی کوڕی حەسان دەڵێ: هەر کاتێ محمدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە مەسەلەیەکی خوێندنی قورئان یان زانستیدا شتێکی لێ بگیرایە زۆر بە ئاسایی و بەبێ تێکچوون دەیفەرموو: بڕۆن بۆ لای حەفسەی کچم و لەو بارەیەوە پرسیاری لێ بکەن و بزانن چۆن دەیخوێنێتەوە. چونکە ئەو زۆر شارەزایە لەو بارەیەوە.

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/١٨٠).

٢ صفة الصفوة (٢/١٣٣).

زاناكان چونكە لەگەڵ عیلم و زانستەكانیاندا بۆ خوا صولْحاو و صالْح بوون هەر كاتیّ پرسیارێكی شەرعییان لیّ بكرایە بە ناو چاویانەوە نیشانەی پیّ ناخۆش بوون بەدی كراوەو حەزیان كردووە ئەو پرسیارە ئاڕاستەی برا زانایەكی تر بكرایە (ئیبراهیمی نەخەعی)یش نموونەیەكی جوانمان پیّشكەش دەكات:

* عن ابي الحصين قال: ((سألت إبراهيم النخعي عن شيء، فقال: ما وجدتَ أحداً تسأله فيما بيني وبينك غيري)).[1]

واتە: ئەبو حەسین دەڵیّ: دەربارەی مەسەلەیەك پرسیارم كرد لە (ئیبراهیم النخعی)و ئەویش لە وەڵامدا پیّی فەرمووم: باشە گیانەكەم — بەینی خۆم و خۆت بیّ — ئایا جگە لە من كەسیّكت نەدۆزیەوە ئەو پرسیارەی لیّ بكەیت؟!..

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٥٥).

# بەشی چوارەم

## چوار خۆشەویستەکەی صالْحان:

١- خۆشەویستی خوای ( عز وجل ):

٢- خۆشەویستی قورئانی کەریم:

٣- خۆشەویستی پێغەمبەری ئەکرەم ( ﷺ ):

٤- خۆشەویستی موسڵمانان:

# یەکەم

## صالحان خوایان زۆر خۆش دەوێت:

لەم گۆی زەویەدا هەموو کەسێك خۆشەویستێکی هەیەو هەمیشە لە خەیاڵیدایەو بیری ناچێتو هەموو شتێکی تر دەکاتە قوربانی، ئیتر هەیە دڵداریەکەی لەگەڵ کچێکدا بە زایە دەدات وا دەزانێت سەر زەوی کاول بووەو جگە لەو کچە کچی تری تیا نەماوە!! نازانێت لایەك لە کچانی سەر زەوی لەو کچە باشترو ژیرترو جوانترن کە ئەو کەوتۆتە داوی..

هەشە دڵداری لەگەڵ ماڵ جوانیدا دەکاتو هەموو ساڵێ شێوازی خانووەکەی، مۆدیلی سەیارەکەی، جلو بەرگەکەی خۆی دەگۆڕێتو هەموو سامانی دەخاتە ئەو پێناوەو هەر فریایش ناکەوێت!

هەشە پارە کۆکردنەوە بۆتە تەنها خۆشەویستیو دیناریێ گشت کەسیەتی (پەنا بە خوا)!!

هەشە ئارەزووپەرستی خۆش دەویێو هتد... کەواتە کەس نیە بڵێ من هیچم خۆش ناوێتو باوەڕم بە خۆشەویستی نیە.

بەڵام خۆشەویستیەکی گەورە هەیە کە زۆرێك لە مرۆڤەکان لێی بێ ئاگانو لەبەردەمی ئەو کێوەدا هەموو خۆشەویستیەکانی سەرەوە تێك دەشکێنو باویان نامێنێو صالحانیش زۆر ژیر بوون هەستاون خۆشەویستی خوای گەورەیان هەڵبژاردووەو ئیتر لەوودوا شەرمیان کردووە دڵداری لەگەڵ کچ یان لەگەڵ پارەو سامان یان لەگەڵ ماڵ جوانی یان هتد.... بکەن.

خۆشەویستی خوا یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی باوەڕی ڕاستەقینە، بە تایبەت لەسەردەمی جەفاوەتدا کە موسڵمانان خۆشەویستیان بۆ خوا نەماوە یان کەم بۆتەوە، بەڵام خوا وەعدی داوە ئەو کەسانە لادەباتو کۆمەڵە کەسانێکی تر دێنێتە کایەوە کە بەوپەڕی مانای خۆشەویستی خوایان خۆش دەوێت:

* قـال الله تعـالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ﴾.[1]

واتە: ئەی كۆمەڵی باوەڕداران هەر كەسێ لە ئێوە لە ئاینەكەی كە ئیسلامە پاشگەز ببێتەوە خوا بێ منەت دەبێت لێتانو لە باتی ئەوانەدا كۆمەڵێ موسڵمانی دڵسۆزو غەمخوار دەهێنێ كە زۆری خۆش دەوێتو ئەوانیش خوایان زۆر خۆش دەوێت... لە ئاستی برا موسڵمانەكانیاندا سەركزنو لە ئاستی كافراندا توندڕەونو لە ڕێگای خوادا جیهاد دەكەنو گوێ بە لۆمەی لۆمەكاران نادەن.

هەرچەندە خەڵكانی دوور لە خوا شتی تریان خۆش بوێ جگە لە خوا بەلام هەرگیز ناگەنە تۆزی كێوی خۆشەویستی باوەڕداران بۆ خوای خۆیان.. بەلام ئەمڕۆ پەنا بە خوا –موسڵمانان هاوكێشەكەیان پێچەوانە كردۆتەوە– خۆشەویستی ئێمە بۆ خوای پەروەردگارمان ئەوەندە كەمە ناگاتە یەك لە دەی خۆشەویستی كوڕێك بۆ كچێك یان خۆشەویستی چروكێك بۆ پارەو سامان یان حیزبیەك بۆ لایەنەكەی!:

* قـال الله تعـالى: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِ ........ ﴾.[2]

واتە: لە ناو خەڵكیدا كەسانی وا هەیە كە شتێكی تری هێناوە لە باتی خوا داینـاوە لـە دڵیـداو خۆشیـشی دەوێـت وەك خۆشەویـستی بەنـدە بـۆ خـوای گـەورە، بـەلام باوەڕداران زۆر لەوان زیاتر خوای خۆیانیان خۆش دەوێـت، دەی خوایـە بمانگێڕە بـەو ئیمانداراندەی خۆت.

ئەمە پێغەمبەرە سەروەرەكەمانە (ﷺ) پێشەوای هەموو صاڵحانی دونیا بوار بە هاوەڵان نادات قسە بەو هاوەڵە بەڕێزە بڵێن كە تاوانێكی لە دەست دەرچووبوو لەبەر

---

١ المائدة: ٥٤

٢ البقرة: ١٦٥

تەنها ڕەوشتێکی مەزن کە لە هەر کەسدا بێتەدی شایانی هەموو مەدحێکی چاکەیە خۆزگە چ ڕەوشتێك بێت؟:

* حديث عن النعمان (رضي الله عنه) انه كان يؤتى بە رسول الله (ﷺ) فيحده الى ان اتى به يوماً فلعنه رجل وقال: ما اكثر مايؤتى به لعنه الله!! فقال رسول الله (ﷺ) لا تلعنه فانه يحب الله ورسوله).[1]

واتە: (نوعمان) (خوا لێی ڕازی بێت) هاوەڵێکی پێغەمبەری ئازیزمان بوو (ﷺ) بەڵام بە داخەوە لە ژێرەوە ئارەقی – مەی – دەخواردەوەو چەند جارێك هێنایانە بەردەستی پێغەمبەرو ئەویش سزای داری حەدی سەرخۆشانی لێ دەدا.. تا ئەوەبوو یەکێك لە هاوەڵان ئەوەندە بێزار دەبێت لە ڕەوشتی ئەو هاوەڵە لە حزوری پێغەمبەردا (ﷺ) دەڵێت: چەند زۆر دەیهێنن بۆ دارکاری کردن نەفرەتی خوای لێ بێت! پێغەمبەری بەسۆز پێی ناخۆشە قسە بە هاوەڵان بڵێن تەنانەت تاوانبارەکانیش‌و بۆیە فەرمووی بەو پیاوە: هەرگیز نەفرەتی لێ نەکەیت چونکە ئەو (نوعمانە) خواو پێغەمبەرەکەی زۆر خۆش دەوێت.

خۆشویستنی پەروەردگار تامو چێژێکی نادیارەو لە ناو دڵدایە بەڵام ئایا نیشانەیەکی هەیە کە مرۆڤ بۆی دەربکەوێت کە خۆشەویستیەکەی بۆ خوا تەواوەو وەرگیراوە، ئەمەش پیاوصاڵحە مەزنەکەی شاری بەسرە– پێشەوا حەسەن (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

* قال الحسن البصري (رحمه الله) قال أصحاب رسول الله (ﷺ) يا رسول الله انا نحب ربنا حباً شديداً، فاحب الله ان يجعل لحبه علماً؟ فانزل الله هذه الآية ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾.[2]

واتە: پێشەوا حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پێغەمبەریان وت: ئێمە خوای خۆمانمان زۆر زۆر خۆش

---

١ البحر الرائق (لا: ٢٥٠)، رواه البخاري (٧٥/١٢).

٢ ال عمران: ٣١

دەویت.. خـوای گـەورەیش ویـستی نیـشانەیەك دانێـت بـۆ ڕاسـتیو دروسـتی ئـەو خۆشەویستیە؟ خوای (عز وجل)یش ئەم ئایەتەی نـاردە خـوارەوەو فـەرمووی: ((ئـەی محمد پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەنو خواتان خۆش دەوێت شـوێن مـن بکـەون خوایش ئێوەی خۆش دەوێت)).

گەورەترین بەڵگەی خۆشەویستی خوای گەورە ئەوەیـە کـە خـوا چـی پـێ ناخۆشـە ئێمەش پێمان ناخۆش بێتو چیشی پێ خۆشە ئێمەش پێمان خـۆش بێـت، و ئەمـەش قسەی پێشەوایەکی صاڵحی ئەم ئوممەتە چاکەیە کە ناوی (بیـشری کـوڕی سـەری)یـە بزانین چی دەفەرمووێت؟

* قال بـشر بـن الـسري (رحمـه الله): ((لـيس مـن أعـلام الحـب ان تحـب مـا يـبغض حبيبك)).[1]

واتە: بیشری کوڕی سەری (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرمووێت: لـە نیـشانەی خۆشەویستی خوا نیە، کە ئەوەی خۆشەویستەکەت پێی ناخۆشە تۆ پێت خۆش بێت.

صاڵحان لە کاتی سەرەمەرگیشدا شـێتو شـەیدای پـەروەردگاریان بـوونو ئـەوەش زەکەریایە بزانین لە کاتی سەرەمەرگدا چی دەڵێت:

* لما إحتضر زكريا بن عدي – رحمه الله – رفع يديه وقال: اللهم انّي إليك لمشتاق.[2]

واتـە: پیاوچـاك (زەکـەریانی کـوڕی عـەدی)، (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) لـە کـاتی گیانەڵڵاو سەرەمەرگیدا دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ لای خواو فەرمووی: ((ئەی خـوای پەروەردگار من زۆر زۆر تامەزرۆو شەیدای دیدارتم.

کچێك وانەی خۆشەویستی پـەروەردگاری بـە بـاوکی زانـاو خواناسـی دەوتـەوە..و فێری کرد کە چۆن جگە لە خوای (عـز وجـل) کەسـی تـری خـۆش نـەوێتو ئـەو باوکـە صاڵحەیش چەند جوانو بەسنگی فراوانەوە لێی وەردەگرێت:

---

١ صفة الصفوة.

٢ جامع العلوم والحكم (لا: ١٨٠).

قال ابو عثمان الحناط قال: قال السري: سمعت فضيلاً يقول عن ابنةٍ له توجعت كفها فعادها، فقال لها: يا بني كيف كفك هذا؟ فقالت لـه: يـاأبتي ان الله قد بسط لـي ثوابها مالا أؤدي شكره عليها ابداً، فتعجبت من حسن يقينها.

وقال الفضيل: فانا عندها قاعد اذ اتاني ابن لـي ثلاث سنين فقبلته وضممته الى صدري، فقالت لي: يا أبت سألتك بالله أتحبه؟ فقلت: اي بني والله اني لأحبه، فقالت لي: سوأة لك من الله أبتي اني ظننت انك لا تحب مع الله غير الله، فقلت لها: أي بنية اولا تحبون الأولاد؟ فقالت: المحبة للخالق والرحمة للأولاد. قال: فلطم الفضيل راسه وقال: يارب هذه ابنتي هجتني في حبها وحب أخيها وعزتك لا احببت معك احداً حتى القاك).[١]

واتە: سەری سەقەطی دەڵێت: گوێم لێ بوو (فوزەیلی کوڕی عەیان)، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: کچێکم باڵ ئێشەیەکی گرتو منیش چووم بۆ سەردانیو پێم وت: کچی شیرینم باڵەکەت چۆنە؟ و کچەکەش وتی: باوکەگیان خوای گەورە ئەوەندە پاداشتی زۆری بۆ ئامادە کردووم لەسەری کە هەرگیز لە ژێر شوکرو سوپاسی دەرناچم، دەڵێ: سەرسام بووم لەو باوەڕە پڕ لە دڵنیاییەی.

فضیل دەڵێ: لەو کاتەدا لە لای دانیشتبووم کوڕێکم هات بۆ لام کە تەمەنی (٣) ساڵان بوو، و منیش تێر ماچم کردو گوشاردم بە سنگمەوە، و کچەکەم پێی وتم: پرسیارێکت لێ دەکەم توخوا ئەو منداڵەتت خۆش دەوێت؟ وتم: بەڵێ کچی خۆم سوێند بە خوا خۆشم دەوێ، ئەویش پێی وتم: چەند خراپی لەگەڵ خوادا باوکەگیان چونکە من وام دەزانی لەگەڵ خوادا هیچ شتێکی ترت خۆش ناوێت.

منیش پێم وت: ئەی کچی خۆم ئەی ئێوە منداڵی خۆتانتان خۆش ناوێت؟ ئەویش وتی: خۆشەویستی شایستەی خوای پەروەردگارەو ڕەحمو سۆزیش بۆ ماڵو منداڵە.

دەڵێ: فضیل بە هەردوو دەستی دای بەسەری خۆیداو هاواری کرد: ئەی پەروەردگارم کچەکەم لەسەر خۆشەویستی خۆیو براکەی ڕەخنەو توانجی لێ گرتم دەی سوێند بە عیزەتت تا مردن لەگەڵ خۆشەویستی تۆدا هیچ شتێکی ترم خۆش ناوێت.

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢/٢١٦).

کاتێ شەو داهات چوو بۆ ناو چادرەکەی– بۆ لای خێزانی نوێی–، بەڵام ئەبو ئەیوب بەدزی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەو شەوە تا بەیانی بە شمشێرەکەیەوە لە بەر دەم چادرەکەدا دەهات و دەچوو جارجار گوێشی دەنا بەچادرەکەوە،

کاتێ لە بەیانیدا پێغەمبەری خوا بە خەبەر هات گوێی لە دەنگی پێی کەسێك بوو بۆیە فەرمووی: کێ یە؟ ئەبو ئەیوب ووتی:منم ئەبو ئەیوب، پێغەمبەر فەرمووی ئەی تۆ لەوێدا چی دەکەیت؟ ئەبو ئەیوب ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا خەمی تۆم بوو چونکە ئەم کچە تازە بوکە و ئێ پاشان تۆ باوکی و مێردەکەیت بەو دەردە برد لە بەر ئەوە من لە نیاز خراپی ئەو ژنە دڵنیا نەبووم، ووتم: بەس گوێم لە جوڵەیەك بێت لەو ژنەوە دەربچێت ئەزانم چی لێ دەکەم!، پێغەمبەری خوا دووجار فەرمووی–ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەبو ئەیوب– ڕحمەتی خوات لێ بێت– ئەی ئەبو ئەیوب.

لەوانەیە کەسێك هێشتا نایەوێت بچێتە ناو کاروانی صالحانەوە بەگومانەوە بپرسێتو بڵێت دەی ئەوانە صەحابە بوون و کێ دەتوانێ بگاتە ئەوان؟ دەی خۆ ئەم خوشکەی کە سەردانی عائیشە دەکات لە هاوەڵان نی یە و چەندان ساڵ لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان هاتووە بۆ ماڵی عائیشە و بزانین چۆن پێغەمبەری خوای خۆش ویستووە.

* عن عبدالله بن مبارك– رحمه الله– ان امراة قالت لعائشه– رضى الله عنهما–: إكتشفي لي قبر رسول الله فكشفت لها عنه، فبكيت حتى ماتت).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی موبارەك– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دەفەرموێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت دایکی باوەڕداران عائیشەی کچی ئەبو بەکری صدیق– خوای لێ ڕازی بێ– و پێی ووت: دایە گیان گۆڕەکەی پێغەمبەری خوام پێ نیشان بدە؟ عائیشەیش– خوای لێ ڕازی بێ– بردیە سەر گۆڕەکەی و ئەویش ئەوەندە گریا بۆی تا گیانی دەرچوو.

هەر کەسێ بەنیازە پێغەمبەری خوای (ﷺ) خۆش بوێت.. تازە پێغەمبەری خوا لە دنیا دەرچووە و خوای گەورەیش نەیکردین بە هاوڕێی ئەو نێردراوە مەزنە، دەی

---

١ صفة الصفوة (٢/ ١٣٧)

کەواتە چۆن چۆنی ئەمڕۆ خۆشمان بووێ؟ بۆ وەلاٌمی ئەم پرسیارە دەتوانین سود لە گەورە پیاو صاڵحی سەردەمی تابعین وەربگرین کە ناوی- سەعیدی کوڕی موسەییب- ە و فێرمان دەکات کە ڕێز لە ووتەو فەرمودە جوانەکانی بگرین و جێبەجێیان بکەین ئەوە مانای خۆشەویستی محمدە (ﷺ):

* عن مالك ان رجلا جاء الى سعيد بن مسيب وهو مريض فسأله عن حديث وهو مضطجعٌ، فجلس يحدثه، فقال الرجل: ودد انك لم تتعنَّ، فقال: انى كرهت ان أحدثك عن رسول الله وانا مضطجعٌ).[1]

واتە: مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کابرایەك هاتە خزمەت زانای گەورە و ناوداری تابعین- سعیدی کوڕی مسەییب- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- بۆ پرسیارێك دەربارەی فەرمودەیەکی پێغەمبەر و لەو کاتەدا سەعید زۆر نەخۆش دەبێت و ڕاکشا بوو لە جێگەدا، و هەر کە پرسیارەکەی گوێ لێ بوو خێرا و بەپەلە هەستایە سەر پێ و بەدانیشتنەوە وەلاٌمەکەی دایەوە، پیاوەکەش پێی ناخۆش بوو کە عەزیەتی زانای پایە بەرزی دا و پێی ووت: مەبەستم ئەوە نەبوو کە نارەحەتت بکەم، سەعیدیش فەرمووی: خۆم پێم ناخۆشە کە فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) باس بکەم بەڕاکشانەوە.

وەرن یاران ئەگەر ڕاستەکەین تامەزرۆی کاروانی صاڵحانین با هەرکاتێ ناوی بەرزی پێغەمبەر دەبرێت- بلێین- صلى الله عليه وسلم- و هەیبەتێکی گەورەی هەبێت لە دڵکانماندا و پێمان ناخۆش بێت کە ناحەزانی سوکایەتی پێ بلێین.

بەرائی کوڕی عازیب -خوای لێ ڕازی بێ- یەکێکە لە هاوەڵە دڵسۆزەکانی پێغەمبەرمان و بزانین چۆن پرۆگرامی ڕێز گرتن و هەیبەت نواندن مان فێر دەکات بەرامبەر ئەو خۆشەویستە:

اخرج أبو يعلى وصححه عن البراء بن عازب- رضى الله عنه- قال: لقد كنت أريد ان أسأل رسول الله الأمر فأؤخر سنتين من هيبته).[2]

---

١ صفة الصفوة اخرجه البخاري و مسلم في صحيحهما.

٢ حياة الصحابه (٢/ ١٤).

واتە: بەرائی کوڕی عازیب– خوای لێ ڕازی بێ– دەفەرموێت: چەند جار ویستوومە پرسیارێك لە پێغەمبەری خوا بکەم بەلام لە بەر هەیبەتی پێغەمبەری خوا–لەدلمدا– پرسیارەکەم نەکردوە و بۆماوەی دوو سال دوام خستووە.

براکانم ئەگەر دەتانەوێت پێغەمبەری خواتان خۆش بوێت، زۆر دوورە بگەنە ئەو عەشقە کەمادەم دلتان لەلای ئەونی یە و لە ژیاندا بە ئەو دلتان نەکرێتەوە و مردنیشتان خۆش نەوێت چونکە مردن لە ئەوتان نزیك دەکاتەوە و پیاوە صالحەکەی ناو هاوەلان –بیلالی حەبەشی– خوای لێ ڕازی بێ لە سەرە مەرگیشدا هەر محمد ی خۆش دەوێت و وانەی خۆشەویستی و عەشقی ئەو زاتە فێری خێزانەکەی و موسلمانان دەکات:

* لما حضر بلال–الحبشي–رضي الله عنه– الوفاة، قالت إمراته: واحزناه! قال– بلال: بل واطرباه غداً ألقي الاحبة محمداً وحزبه).[١]

واتە: کاتێ هاوەلی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیلالی حەبەشی– خوای لێ ڕازی بێ– گەیشتە سەرەمەرگ و گیانەللاو کەمێ لەهۆش خۆی چوو، لەوکاتە خێزانەکەی وای زانی لەدونیا دەرچووە بۆیە بەهەموو دەنگی هاواری کرد: ئای کە جێگای خەفەتە!! بیلال گوێی لێ بوو چاوی کردەوە و فەرمووی پێی: نەخێر جێگای خەفەت نی یە بەلکو ئای کە خۆشە! چونکە سبەینێ دەگەمە خۆشەویستان.. محمد و هاوەلانی.

١ البحر الرائق (لا: ١٧٢).

# چوارەم

## صالحان موسلمانانیان خۆش دەوێت

خۆشویستنی باوەڕداران یەکێکە لە فەرمانە بنەڕەتیەکانی ئیسلام و خوای گەورە پێی خۆشە ئەم کۆمەڵە ڕەوشت بەرزەی ناوی موسڵمانیان لێ نراوە یەکتریان زۆر خۆش بووێت و ڕێز لە یەکتری بگرن و دڵی یەکتری ڕاگیرکەن و بەشداری خۆشی یە کانی خۆیانیان بکەن وەك لە قورئاندا هاتووە:

* قال الله تعالى في كتابه العزيز: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾.[1]

واتە: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا موسڵمانان لەیەکتر نزیك دەکاتەوە دەیانکاتە برای یەکتری و پێشیان دەفەرموێت ئاگاتان لەو برایەتیە بێت و بەباشی بیهێڵنەوە و ئەگەر وانەکەن بەتەمای ڕەحم و بەزەیی خوا نەبن.

باوەڕداران زۆر غەریبن لەسەر زەویدا و کەس خۆشی ناوێن و دۆستیان زۆر کەمە چونکە فەرمان بەچاکە و بەرگری لە خراپە- لەلای پێڕی دنیا ویست و ئیمان لاواز- زەڕەی تاڵ کردوون و چارەیانیان ناوێت و حەزناکەن بەشداری ئاهەنگ و شەوە سورەکانیان بن چونکە ئەو حەرامستانەیان لێ تێك ئەدەن ڕێگای تێکەڵی ژن و پیاو و مەی خواردنەوە و ڕەشبەڵەك و سەمایان لێ دەگرن..

بۆیە زۆر پێویستە لەسەر کۆمەڵی بڕوادار کە یەکتریان زۆر خۆش بوێت و پشت و پەنای یەکتری بن وەك خوای(عزوجل) لە قورئانەکەیدا بڕیاری داوە:

* قال الله -سبحانه وتعالى: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾.[2]

---

١ الحجرات، ئایەتی (١٠)

٢ التوبة (٧١).

واتە: دەستەی باوەڕ بە ژن و پیاویانەوە هەندێکیان دۆست و لایەنگرن و پاڵپشتی هەندێکی تریانن و پشتی یەکتر بەرنادەن و یەکتر هاندەدەن لەسەر چاکەکردن و ڕێگری یەکتری دەبن لەخراپە کردن.

هەتا بۆمان دەکرێت دەبێت دڵی خوشك و برا موسڵمانەکانمان خۆش بکەین و هیوایان تیا دروست بکەین، سەیری پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بکە که چۆن خوای گەورە سەرزەنشتی دەکات، بزانین لە سەرچی؟

* عن ابي هريرة (رضى الله عنه) قال: ان النبي (ﷺ) خرج على رهط من اصحابه وهم يتحدثون فقال: (والذى نفسى بيده لو تعلمون ما أُعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً)

فلما ان انصرفنا اوحى الله اليه محمد لِمَ تقنط عبادي؟ فرجع إليهم فقال: ابشروا وقاربوا وسددوا).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە- خوای لێ ڕازی بێ- دەفەرموێ: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ناو کۆمەڵێ لە هاوڕێکانی کە لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد پێی فەرموون: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە زۆر کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان!)

پاش ئەوەی بڵاوەمان لێکرد خوای عزوجل وەحی نارد بۆی و پێی فەرموو: ئەی محمد! بۆچی بەندەکانم بێ هیواو مایوس دەکەی؟ و پێغەمبەریش خێرا گەڕایەوە بۆ لایان و فەرمووی: موژدەتان لێ بێ- پاداشتی گەورەی خوا چاوەڕوانتان دەکات و ئێوەش بەکردەوەی جوان و ڕاست و دروست خۆتان لە خوا نزیك بکەنەوە.

صاڵحان زۆر لەوە دەترسن کە دڵی تەنهاموسڵمانێکیان لێ بڕەنجێت و هەوڵی خێرا دەدەن بۆ ئاشت کردنەوەی‌و خۆشکردنەوەی دڵی بریندار کراوی، پێغەمبەرەکەت بەم جۆرەی کرد لەگەڵ یەکێ لە هاوەڵانیدا؟ :

* عن انس بن مالك -رضى الله عنه- قال: ( قال رجل للنبي (ﷺ) أين أبـي؟ قال: في النار، فلما رأى في وجهه قال: ان ابي واباك في النار).[2]

---

١ الحديث اخرجه البخاري فى الادب المفرد (٧٤، رقم ٢٥٤) وابن حبان في صحيحه (٢٤٩١).

٢ اخرجه مسلم.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالك- خوای لێ ڕازی بێ- دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پیاوێك پرسی لە پێغەمبەر ئایا باوکم مردووە ئاکامی کوێ یە لە دواڕۆژ؟ پێغەمبەر لەوەلآمدا فەرمووی: ئەوەتا لەنێو ئاگردا، کاتێ هەستی کرد کابرا پێی ناخۆش بوو فەرمووی: باوکی منیش و تۆیش لەناو ئاگر دایە.

صالّحان بەبینینی برا موسلّمانەکانیان دلّیان دەگەشێتەوە و خۆشحالّ دەبن، و ئەمەش پیاو صالّحی ئیسلام- ئەیوب سەختیانی یە بزانین بۆچی حەزی لەحەج کردن بووە هەموو سالّێك؟!:

* عن ایوب السختیاني (رحمه الله) قال: (انه یزیدني فی حب الموسم ومضورة ان القی اخواناً لي لا ألقاهم فی غیره).[1]

واتە: یەکێ لە پێشەوایانی صالّحان-ئەیوبی سەختیانی- ڕەحمەتی خوای لێ بێ. دەفەرموێت: (ئەوەی زیاتر حەج و سەردانی مالّی خوای لەلا خۆشەویست کردووم ئەوەیە کە لەوێ کۆمەلّێ لە برا موسلّمانەکانم دەبینم کە جگە لەوێ لە هیچ جێگایەکی تردا نایان بینمەوە.

هەر ئەم پێشەوا بەڕێزە دووبارە فێری خۆشویستنی باوەڕدارانمان دەکات، بەلآم ئەم جارەیان بەشێوازێکی زۆر کاریگەر تر، با بزانین چۆن شێوازێکە:

قال ایوب السختیاني- رحمه الله- ( انه لیبلغني موت رجل من اهل السنة فکأنما یسقط عضو من اعضائي).[2]

واتە: مامۆستا ئەیوبی سەختیانی دەفەرموێت: ( کاتێ هەوالّی مردنی کەسێك لە ئەهلی سوننەم پێدەگات وا ئەزانم یەکێ لە ئەندامەکانی لەشم لێ بۆتەوە).

صالّحانی ئەم ئومەتە مەزنەی ئیسلام ئەوەندە خۆشەویستی موسلّمانان لەدلّیاندا جێگیر بوو بوو تەنانەت ئەگەر موسلّمانێکیش هەلّەیەکی بەرامبەر کردبن دلّیان نەهاتووە دوعای شەڕی لێ بکەن ئەم وانەیەش لە ئەسپەکەی پیاو صالّحی مەزن (ربیع)ی( خیثم)ە وە وەری دەگرین:

---

١ عمر بن عبدالعزیز، للصلابي.

٢ صفة الصفوة (٢/ ١٩٩).

* عن احمد بن عبدالله بن المسروق قال: كان ربيع بن خيثم- رحمه الله- انه سرق له فرس أعطا به عشرين الفاً، قالوا له: ادعُ الله عليه؟ فقال: اللهم ان كان غنياً فاغفر له وان كان فقيراً فاغنه).[1]

واتە: احمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی مەسروق دەگێڕێتەوە و دەڵێ:- ڕەبیعی کوڕی خەیسەم - ڕەحمەتی خوای لێ بێ- ئەسپێکی هەبوو کە (٢٠) هەزار درهەمی پێدا بوو لێیان دزی، و هاوڕێکانی پێیان ووت: دووعایەك بکە لە دزەکە؟ ئەویش دەستی بەرز کردەوە بۆلای خواو فەرمووی: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەم دزە دەوڵەمەندە ئەوا لێی خۆش ببە و ئەگەر هەژاریشە دەوڵەمەندی بکەیت- تا چیتر پەنا نەباتە بەر دزی.

ئەی ڕێبوارانی کاروانی صالّحان وەرن با سەرێك لە گەورە زانای تابعین خەو پەرژین کەری ئیسلام (ابن سیرین) بدەین بزانین چەندێ موسڵمانی خۆش دەوێ؟ بە ئەندازەیەك نایەوێت خانویشی پێبدات بەکرێ!

ئەمە چۆن بووە؟

* عن ابن عون قال: لابن سيرين-رحمه الله-منازل لايكريها الاّ من أهل الذمة، فقيل له في ذلك، فقال: اذا جاء رأس الشهر روعته وانا اكره ان اروع مسلماً).[2]

واتە: ابن عون دەڵێ: محمدی کوڕی سیرین- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- هەندێ خانووی هەبوو دەیدان بەکرێ، بەڵام هیچ کامیانی بە موسڵمان نەدەدا بە کرێ، و هاوڕێ و قوتابیانی لەو بارەیەوە لێیان پرسی، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: چونکە هەر کاتێ سەری مانگ بێتە پێشەوە دڵی کرێ چی دادەکەوێت و منیش پێم ناخۆشە دڵی موسڵمان دابخەم) .

صالّحان شانازیان کردوە بەوەی کە موسڵمانانیان خۆش دەوێت و بە کردەوەیەکی گەورەی خۆیانیان سەیر کردوە و بەتەما بوون خوا لەبەر ئەو چاکەیە لێیان خۆش ببێت و ووتەی ( ابن سماك) باشترین دەرمانە بۆمان:

---

١ صفة الصفوة (٢/ ٣٨).

٢ صفة الصفوة (٣/ ١٣٦)

* قال ابو جعفر الربعي: لما حضرت ابن سماك الوفاة قال: اللهم انيّ وان كنت أعصيك لقد كنت احب فيك من يطيعك).[١]

واتە: ئەبو جعفر الربعي دەڵێ: لەکاتی سەرە مەرگدا (ابن سماك) ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ووتی: ئەی پەروەردگارم من هەرچەندە سەرپێچیم کرد بێت لەژیانمدا بەڵام ئەوەندەم هەیە کە ئەو کەسانەم زۆر خۆش ئەوێت کە گوێ ڕایەڵی تو دەکەن واتە موسڵمانان.

دەبێ من و تۆش وەك صالّحان خۆشەویستی موسڵمانان لەناو دڵماندا ڕەگ دابکوتێت و بەردەوام لە دوعا کانماندا ناویان بەرین و زانای خوا پەرست ( ابو حمدون) – ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەناوبردن دوعای بۆ موسڵمانە ناسراوەکانی دەکرد:

* عن ابی عبدالله الخطیب قال: لابی حمدون – طیب بن اسماعیل الذهلي– صحیفة فیها مکتوب ثلاثمائة من اصدقائه، وکان یدعو لهم کل لیلة، فترکهم لیلة فقیل له فی نومه: یا ابا حمدون لم تسرج مصابیحك اللیلة، قال: فقعد واسرج واخذ الصحیفة فدعا لواحد واحد حتی فرغ).[٢]

واتە: ئەبو عبدالله الخطیب دەڵێ: ئەبو حمدون – کە ناوی تەواوی (طیب)ی کوڕی اسماعیل الذهلي یە– دەفتەرێکی هەبوو ناوی(٣٠٠) کەس لە هاوڕێکانی نووسیبوو، هەموو شەوێ یەك یەك بەناو بردن دوعای خێری بۆ دەکردن و شەوێك خەوت و دوعای بۆنەکردن.

لەخەودا پێیان ووت: ئەی باوکی حمدون ئەم شەو خێر بوو وا چرات دانەگیرسا، ئەمیش هەستایە سەر پێ و چراکەی داگیرساند و یەك یەك دوعای بۆ کردن.

ئەمەش پیاو صالّحە مەزنەکەی ئیسلامە( ئەنەسی)ی کوڕی( مالیك)– ڕەحمەتی خوای لێ بێ– موسڵمانانی لە کوڕەکەی خۆی خۆشتر دەوێت و ئەیان شوبهێنێ بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ئەمەش وانەیەکی تێدایە بۆ صالّحبوون:

---

١ صفه الصفوة(٢/ ١١٦).

٢ صفة الصفوة(١/٢٣٩).

* قال مالك بن دينار– رحمه الله– أتينا أنساً انا وثابت ويزيد الرقاشي، فنظر إلينا فقال: ما اشبهكم باصحاب محمد لانتم احب الىّ عدة ولدى الاّ ان يكون فى الفضل مثلكم، انى لادعو لكم فى الاسحار[1]

واتە: ماليك ی کوڕی دينار– ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ– دەڵیٚ: من و ثابت و يەزيد الرقاشی چوين بۆ سەردانی ئەنەسی کوڕی ماليك– ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ– و سەيرێکی کردين و پاشان پێی ووتين: ئای کە چەند لە هاوەڵانی محمد دەچن، دڵنيا بن من ئێوەم لە زۆریٚ لە کوڕەکانم خۆشتر دەویٚ مەگەر ئەوانيش وەك ئێوەيان لیٚ بیٚ ئەوجا ئەوەندەی ئێوە خۆشم بووێن‌و من هەموو کاتێکی سەحەر نزای خێرتان بۆ دەکەم.

ئەمەش سەرمەشقێکی تری کاروانەکەيە و ناوی ( ابو مسلم الدارانی)يەو بە جۆریٚ خۆشەويستی خۆی دەردەبڕێت بۆ موسڵمانان کە هەموو دنيا هی ئەو بیٚ حەز دەکات بيدات بە برايەکی موسڵمانی خۆی:

* عن احمد بن ابى الحواري قال: قال ابو مسلم الدارانى– رحمه الله– ( لو ان الدنيا كلها فى لقمة ثم جاءنى اخ لي لاحببت ان اضفها فى فيه).[2]

واتە: ئەحمەدی کوڕی ئەبی حەواری دەڵیٚ: ( أبو مسلم الدارانی) – ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ دەيفەرموو: ( ئەگەر هەموو دنيا لە پارووييەکدا کۆ ببێتەوە– و بەدەستی منەوە بیٚ– و لەو کاتەدا برايەکی موسڵمانم بێت بۆلام پێم خۆشە ئەو پاروە بکەم بە دەمی يەوە.

زانا مەزنەکەی ئيسلام عبدالله ی کوڕی عباس– خوای لیٚ ڕازی بیٚ– لەکاتی شەڕ و زوير بونی لەگەڵ موسڵمانێکدا خۆشەويستی موسڵمانانی وەبيرهێنايەوە تا پێی بڵیٚ من ئەمە ڕەوشتم بیٚ شايانی ئەو ڕقەی تۆ نيم:

* عن ابن بريدة قال: شتم رجلٌ ابن عباس– رضى الله عنه– فقال ابن عباس: انك تشتمنى وفي ثلاث خصال، انى لآت على الآية من كتاب الله عزوجل فلوددت ان جميع

---

١ عمر بن عبدالعزيز_ د. الصلابى وەرگێڕانی نووسەر لە (لا ٢٠٦).

٢ صفه الصفوة (٢/ ١٥٦).

الناس يعلمون منها ما أعلم، وانى لاسمع بالحاكم من حكام المسلمين يعدل فى حكمه فاخرج به ولعلي لا اُقاضى اليه أبدا، وانى لاسمع الغيث قد أصاب بلداً من بلدان المسلمين فاخرج به ومالي به من سائمة).[1]

واته: (ابن بريده) دەڵێ: ڕۆژێك پیاوێك ( ابن عباس) بە جنێو و قسەی ناشیرین دادەگرێتەوە ! ! بەڵام ابن عباس زۆر لەسەرخۆ و بەنەرمێکەوە پێی فەرموو: (هۆبراکەم) چۆن ئەو قسە ناشیرینانە بەمن دەڵێی لە کاتێکدا من سێ ڕەوشتی بەرزم تێدایە: یەکەم: کە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەخوێنم و کارم تێدەکات لەدڵی خۆمدا دەڵێم خۆزگا هەموو خەڵکی ئاوا لێی تێ بگەیشتنایەو کاری تێ بکردنایە، دووەم: کاتێ دەبیستم فەرمانڕەوای ناوچەیەکی موسڵماننشین دادپەروەرە زۆر دڵخۆش دەبم لەکاتێکدا کە هەرگیز کاری دادوەریم تێی ناکەوێت، سێ یەم:کاتێ دەبیستم باران بەخوڕ دەبارێ بەسەر ناوچەیەکی موسڵمان نشیندا زۆر دەڵخۆش دەبم لەکاتێکدا کە یەك سەر مەڕیشم نیە لەوێدا.

(اعتكاف) واتە مانەوە لە مزکەوتدا لەبەر خاتری خوا پەرستشێکی زۆر گەورەیە و هاوەڵان بەردەوام پێی هەستاون و (ابن عباس)–خوا لێی ڕازی بێ– ڕۆژێك لە ناو چێژی اعتكافدا بوو بەڵام خۆشەویستی بۆ موسڵمانێك ئیعتیکافەکەی پێ شکاند ئەمە چۆن بوو با گوێبگرین:

*عن عطاء عن ابن عباس–رضى الله عنه–انه كان معتكفاً فى مسجد رسول الله (ﷺ) فأتاه رجل مسلم عليه ثم جلس,فقال له ابن عباس:يا فلان أراك كئيباً حزينا,قال:نعم يا ابن عم رسول الله! لفلان عليَّ حق وحرمة صاحب هذا القبر ما أقدر عليه, قال ابن عباس: أفلا أكلمه فيك؟قال: إنْ أحببت, قال: فتنقل ابن عباس ثم خرج من المسجد, فقال له الرجل: أنسيتَ ما كنت فيه, قال لا, ولكنى سمعت صاحب هذا القبر والعهد به قريب – فدمعت عيناه، وهو يقول: ((من مشى فى حاجة أخيه وبلغ فيها كان خيراً من أعتكاف عشر سنين، ومن اعتكف يوماً ابتغاء وجه الله تعالى، جعل الله بينه وبين النار ثلاث خنادق ابعد مابين الخافقين)).[2]

---

١ صفة الصفوة(٣٨٢).

٢ الجامع لشعب الايمان (٦/ ٤٣٦) والحاكم (٤/ ٢٦٩) رجاله موثوقون.

واتـە: پێـشەوا -عطـا- لـە (ابـن عبـاس)ەوە دەگێڕێتـەوە کـە لـە مزگەوتەکـەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) (اعتکاف)ی دەکرد، لەو کاتەدا پیاوێك هاتە مزگەوت و سڵاوی لێ کرد و پاشان دانیشت، و(ابن عباس)یش لێی پرسی: فلاَن کەس دڵتـەنگ و غـەمناك دێتە بەر چاو، ووتـی: بـەڵێ ئـەی ئامۆزای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)! پـارەم لای فـلاَن کەسەو سوێند بەو کەسەی ڕێزی بەم قەبرە داوە پێی ناوێرم داوای لێ بکەمەوە.

(ابن عباس)یش فەرمووی: ئەی من قسەیەکی لەگـەڵ نەکـەم لـەو بارەیـەوە؟ کـابرا ووتی: ئەگەر پێت خۆشە بەڵێ، ( وابن عبـاس) لەجێگاکـەی خـۆی هەسـتاو لەمزگـەوت چووە دەرەوە، پیاوەکە پێـی ووت: ئـەی بـیرت چـووە تـۆ لـە(إعتکـاف) دای؟ ووتـی: نەخێر، بەلاَم لە خاوەنی ئەم گۆڕەم بیستووە کە ماوەیەکی کەمە لە ناوماندا نـەماوە- چاوەکانی پڕبوون لەئاو- کە فەرموویەتی: هـەر کەسـێ بـڕوات و پێداویستی برایـەکی موسڵمانی دەر بکات و کارەکەی بۆ بکات خێرەکەی لە (اعتکاف)ی (١٠) ساڵ زیـاترە، هەر کەسێکیش لەبەر خاتری خوا یەك ڕۆژ (اعتکاف) بکـات ئـەوە خـوای عزوجـل سـێ خەندەق لەئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە کە دورترە لە دوو کێوی دوور لەیەك.

لەکاتی بەلاَو نەهامەتیدا صاڵحان دەگەنـە فریـای بـرا موسـڵمانە لێقـەوماوەکانیان و هەربەوە ناوەستن کەلـە دڵـەوە پێیـان نـاخۆش بێـت و بڵـێ بەشـداری غـەمتم! بـەڵکو زەرەرەکەی لەگەڵدا دولەت دەکات، و زانـای پایـە بـەرزو صـاڵحی ئیـسلام (لیـث) ئـاوا لەخۆشەویستی حاڵی بووە:

* عن عبدالملك بن يحيى بن كـثير قـال: سمعـت أبـي يقـول: وصـل الليـث بـن سـعد (رحمه الله) ابن ابی لهيعة بألف دينار لما احترقت داره).[1]

واتە: عبدالملك ی کوڕی یەحیای کوڕی کەسیر دەڵێ: لە باوکمم بیست کە دەیووت: لەیسی کوڕی سەعد- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- هەرکەبیستیماڵەکەی (ابن ابی لهيعه) سوتاوە خێرا هەزار دیناری ئاڵتونی بۆ نارد.

---

١ صفة الصفوة (٢/ ٢٥٨)

ئایا دەزانی- خوشك وبرای صالحم- کە لەخۆشویستنی موسڵمانانە کەهەواڵی خۆش و دڵگیری پێ ڕابگەیەنیت و هەواڵی ناخۆش و دڵتەنگ کەری لێ بشاریتەوە باخەڵکی تر بۆی باس بکەن(محمد ی کوڕی مونکەدەر) لەم وانەیە حاڵیمان دەکات:

* عن سفيان بن عيينة- رحمه الله- قيل لمحمد بن المنكدر: أيُّ العمل احبّ اليك؟ قال: ادخال السرور على الأخوان).[1]

واتە: سوفیانی کوڕی عویینە- ڕحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: لە محمدی کوڕی مونکەدەریان پرسی: کام کردەوەت لەهەموو کردەوەیەکی ترت پێت خۆشترە؟ فەرمووی: خۆش کردنی دڵی براکان.

ئەم خۆشەویستیەش والەمرۆڤ دەکات کەدڵی نەیەت برا موسڵمانەکانی بخاتە خزمەتی خۆی و لەپێناو حەوانەوەی خۆیدا ماندوویان بکات بەڵکو خۆی هەندێ کات کارەکانی ئەوانیش دەکات و خەلیفەی سێ یەمی ئیسلام ئەم ڕێگا جوانەی لەگەڵ خزمەتکارەکانیشی دا بەکارهێناوە:

* اخرج ابن سعد واحمد في الزهد وابن عساكر عن عبدالله الرومي قال: كان عثمان بن عفان- رضي الله عنه- يلي وضوء الليل بنفسه، فقيل له: لو أمرت بعض الخدم فكفوك؟ فقال: لا ان الليل لهم يستريحون فيه).[2]

واتە: ئیبن سعد واحمد و ابن عساكر لەعبدالله رومی یەوە هێناویانە کە وتویەتی: عوسمانی کوڕی عەفان- خوای لێ ڕازی بێ شەو خۆی ئاوی دەهێناو دەستنوێژی پێ دەگرت، و پێیان ووت: ئەگەر فەرمان بدەیت خزمەتکارەکان بۆت بکەن باشتر نیە؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، شەو بۆ خۆیانە تا تیایدا وچانێك بدەن.

صاڵحان دراوسێکانی خۆیانیان زۆر خۆش دەوێت ئاوەڕۆ یان زبڵ و خاشاك یان هیچ شتێکی تر ناکەنە بەردەرگاکانیان و ئازاریان نادەن بەهیچ هۆکارێکی تر.

---

١ صفة الصفوة (٢/ ٩٩)

٢ حياة الصحابة (٢/ ٢٠٩).

**فەرموون بابچینە خزمەت شورەیحی قاضی بزانین پشیلەی تۆپیو چی لێدەکات**

* عن ابی حیان التمیمي قال: قال لنا أبی کان شریح (رحمه الله) اذا مات سنور لأهله أمر بها فالقیت في جوف داره، ولم یکن مسیل الماء او الحوض الاّ في جوف داره اتقاءً لأذی المسلمین).[1]

واته: ئەبو حەیانی تەمیمی دەڵێ: باوکم پێی وتین کە قاضی شورەیح –ڕەحمەتی خوای لێ بێ– ئەگەر پشیلەیەکی ماڵەوەیان بمردایە فەرمانی دەدا هەر لە حەوشەکەی خۆیاندا بیکەن بەژێر خۆڵەوە، و جۆگەی ئاو و چاڵی پیسی لە حەوشەکەی خۆیدا هەڵدەکەند لەبەر ئەوەی نەوەك بۆنەکەی موسڵمانان ناڕەحەت و نیگەران بکات) .

صاڵحان خەڵکیان زۆر خۆش دەوێت و هەرگیز زەمیان ناکەن و لەلای خەڵکیدا نایانشکێنن و عەیب و عاریان گەورە ناکەن چونکە خۆیان ئەوەندە هەڵەو کەمو کوڕیان هەیە کەنەیانپەرژێتە سەر برا موسڵمانەکانیان:

* قیل للربیع بن الخیثم– رحمه الله– الا تذکر الناس؟ فقال: ما انا عن نفسي براضٍ فاتفرغ من ذمها الی ان اذم الناس، ان الناس خافوا الله من ذنوب الناس وأمنوه علی ذنوبهم).[2]

واته: بەخواناس و صاڵح– ڕەبیعی کوڕی خەیسەمیان ووت: قەد باسی خەڵکی ناکەیت؟ ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: من لەنەفسی خۆم ڕازی نیم تا واز لە زەمکردنی بهێنم و دەست بکەم بەزەم کردنی خەڵکی، سەیرە خەڵکی باسی خەڵکانی تر دەکەن چونکە خەمیانە نەکەونە بەر سزای خوا بەڵام بێ خەمن لەخۆیان کە بکەونە بەر سزای خوا!!.

(الله اکبر) برایان و خوشکانی صاڵحم، دنیای ساڵحان چەند سپی و بێگەردە هەموو موسڵمانێکیان خۆش دەوێت و دڵیان زۆر سافە بەرامبەریان و بەسۆزو میهرەوە بۆیان دەڕوانن ئیتر با زوڵم و ستەمیشیان بەرامبەر بکەن ئەمان هەر دوعای خێریان

[1] صفة الصفوة (٢/ ٢٥).

[2] صفة الصفوة (٢/ ٣٧)

بۆدەکەن: دەی باسەرێك لە سەرمەشقێكی تری صالّحان بدەین کە ناوی ابراهیم التیمی یە- ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ- :

* قال العوام بن حوشب: ما رأيت رجلاً قط خيراً من ابراهيم التيمي- رحمه الله- إذ سمعته يقول: ان الرجل يظلمني فارحمه).[1]

واتە: عەوامی کوڕی حەوشەب دەڵیّ: تا ئێستا کەسم نەدیوە چاکتر بیّ لە إبراهیم التیمی- ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ- خۆم گوێم لێی بوو دەیفەرموو: خوایە فلاّن کەس ناهەقیم پیّ دەکات دەی خوایە گیان ڕەحمی پیّ بکەیت و لێی خۆش ببە ! !.

ئەوەش بەشێکە لە خۆشەویستیت بۆ موسڵمانان کە حەزنەکەیت خۆتیان لیّ جیا بکەیتەوە و نەتەوێت لەوان زیاتر بیت و ژیانت لەوان خۆشتر نەبێت- نابێت وەك بەرپرسەکانی ئەمڕۆ کەس نەتبینیّ نەوەك بچێتە ڕیزی خەڵکە عامەکەوە ! ! بەڵکو هەموو بەرپرسان دەبێت لەخزمەتی عمری کوڕی خطابدا چۆك دابدەن و وانەیەکی لەلا بخوێنن لە خۆجیا نەکردنەوەی لە خەڵکی ئاست نزمەکان:

* عن زيد بن أسلم عن أبيه قال: نحروا يوماً من أيام جزوراً فاطعمها الناس وفرعوا لعمر بن الخطاب -رضی الله عنه- طيبها، فأتی به فاذا قدر من سنام و من كبد، فقال: انّی هذا؟ قالوا: يا امير المؤمنين من الجزور التی نحرناها اليوم.

قال: بخ، بخ، بئس الوالي انا، ان اكلت أطيبها واطعمت الناس كراديسها، ارفع هذه الحفنة هات لنا غير هذا الطعام فأتي بخبز وزيت فجعل يكسر بيده ويثرد ذلك الخبز).[2]

واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: ڕۆژێ لە ڕۆژان کۆمەڵیّ ولاّخی قوربانیان سەربڕی و دەرخواردی خەڵکی دراو ناوسك و سیّو جگەرەکەیان بەتایبەتی ئامادە کرد بۆ عمری کوڕی خطاب-خوای لیّ ڕازی بیّ- و ئەویش فەرمووی: ئەمەتان لەکویّ هێناوە؟ ووتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران هی ئەو ولاّخانە بوو کە ئەمڕۆ سەرمان بڕین.

---

١ صفة الصفوة (٤٣/٣)

٢ صفة الصفوة (١٤٧/١)

ئەویش فەرمووی: باە، باە، چ سەرکردەیەکی خراپم ئەگەر من سی وجگەرە خۆشەکەی بخۆم و کەچی ئێسقان و لاڕەوگەکانی بدەم بەخەڵکی، ئەم خواردنە لابەن لەبەردەستمدا و خواردنی ترم بۆ بێنن، وئەوانیش تەنها نان و ڕۆنیان هەبوو بۆیان هێناو ئەویش دەستی کرد بە (ترینکردن ـ تێگووشە)و پاشان ئەوەی خوارد!!.

صالحان ئیسراحەت و بێوەیی خۆیانیان ناوێ لەکاتێکدا ببینن برا موسڵمانەکانیان لەناو ناڕەحەتی وئەشکەنجەو ئازارا بژین و هەوڵ دەدەن ئەوانیش بەشداری ئەو ناڕەحەتی و ناخۆشیانەیان بن.

لەڕەوە ملیۆنیەکەی ساڵی١٩٩١دا لەڕۆژێکی ساردو باراناویدا هەموو گەلی کوردستانی عێراق ڕەویان کرد بۆ ئێران و تورکیاو برا موسڵمانە کوردەکانی ئێران بۆئەوەی بەشداری غەم ونەهامەتی برا عیراقی یەکانیان بن لەو شەوەدا هەیان بووە تا بەیانی لە حەوشەکەی خۆیاندا لەبەر باران وەستاون و نەچوونەتە ژوورەوە.

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا هاوەڵان– خوایان لێ ڕازی بێ– لەناو ئەشکەنجەو سزا و ئازاردا بوون بەڵام یەکێ لە هاوەڵان کە ناوی ( عوسمانی کوڕی مضغون) بوو کەس پێی نەدەوێرا و کەس سزای نەدەدا بەڵام ئەو بەو کارە دڵخۆش نەبوو بەڵکو با بزانین چی کرد!؟.

* عن عثمان قال: لما راى عثمان بن مضغون– رضى الله عنه– مافيه أصحاب رسول الله من البلاء، وهو يغدو ويروح فى أمان من الوليد بن مغيرة، قال: والله ان غدوتي ورواحي امناً بجوار رجل من أهل الشرك واصحابي واهل ديني يلقون من الأذى والبلاء مالايصيبني لنقص طبير فى نفسي، فمشى الى الوليد بن مغيرة فقال له: يا ابا عبدالشمس وفت ذمتك قد رددت اليك جوارك, قال لم يا ابن أخي؟ لعلّه آذاك أحد من قومي، قال كلا ولكن ارضى بجوار الله–عزوجل– ولا اُريد ان أستجير بغيره).[١]

واتە: کاتێ عثمانی کوڕی مەزغون– خوای لێ ڕازی بێ– بینی وا خوشك وبرا موسڵمانەکانی بەدەستی بتپەرستانەوە ئەشکەنجەو سزا دەدرێن بەڵام ئەم لەژێر

---

١ صفة الصفوة (١/ ٢٢٢)

سایەی- ئەمانی- وەلیدی کوڕی موغیرەدا- دەهات و دەچوو کەس پەنجەی بۆنەدەبرد و ئەشکەنجە نەدەدرا.

بەخۆی ووت: من ئەم بێ وەییەم لەژێر سایەی بتپەرستێکدا شتێکی عەیبەو کەمی یە بۆمن کە براکانم لە هاوئاینانم بەردەوام ئەشکەنجەو ئازار دەدرێن بەلاّم من دێم و دەچم کەس دەستم بۆ درێژ ناکات ئەمە بۆمن زۆر عەیبەیە!

بۆیە ڕۆیشت بۆلای وەلیدی کوڕی موغیرەو پێی ووت: ئەی باوکی (عبد الشمس) زۆر سوپاستەکەم ئیتر ئەمانەکەت بۆ دەگێڕمەوە، ئەویش پێی ووت: هیچ بووە برازای خۆم؟ لەوانەیە کەسێك لەهۆزەکەم دەست درێژیان بۆ کردبیت؟!.

عثمان ووتی: نەخێر، بەڵکو من تەنها حەزدەکەم لە پەناو سایەی خوای عزوجل دابم و لەژێر هیچ پەنایەکی تردا نەبم.

(ئەبو دوجانە)- خوای لێ ڕازی بێ- لەکاتی سەرە مەرگدا زۆر زۆر ڕوی خۆش بوو کاتێ پرسیاریان لێی کرد ووتی ئەمە هۆیەکەیەتی:

* عن زيد بن أسلم قال: دخل سماك بن خرصة على ابي دجانة وهو مريض وكان وجهه يتهلهل، فقيل له: ما لوجهك يتهلهل؟ قال: مامن عملي شئ أوثق عندي من إثنتين: اما أحدهما فكنت لا أتكلم فيما لا يعنيني،واما الآخر فكان قلبي للمسلمين سليماً).[1]

واتە: سەماکی کوڕی خەرسە چوون بۆ سەردانی-ابی دجانە- خوای لێ ڕازی بێ. کە لەسەر جێگا کەوتبوو لەسەرەمەرگدا بوو، دەبینێ دەم وچاوی وەك گوڵ گەش دەبێتەوە! عەرزیان کرد: هۆی چی یە وا دەم و چاوت وەك گوڵ خۆی دەنوێنێ و ڕوت خۆشە؟

فەرمووی: تەنها دوو کردەوەم لەناو هەموو کردەوەکانمدا زیاتر دڵم پێی خۆشە: یەکەمیان: لە مەسەلەیەکدا قسەم نەکردوە کە پەیوەندی بەمنەوە نەبوو بێت. دووەم: دڵم بەرامبەر موسڵمانان پاکە و هیچم نی یە بەرامبەر هیچ کام لەموسڵمانان.

---

١ صفة الصفوة (١/٢٥١).

ئەمەش سێیەم کەسەکەی ئیسلامە دوای پێغەمبەرەکەی‌و عمری کوڕی خطابەو حەزدەکات موسڵمانێك لە قەفەزی دیلی ڕزگار بکات لەهەموو دورگەی عەرەب خۆش ترە لەلای:

* اخرج ابن ابی شیبة عن عمر بن الخطاب –رضی الله عنه– قال: لأن استنقذ رجلاً من المسلمین من ایدی الکفار احب اليَّ من جزیرة العرب) [1]

واتە: عمری کوڕی خطاب –خوای لێ ڕازی بێ– فەرموویەتی: تەنها یەك موسڵمان لەدەستی کافران ڕزگار بکەم لەوەم پێخۆشترە هەموو جەزیرەی عەرەبی هی من بێ.

صاڵحان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ– بەڕادەیەك خوشك وبرا موسڵمانەکانیان خۆش دەوێت کە حەزناکەن قازانجی زۆر بخەنە سەریان و شت هەڵناگرن بۆ کاتی گرانی، تا ئەوکاتە بەنرخێکی زیاتر پێیان بفرۆشن، ئەم وانەیەش لە مسوەرەوە فێر دەبین بزانین چۆن بووە:

* عن محمد بن سعد قال: احتکر المسور بن مخرمة فرأی سحاباً من سحاب الخریف فکرهه، فلّما أصبح أتی السوق فقال: من جاءني ولیته، فلما بلغ ذلك عمر بن الخطاب – رضی الله عنه– فأتاه السوق فقال: أجننت یا مسور؟ فکرهت ماینفع الناس ان اربح فیه، فقال جزاك الله خیراً). [2]

واتە: محمدی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە و دەڵێ: هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا میسوەری کوڕی مەخرەمە– خوای لێ ڕازی بێ– هەندێ خواردەمەنی هەڵگرت تا پاشان بە پارەی باش بیفرۆشێتەوە، لەو ماوەیەدا هەورێکی بینی لە هەورەکانی پایز پێ ی ناخۆش بوو– کەوا دیارە باران دەبارێ و دانەوێڵەکانی ئەم پارەیەکی زۆر ناکات!!

کاتێ بەیانی داهات لەگەڵ خۆی بردی بۆ بازاڕ و هاواری کرد: هەرکەسێ بێت لەم خواردنەی پێ دەبەخشم! کاتێ ئەو هەواڵە گەیشتە عمری کوڕی خطاب (خوای لێ ڕازی بێت) چوو بۆلای بۆ بازاڕ و پێی فەرموو: ئەوەتێك چوویت ئەی میسوەر؟

---

١ حیاة الصحابة (٢/١٨٠).

٢ صفة الصفوة (٢/ ٦٤)

ووتی: نەخێر ئەی ئەمیری باوەڕداران بەڵکو هەورێکم بینی هات پێم ناخۆش بوو، سەیر بوو ئەوەی کەلك و سودی موسڵمانانی تێدایە من پێم ناخۆش بوو ئەو هەورە بێت و باران ببارێت! تا قازانجێکی زیاتر بکەم، عمریش فەرمووی پێی: دەی خوای گەورە پاداشتت بداتەوە.

صالّحان .. تەنانەت ڕقیان لە موسڵمانە گوناهبارەکانیش نی یە! و پشتیان لێ هەڵناکەن و لەهەمووو کۆڕو دانیشتنێکدا زەمیان ناکەن! ئەمە بۆ موسڵمانە خراپ و گوناهبارەکان ئەی دەبێ گوناهی من وتۆ چەند گەورە بێ کە جاری واهەیە ڕقمان لە موسڵمانێکی ڕەوشت بەرزی چاکە کارە!!؟

دەی با سەرێك بدەین لە قوتابخانە ناوازەکەی(إبن مسعود) بزانین لەم بارەیەوە ئێوارە کۆڕێکمان بۆ ناگرێت و سود بارانمان ناکات؟:

* عن ابن مسعود–رضی الله عنه– قال: اذا رأیتم اخاکم قارفاً ذنباً فلا تکونوا أعواناً للشیطان علیه، تقولون اللهم اخزه اللهم العنه، ولکن سلوا الله العافیة، فانا اصحاب محمد کنا لانقول فی أحد شیئاً حتی نعلم علی مایموت).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی مسعود (خوای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێت: هەرکاتێ برا موسڵمانەکەتان بینی تاوان و گوناهێ دەکات، ئێوەش مەبن بەهاوکاری شەیتان لەدژی ئەو برایەتان و پێی بڵێن: ئەی خوا سەرشۆڕی بکەیت! و ئەی خوا نەفرەتی لێ بکەیت، بەڵکو داوای بێ وەیی بۆخۆتان و ئەویش بکەن لەنزیك بوونەوە لەگوناه و تاوان.

چونکە ئێمەی هاوەڵانی محمد دەربارەی هیچ تاوانبارێك هیچ حوکمێکمان دەرنەدەکرد تا نەمانزانیایە لەسەر چ ڕەوشت و ڕێبازێك گیانی دەسپارد.

---

١ الجامع لشعب الایمان(١٠/ ١٨٣).

# یەکەم

## ڕێزو حورمەتی مزگەوت

مزگەوت لەبەرنامەی ئیسلامدا گرنگیەکی ئەوتۆی هەیە کەبە پلەی یەکەم دێت، پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ئەم گرنگیە مەزنەی شوێنەواری مزگەوتی بەکردەوە نیشانی هاوەلە بەڕێزەکانی دا بەوەی کە لەگەڵ گەیشتنی بەشاری مەدینە یەکەمین ئیشێ کە پێی هەستا دروست کردنی مزگەوت بوو.

گرنگی دان بەمزگەوت و ئاوەدان کردنەوە و قەرەباڵغ کردنی بەلگەی حاشا هەڵنەگری بوونی باوەڕی ڕاستەقینەیە بە خوای تاك و تەنهاو ڕۆژی قیامەت وەك لەقورئاندا هاتووە:

* قال الله عزوجل: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾.[1]

واتە: تەنها و تەنها ئەو کەسانە مزگەوتەکانی پەروەردگار ئاوەدان دەکەنەوە کە باوەڕیان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە...

صالّحان–ڕەحمەتی خوایان لێ بێ– مزگەوتیان زۆر خۆش ویستووە و کاتە بۆش و بێ کارەکانیان لەمزگەوتدا بەسەربردوە، ڕقیان لە گەڕانی بازاڕ بووە مەگەر بۆ کڕینی پێداویستی، چونکە خۆشەویسترین جێگایە لەلای پەروەردگار:

* عن ابی هریرة (رضی الله عنه) ان النبي (ﷺ) قال: احب البلاد الی الله مساجدها وابغض البلاد الی الله أسواقها)[2]

---

١ سورة (التوبة) آية (١٨).

٢ رواه مسلم فی المساجد (٢٧٨) رياض الصالحين.

واتە: ئەبو هورەیرە-خوای لێ ڕازی بێ- لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ( خۆشەویستترین پارچە زەوی لەلای پەروەردگار مزگەوتەکانەو قێزەوەنترین جێگایش لەلای پەروەردگار بازاڕەکانە.

براو خوشکی-صاڵحم- کە مادەم بەتەمان ببنە ئەندامی کاروانە موبارەکەکەی صاڵحان دەی چاوێك لەگەورە پیاو صاڵحی ئیسلام بکەن- عمری کوڕی خطاب- خوای لێ ڕازی بێ- نەزری کردبوو لەسەر خۆی هەموو ڕۆژێکی هەینی مزگەوتی دەڕازاندەوەو خاوێنی دەکردەوە و بۆن خۆشی دەکرد:

ئەی تۆ هەرگیز بەخەیاڵتا هاتووە تەنها جارێك گسكو ماسیحەیەك هەڵبگریت و مزگەوتی گەڕەکی خۆتان پاك و خاوێن بکەیتەوە؟:

* عن ابن عمر (رضی الله عنه) ان عمر-رضی الله عنه- کان یعمر مسجد رسول الله کل جمعة).[١]

واتە: عبدالله ی کوڕی عمر باسی باوکی ئازیزیمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: عمر هەموو ڕۆژانێکی هەینی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوای ئاوەدان دەکردەوە بە خاوێن کردنەوە و بۆن خۆش کردنی.

هەر لەبەر بەڕێزی و گەورەیی مزگەوتەکان بوو کە هاوەڵان ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد کە تابۆتان دەکرێت لە ماڵەکانی خوادا بمێننەوە..

ئایا برای صاڵحم هاتووە بەخەیاڵتدا لەغەیری کاتی نوێژە فەرزەکان سەردانی ماڵەکانی خوا بکەیت:

* عن عبدالرزاق قال: ان ابا الدرداء- رضی الله عنه- کتب لسلمان الفارسی- رضی الله عنه- : یا أخی لیکن المسجد بیتك فإنّي سمعت رسول الله (ﷺ) یقول: ( المسجد بیت کل تقی وقد ضمن الله-عزوجل- لمن کانت المساجد بیوتهم: بالروح والرحمة والجواز علی الصراط الی رضوان الله-عزوجل-).[٢]

---

١ رواه ابو یعلی، حیاة الصحابة بەرگی (٣/ ٤١٩)

٢ رواه الطبرانی فی الکبیر.

واتــە: عبـدالرّزاق لـە(مـصنف) دا هێناویـەتی کـە هـاوەڵی شـارەزا و خوێنـدەواری پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەبو دەرداء-خوای لێ ڕازی بێ- نامەیەکی نووسـی بـۆ سـەلمانی فارسی (خوای لێ ڕازی بێ) و پێـی فـەرموو: ئـەی بـرای موسـڵمانم بـا مزگـەوت جێـی حەوانەوەو هەوارگەت بێ. چونکە لە پێغەمبـەری خـوام بیـستووە (ﷺ) فەرموویـەتی: مزگەوت ماڵ و جێ حەوانەوەی گشت لە خوا ترس و بەتەقواکانە، خوای (عزوجل)یـش بۆ ئەوانەی مزگەوت ماڵیانە حەوانەوەو سۆزو بەزەیی و پەڕینـەوە لـە پـردی (سـیرات) بەرەو ڕەزامەندی خۆی بۆ مسۆگەر کردوون.

ئەی براو خوشکی صاڵحم ئەزانن بێ ئاگایی و خـۆ خەڵەفانـدن لـەخوا لەچـی یـەوە سەر هەڵدەدات؟ ئەم وەڵامە لە کوڕە گەورە ژیرو خواناسەکەی علی کوڕی ئەبو طالبو خەلیفەی پێنجەمی ئیسلام وەربگرن:

* سأل امير المؤمنين على بن ابي طالب -رضى الله عنه- إبنـه الحسن عن الغفلـة؟ قال: تركك المسجد و طاعتك المفسد).[1]

واتە: ئەمیری باوەڕداران و ئامۆزا نازدارەکەی سەروەرمان علی کوڕی ئـەبو طالـب- خوای لێ ڕازی بێ- ڕۆژێك لە کوڕی گەورەی خۆی حەسـەن دەربـارەی غەفڵـەت و بـێ ئاگایی دەپرسێت؟ و ئەویش لەوەڵامدا دەفەرموێت: پـێ بـڕین لـە مزگـەوتو وازهێنـان لەنوێژی جەماعەت و هەروەها گوێڕایەڵی کردنی کەسانی گەندەڵو خراپەکارە.

صاڵحان زۆر دڵخـۆش و فـەرحان دەبـن بـەهاتن بـۆ مزگـەوت و مانـەوەو دانیشتن و خـەوتن لـە مزگەوتـدا- چـونکە بـرای صـاڵحم هـەموو چـرکەیەکی بوونـت لەمزگەوتـدا بەچاکەو بەندایەتی بـۆت دەنوسـرێت و دەخیلـت بم نەیگۆڕیتـەوە بـە بـازاڕو چـاخانەو پارکو بەردەمی شاشەی تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر!

بڕوانە ڕەبیعی کوڕی خەیسەم- ڕەحمەتی خوای لێ بێ چ وانەیەکمان پێ دەڵێتەوە لەم بارەیەوە:

---

١ الحسن بن على (رضى الله عنهما) للصلابي لا١٩٨.

* عن بشر بن الحارث الحافي، قال الربيع بن الخيثم -رحمه الله- انا بعصافير المسجد آنس مني باهلي).[١]

واتە: بشری حافی-ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەربارەی ڕەبیعی کوڕی خەیسەم دەڵێ جارێکیان فەرمووی: من بەچۆلەکەکانی مزگەوت زیاتر دڵخۆش و مەسرورم تا بەماڵ و منداڵەکەم.

صاڵحان پەروەردەی ناو حەرەمی مزگەوت بوون و لەوێ قورئانیان خەتم کردوە و پایەکانی ناو مزگەوت شایەتی ئەو ڕاستی یەن بۆیان، دەی با من و تۆش هەمان ڕێگا بگرینە بەر تا کاروانی صاڵحان بێ کاروانچی نەمێنێتەوە:

* قال جعفر: سعمت ثابت البناني يقول: ما تركتُ فى المسجد الجامع سارية الأ وقد ختمتُ القرآن عندها وبكيت).[٢]

واتە: جەعفەر دەڵێ: لەسابت ی بەنانیم بیست دەیفەرموو: لەم مزگەوتە گەورەیەدا هیچ کۆڵکەیەك نەماوە کەلە بنیدا قورئانم خەتم نەکردبێت و لەسایەیدا تێر نەگریابم.

هەر لەبابی خۆشەویستی ماڵی خوای گەورە پیاو صاڵحێکی تری ئیسلام کەناوی موسعیری کوڕی کدامەو وانەیەکی زۆر کاریگەری تر پێشکەشی هەوادارانی ماڵی خوا دەکات و دەڵێن کاتی چوونە مزگەوت گریاوە و کاتێکیش هاتۆتە دەرەوە گریاوە دڵی پڕ بووە:

* عن مسعر بن كدام -رحمه الله- يقول: ( لولا اُمي لما فارقت المسجد الاّ لما لابد منه وكان ان دخل بكى وان خرجَ بكى وان جلس بكى).[٣]

واتە: موسعیری کوڕی کودام- ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێت( لەبەر خاتری دایکم نەبوایە- کە پێویستە بچم بۆ خزمەت کردن و سەردانی- هەرگیز لەمزگەوت نەدەهاتمە دەرەوە مەگەر بۆ کارێکی زۆر پێویست).

---

١ صفة الصفوة (٢/ ٤١).

٢ صفة الصفوة (٢/ ١٧٦).

٣ صفة الصفوة (٢/ ٨٦).

ئـەم پیـاوە صـالحە هـەرکاتێ بـچوایەتە مـاڵی خـوا دڵـی پـڕ دەبـوو دەگریـا، و هـەرکاتێکیش لەمزگـەوت بـچوایەتە دەرەوە دووبـارە دڵـی پـڕ دەبوویـەوەو دەگریـا و کاتێکیش لەمزگەوت دابنیشتایە دەگریا.

بـراو خوشـکانی صـاڵحم، ئەگـەر بۆتـان دەکرێـت ببنـە بـانگ بێـژ یـان خزمـەتکاری مزگەوت بێ دوو دڵی بیکەن ئەوە هەلێکە دوبارە نابێتەوە چونکە هەموو خـەڵکی حـەز بەوە دەکەن خزمـەتی کۆشـکی سـەرۆك کۆمـار بکـەن و ببنـە خـاوێن کـەرەوە و ببنـە جارِدەری پاشا! ئەی منو تۆ لەگەڵ خوادا دەبێ چۆن بین؟:

* عن عثمان بن عمران قال: قال سوید بن غفلة (رحمه الله): (لـو اسـتطعت ان اکـون مؤذن الحي لفعلتُ).[1]

واتـە: عثمـانی کـوڕی عمـران بۆمـان دەگێڕێتـوە کـە پیـاو چـاك و گـەورە صـالحی ئوممـەت- سـوەیدەی کـوڕی غەفلـە (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: ئەگـەر بمتوانیایە و بوارم هەبوایە ببمە بانگ بێژی مزگەوتی گەڕەك، بێ دوو دڵی دەمکرد.

ئایا بـرای خوێنـەرم زانیوتانـە کـە موسـڵمان بەدرێـژایی ئـەو ماوەیـەی لـە مزگـەوت دەمێنێتەوە حسابی نوێژ کەری بۆ دەکرێت و لەنوێژدایە تا دەڕواتـە دەرەوە؟ ئـیتر بـا دایشنیشێ یان بخەوێت یان کتێب یـان هـەر کـارێکی تـری ڕەوا ئـەنجام بـدات حـسابی نوێژی بۆ دەکرێت:

* عن ابی هریـرة -رضـی الله عنـه- ان رسـول الله (ﷺ) قـال: (لا یـزال احـدکم فـی صلاة مادامت الصلاة تحبسه، لا یمنعه ان یتقلب الی أهله الاّ الصلاة).[2]

واتە: ئەبو هورەیرە -خوای لێ ڕازی بێ- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەرکەسێ لەئێوە لەمزگەوت بمێنێتەوەو چاوەڕوانی نوێـژی بەکۆمـەڵ

---

١ صفة الصفوة (١/٣٦٢)

٢ متفق علیه البخاري (٦٥٩) مسلم ٦٤٩.

بکات ئەوە حسابی نوێژکەری بۆ دەکرێت کەمادەم لەبەر خاتری نوێژەکەی دڵی نایە هەستێت و بچێتەوە بۆ ماڵ.

هەوادار و دۆستانی ماڵی خوا هەمیشە مزگەوت بە پاك و تەمیزی وخاوێن ڕادەگرن و لەماڵەکانی خۆیان زیاتر پاكو تەمیزی دەپارێزنو ئەگەر توێکڵە گوڵە بەڕۆژە یان هەر شتێکی تر بەسەر فەرشەکانەوە ببینن بێ دەنگ هەڵیدەگرنو دەیخەنە گیرفانیان و دواتر لە دەرەوە فڕێ ی دەدەن، ئەی ئەگەر خۆیان پیسیان کردبێ چی دەکەن؟ :

* عن يزيد بن خصيصة قال: تنخم أنس بن مالك–رضى الله عنه– من مسجد ونسي ان يدفنها، ثم خرج حتى جاء الى أهله فذكرها، فجاء بشعلة من نار فطلبها حتى وجدها ثم حفر لها فاعمق فدفنها).

واتە: یەزیدی کوڕی خەسیسە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: جارێکیان ئەنەسی کوڕی مالیك– خوای لێ ڕازی بێ– لەمزگەوتدا بەتخەمی کرد بەلاَم لەبیری چوو بیکات بەژێر خۆڵەوە و گەڕایەوە ماڵەوە و لەوێ بیری کەوتەوە، خێرا بەو تاریکی یە چلۆسکێکی گرت بەدەستی یەوە و چوو بۆ مزگەوت و زۆر بۆی گەڕا تا دۆزیەوە و چاڵێکی قوڵی بۆ هەڵکەند و کردی بەژێر خۆڵەوە.

خوشك و برای صالحم مزگەوت جێگایەکی ئەوەندە دڵگیرە، مەگەر دڵەکانمان ژەنگو ژیوار گرتبێتی و دڵمان ڕەش بوو بێتەوە– ئەگینا دڵمان نایە بێینە دەرەوە لێی و سەفوانی زوهەری لەم ئێوارە کۆڕەدا ئەم وانەیەمان فێر دەکات:

* عن ابى علقمة المزيني قال: كان صفوان بن سليم الزهري –رحمه الله– لايكاد يخرج من مسجد النبي (ﷺ) فاذا اراد ان يخرج بكى وقال: أخشى ان لا اعود إليه).[1]

واتە: ئەبی عەلقەمەی موزەینی دەڵێ: سەفوانی کوڕی سەلیم ی زوهری لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر نەدەچووە دەرەوە، و هەرکاتێ بچوایەتە دەرەوە بۆ کاری

---

١ صفه الصفوة (١٠٥/٢).

پێویست دەستی دەکرد بەگریان و دەیفەرموو: زۆر ئەترسم جارێکی تر نەگەڕێمەوە بۆلای، واتە بمرم.

ئەمەش مالیکی کوڕی دینارە–ڕەحمەتی خوای لێ بێ– وانەیەك فێری عوشاقی مزگەوتەکان دەکات و بە ووتەیەکی کورت تام و چێژی مانەوە لەمزگەوتدا بۆ تازە صاڵحان ڕوون دەکاتەوە:

* عن مالك بن دينار –رحمه الله– قال: يا إخوتاه بحق أقول لكم: (لولا البول ما خرجت من المسجد).[1]

واتە: مالیکی کوڕی دینار گەورە صاڵحی شاری بەسرە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ڕوو دەکاتە هاوڕێکانی و خۆشەویستی مزگەوتیان تێدا دەڕوێنێت و دەفەرموێت: ئەی برا شیرینەکانم بەڕاستیمە کاتێ پێتان دەڵێم: ئەگەر میز بیهێشتایە هەرگیز لە مزگەوت نەدەچوومە دەرەوە.

خوشك وبرایانی صاڵحم بۆ ئەوەی کاروانی صاڵحان وەرت بگرن و لەگەڵ خۆیاندا بتبەن هەرکاتێ بویتە میوانی خوا و چویتە یەکێ لە ماڵەکانی دەخیلت بم جگە لە نوێژو قورئان خوێندن و زیکرکردن و ئامۆژگاری و وانەی بەسود یان بیرکردنەوەو بێ دەنگی– هیچ ووشەیەك لەکاروباری دنیای تێدا باس نەکەیت و چونکە دنیای دەرەوە مەجالی باشی تێدایە بۆ باسی دنیا و سیاسەت و کاروباری ولآت و کڕین و فرۆشتن، ئەوزاعی–ڕەحمەتی خوای لێ بێ– باسی پیاو صاڵحێك دەکات بزانین چۆن باسی دەکات؟

* عن عقبة بن علقمة قال: سمعت الأوزاعي –رحمه الله– يقول: كان عبدة –رحمه الله– اذا كان في المسجد لم يذكر شيئاً من أمر الدنيا).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/ ١٩٢).

٢ صفة الصفوة (٢/ ١٩٢).

واتە: عقبەی کوڕی عەلقەمە دەڵێ: گوێم لە زانای گەورەی شام ئەبو عەمری ئەوزاعی بوو دەربارەی- عبدە- خوا ناس و صاڵحی شاری دیمەشق دەیفەرموو: هەرکاتێك بچوایەتە ناو مزگەوتەوە ئیتر بەهیچ شێوەیەك شتی دنیایی باس نەدەکرد.

خوشکانی موسڵمانمان لە بواری خۆشەویستی مزگەوتدا پێشەنگ بوون و بەکردەوە وانەی ئەویندارێ ماڵی خوایان بە تازە صاڵحان وتۆتەوە:

* عن عبدالعزيز بن أبي الرواد قال: دخل قومٌ حجاج المكة ومعهم إمرأة تقول: أين بيت ربي؟ فيقول: الساعة ترينه، فلما راؤه قالوا: هذا بيت ربك أترينه؟فخرجت تشتد وتقول: بيت ربي! بيت ربي! حتى وضعت جبهتها على البيت، فوالله مارفعت الاّ ميتة).[1]

واتە: عبدالعزیزی کوڕی ئەبی ڕواد ئەڵێ: کۆمەڵێ حەجاج بەرەو شاری مەککەی پیرۆز کەوتنە ڕێو ئافرەتێکیان لەگەڵدابوو، هەموو جارێ ئەو ئافرەتە دەیپرسی لێیان: ماڵەکەی پەروەردگارم لەکوێ یە؟

ئەوانیش پێیان دەووت: هەر ئێستا دەیبینی پەلە مەکە!،کاتێ لەدورەوە مەککە دەرکەوت وتیان ئائەوە ماڵەکەی پەروەردگارتە ئایا دەیبینی؟! ئەویش لەخۆشیاندا بەتوندی بەرەو کەعبە ڕای دەکرد و کاتێ گەیشت پێی ڕوومەتی خۆی نووساند پێ یەوە و وەڵڵاهی سەری هەڵنەبڕی تا گیانی پاکی سپارد و مرد، هەزاران سڵاو بۆ گیانی پاکی ئەو خوشکە ئازیزە.

ئەی عاشقانی کاروانی صاڵحان چ کوڕن! چ کچ! ئەگەر ئەتانەوێت ببنە ئەندام لەناو کاروانەکەدا باوەك گەورە پیاو صاڵحی ئیسلام (ثابت البناني) بن! ئەزانن ئەو چی دەکرد دەگوێ بگرن بۆ ئەم ڕیوایەتە:

* قال حميد: كنا نأتي أنس بن مالك ومعنا ثابت بن مسلم فكلما مرّ بمسجد صلى فيه فكنا نأتي أنساً فيقول: اين ثابت؟ اين ثابت؟ ان ثابت دويبة اُحبها).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/٣٣٥).

٢ صفة الصفوة (٢/ ١٧٦).

واتە: حەمید دەڵێ: جار بەجار سەردانی ئەنەسی کوڕی مالیکمان دەکرد و ثابت البنانیشمان لەگەڵ خۆماندا دەبرد بۆلای و لەڕێگا بماندایە بەلای هەر مزگوتێکدا ئەولای دەدا و دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد و پاشان بەخێرایی خۆی دەگەیاندەوە پێمان، و جارێکیان ئەو بەو هۆیەوە جێماو ئێمە زووتر گەیشتینە خزمەت ئەنەس و ئەویش فەرمووی: ئەوە ثابت کوانێ؟ ئەوە ثابت کوانێ؟ ثابت کەسێکە من زۆرم خۆش دەوێت.

برایانم دەخیلتان بم بڕۆنە ڕیزی ئاوەدان کەران و ئامادەبووانی نوێژی جەماعەت چونکە ئەزانی خوای گەورە لەبەر ئەوان زەوی ژێراو ژوور ناکات دەگوێ بگرە بۆ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (ﷺ):

* عن انس بن مالك– رضى الله عنه– قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: يقول الله عزوجل انى لأهمُّ بأهل الارض عذاباً، فاذا نظرت الى عمار بيوتى والمتحابين فِيَّ، والمستغفرين بالأسحار صرفت عنهم، صرفت عنهم).[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك– خوای لێ ڕازی بێ– دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست دەیفەرموو: خوای عزوجل دەفەرموێت: من نیاز دەکەم دانیشتوانی سەر زەوی لەناو بەرم و سزایان بۆ داباریێنم، بەلاّم هەرکە دەڕوانم بۆ ئاوەدانکەرەوانی ماڵەکانمو ئەوانەی یەکتریان خۆش دەوێ لەبەر خاتری من، و ئەوانەشی کەلەکاتی سەحەردا داوای لێبوردنم لێ دەکەن ئیتر واز لەو نیازەم دەهێنم و وازیان لێ دێنم.

ئەی یاران وەرن با وابەستەی مزگەوتەکەی گەڕەکی خۆمان بین چونکە فریشتەکان وابەستە دەبن پێمانەوە، دەی با گوێ بگرین بۆ گەورە زانای تابعین سەعیدی کوڕی موسەیب بزانین چی دەڵێ؟!

---

١ الجامع لشعب الايمان (٥/ ٢٩٠).

* عن ابی حازم قال: قال سعيد بن المسيب-رحمه الله- : إن للمساجد أوتاداً من الناس وان لهم جلساء من الملائكة، فاذا فقدوهم سألوا عنهم، فان كانوا مرضى عادوهم، وان كانوا في حاجة أعانوهم).[1]

واتە: ئەبو حازم دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەییب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (مزگەوتەکان کۆمەڵی دۆست و وابەستەیان هەیە، و ئەوانیش کۆمەڵێ هاوڕێیان لەفریشتەکان هەیە، کە هەرکاتێ نەیەن بۆمزگەوت و دیار نەبن هەواڵیان ئەپرسن و ئەگەر بزانن نەخۆشن سەردانیان دەکەن و ئەگەر پێداویستیەکیان هەبێ بۆیان جێ بەجێ دەکەن).

ئێمە چۆن بۆناو کاروانە موبارەکەکەی صاڵحان دەشێین لە کاتێکدا کە هاوەڵان ئەگەر لە جێیەك بگەڕانایەتەوە یان لەکارێ ببونایەتەوە یەکەمین شوێن دەچوونە مزگەوتەوە و دوو ڕکات نوێژیان دەکرد، ئەی من وتۆ یەکسەر بۆ ماڵەکانی خۆمان ناگەڕێینەوە؟!!

* عن الشعبي قال: (كانو إذا فرغوا من شئ أتو المساجد)[2]

واتە: زانای پایەبەرز عامیری شەعەبی-ڕەحمەتی خوای لێ بێ- کە زانایەکی هەق بێژو شۆڕش گێڕ بوو دژی ستەمەکانی حەجاج، دەفەرموێت: هاوەڵان- خوایان لێ ڕازی بێ- ئەگەر لەکارێك ببونایەتەوە یەکەمین جێگا بۆی دەچوون مزگەوتەکان بوو.

بەتاریکی شەو ڕۆشتووی بۆ مزگەوت؟ و پێت هەڵکەوتبێت و سەر سمتت دابێت؟ دەی مژدەت لێ بێ ئەم فەرمودەیە ئەتگرێتەوە:

* عن انس بن مالك عن النبي (ﷺ) قال: بشّر المشّائين فى ظلم الليالي الى المساجد بالنور التام يوم القيامة).[3]

---

١ الجامع لشعب الايمان (٥/ ٢٩٣).

٢ الجامع لشعب الايمان (٥/ ٢٩٢).

٣ الحديث اخرج البيهقى فى السنن (٣/٦٣_٦٤). اسناده لابأس به.

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك– خـوای لـێ ڕازی بـێ– لەپێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: مژدە بدەن بەو کەسانەی کەلە تاریکایی شـەواندا بـەرەو ماڵەکانی خوا دەڕۆن بەدەستکەوتنی ڕووناکی زۆر تەواو لەڕۆژی قیامەتدا، کە ڕووناکی لەوێ دەستی کەس ناکەوێت ودانسقەیە.

برای موسڵمانم صالح بوون و وەرگرتن لە زانکۆی صاڵحان نمرەی زۆر بەرزی دەوێ، دەبێ هەموو هەمەو غەم و بـیرو هۆشمـان لـەلای مزگـەوت بـێ و مزگـەوت گـرنگ بێـت لەلامان، چونکە مزگەوت تاکە زانکۆیەکە بۆ بـەرزی و هەڵکـەوتنی مرۆڤـەکان لەژیانـداو تاکـە مەئوایەکیـشە بـۆ گەیـشتن بـە ڕەزامەنـدی خـواو دەسـتکەوتنی بەهەشـت بۆیـە خواناسی مەزن–ڕەبیعی کوڕی خیثم– تەنها هەواڵی مزگەوتی پرسیوە لەمیوانەکانی:

* عن سفيان عن رجل من بني تميم عن ابيه قال: جالست الربيـع بـن خيـثم –رحمـه الله– سنين فما سألني عن شيئٍ مما فيه الناس الا انه قال له مـرةً: اُمـك حـيّ؟ كـم لكـم مسجد؟[1]

واتە: سوفیانی کوڕی عویەینە لـە پیـاوێکی هـۆزی بـەنی تەمیمـەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵێ: چەند ساڵێك لەخزمەت ربیعی کوڕی خەیسەمدا بووم، بـەهیچ جـۆرێ دەربـارەی کاروباری ناو خەڵکی هیچی لێ نەپرسیوم، مەگەر تەنها جارێك فەرمووی: دایکت ماوە؟ شارەکەتان چەند مزگەوتی تێدایە؟

کاروانی صاڵحان ئەو کەسانە وەرناگرێت کە (پیربـوون و بەسـالا چـوون) وایـان لـێ بکات هاتوو چۆی مزگـەوت کـەم بکەنـەوە و زانـاو خوانـاس– سـوەیدی کـوڕی غەفڵـە دەرسێکی قورسمان لەم بارەیەوە دادەدات:

* عن الوليد بن علي عن ابيه قال: كان سويد بن غفلة –رحمه الله– يؤمنـا فـى شـهر رمضان فى القيام وقد اتى عليه عشرون ومائة سنة).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/ ٤٠).

٢ صفة الصفوة (٢/ ١٣).

واتە: وەلیدی کوڕی عەلی لەباوکی یەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: سوەیدی کوڕی غەفلە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پیر بوو بوو تەمەنی گەیشتبووە(١٢٠) ساڵ کەچی هاتوو چۆی مزگەوتی واز لێ نەهێنا بوو لەڕەمەزانداو لەنوێژی تەراویح دا پیش نوێژی بۆ دەکردین.

ئەگەر مرۆڤ بەتەنها سەردانی مزگەوت بکات و لەوێ بواری باشی دەبێت بۆ زیاتر نوێژکردن و قورئان خوێندن و زیکرو یادکردنی پەروەردگار، بەڵام ئەگەر بەدوو دوو سێ سێ و زیاتر بچینە مزگەوت پێکەوە قسە دەکەن و قورئان خوێندن و زیکرو فکریان لەبیر نامێنێ و ئەم وانەیەش پیاو صالْح و زانای ئیسلام (ضرار ی کوڕی حوڕە) پێمان دەبەخشێت:

* عن عبدالله بن الاجلح قال: كان ضرار بن حرّة– رحمه الله– يقول لنا يوم الجمعة، لاتجيئونى جماعة ولكن يجئ الرجل وحده فانكم اذا اجمعتم تحدثتم، واذا كان الرجل وحده لم يخل ان يدرس جزأه أو يذكر ربه).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی ئەجلەح دەڵێ: ضراری حورڕەم–ڕەحمەتی خوای لێ بێ– کاتێ لەڕۆژی جومعەکاندا سەردانمان دەکرد پێی دەفەرموویین: پێم خۆشە بەکۆمەڵ نەیەن بۆ سەردانم بەڵکو خۆزگە یەك یەك دەهاتن بۆلام بۆ مزگەوت چونکە ئەگەر بەکۆمەڵ بێن لەناویەکا قسە دەکەن بەڵام ئەگەر یەك یەك بێن ئەوە باشترە چونکە بواری خەتم کردن و زیکر کردنی زیاترتان هەیە.

بەسە بۆ گەورەیی مزگەوت و خۆشویستنی کە هەرکەسێ مزگەوتێك دروست کات خوای گەورە لە بەهەشتدا خانوویەکی شاهانەی بۆ دروست دەکات،

* عن عثمان عن النبي (ﷺ) قال: (من بنى لله مسجداً بنى الله له بيتاً في الجنة).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/ ٧٥).

٢ رواه مسلم فى صحيحه (٣/ ٢٢٨٨).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێ مزگەوتێك دروست بکات لەبەر خوا، خوایش لەبەهەشتدا کۆشکێکی بۆ دروست دەکات).

برای صاڵحم- خوا صاڵحت کات- دەخیل سەد دەخیل کە چویتە مزگەوت جۆرێ لە بەندایەتی ئەنجام بدە ئەگەر تاقەتی ئەوەت نی یە عیبادەت بکەیت هەق وایە ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکرێت و ئەمەش پیاو صاڵحی بەسرە پێمان دەڵێت:

* دخل الحسن البصري - رحمه الله- المسجد فقعد الى جنب حلقة يتكلمون، فانصت لحديثهم، ثم قال: هؤلاء قوم ملّوا العبادة، وجددوا الكلام أهون عليهم وقل ورعهم فتكلموا).[1]

واتە: زاناو پیاو صاڵحی مەزنی بەسرە حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چوو بۆ مزگەوت و لەپاڵ کۆمەڵێ کەسدا دانیشت کە هەڵقەیەکیان دروست کردبوو لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد، گوێ ی بۆ شل کردن، و پاشان فەرمووی: ئا ئەمانە لە عیبادەت کردن و خواناسی بێتاقەت بوون، و وایان لێ هاتووە قسەی دنیایی لە عیبادەت ئاسانترە لەلایان و وەرع و لەخوا ترسانیان کەم بۆتەوە بۆیە وا قسە دەکەن.

هاوەڵانی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە سەرمەشقی صاڵحانی ئوممەتەکەمانن هەرکاتێ بەڵاو پێشهاتەی خراپیان بەدی کردبێت وەك هەوری ڕەش، ڕەشە بای توند، هەورە بروسکە یان زەمین لەرزە یان ئاگرپژێن یان لافاو یان هەر شتێکی تر لەم شێوانە کە بۆنی تورە بون و خەشمی پەروەردگاریان لێ دێت..

هاوەڵان زۆر ترساون خێرا تاکە پەنایان ماڵەکانی خوا بوو، خۆیان دەگەیاندە مزگەوتەکان و تەوبەو داوای لێخۆشبوونیان لەخوا دەکرد و ئەمەش چەند نموونەیەکە سەرەتا سەرمەشقمان ئەنەسی کوڕی مالیك:

* قال عبيدالله بن النضر حدثني أبي: انها كانت ظلمه على عهد أنس حتى كان النهار مثل الليل قال: فأتيته بعد ما آنجلت، فقلت يا أبا حمزة، هل كان يصبكم مثل هذا

---

[1] معالم فى السلوك وتزكية النفوس، د. عبدالعزيز بن محمد العبد.

على عهد رسول الله؟ قال: معاذ الله، ان كانت الريح لنشتد فنبتدر الى المسجد أينا يدخله اولاً).[1]

واتە: عبيدالله ی کوڕی نەزر دەڵێ: لەسەردەمی ئەنەسی کوڕی مالیکدا–خوای لێ ڕازی بێ– دنیا تاریك بوو ڕۆژی ڕۆشن وەك شەوی تاریکی لێ هات، و پاش ئەوەی دنیا ڕوناك بوویەوە چوومە خزمەت ئەنەس و لێم پرسی: ئەی باوکی حەمزە، لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) شتی وا ڕووی داوە لێتان؟ ئەویش فەرموی: پەنا بەخوا، لەو سەردەمەدا ئەگەر بایەکی توندیش هەڵی بکردایە هەموو بەپەلە بەرەو مزگەوت ڕامان دەکرد تا بزانین کاممان زوتر خۆی دەکات بەمزگەوتدا.

لەسەردەمی زانای خواناس و صالح عەلی کوڕی بەکار–ڕەحمەتی خوای لێ بێ– هەورێکی ڕەش تێپەڕی بزانین چی فەرمووە لەو بارەیەوە:

* قال ابو زكريا الخلقاني الهمداني: كنا عند على بن بكار –رحمه الله– فمرت سحابة، فسألته عن شئ فقال لي: اُسكت حتى تجوز هذه السحابة! اما تخشى ان يكون فيها حجارة نرمي بها؟[2]

واتە: ئەبو زەکەریای هەمەدانی دەڵێ: لەخزمەت علی کوڕی بەکار دا بووین و لەوکاتەدا هەورێکی ڕەش تێپەڕی و منیش پرسیارێکی فیقهیم لێ کرد و ئەویش پێی ووتم: بێ دەنگ بە تا ئەم هەورە تێ دەپەڕێ ئەی ناترسی ئەم هەورە بەردی پێ بێ و بباریێت بەسەرماندا.

---

١ اخرجه ابو داود فى الصلاة (١/٧٠٦) ژ(١١٩٦) الجامع لشعب الايمان (٢/٥٦٥).

٢ اخرجه ابو نعيم فى الحلية (١٠/ ٧) الجامع لشعب الايمان (٢/ ٥٦٦)

# دووەم

## صالْحان نوێژی جماعەت بەهیچ شتێك ناگۆڕنەوە:

خـوای گـەورە و عزوجـل پێـنج کـاتی دانـاوە لەشـەوو ڕۆژدا کەتیایـدا موسـلْمان مواجەهەی پەروەردگار بکات و قسەو ڕازی دڵی بۆ بدرکێنێ و خوایش بـەجوانی گـوێی بۆ دەگرێت و دەیکاتە دۆستی خۆی.

بەلاّم خوای عزوجل وای پـێ خۆشـە کەئـەم دیمەنـە گـەورەو قەشـەنگە لەماڵـەکانی خۆیدا ڕوویدات، وەك چۆن پاشا گەورەکانی دنیـا حـەز بـەوە دەکـەن لـە کۆشـکەکانی خۆیاندا سەردان بکرێن و ببینرێن- ولله المثل الأعلى-.

پیاوانی خواو صالْحان نوێژیان لەماڵەوە و لەسەر بەرماڵ ناکەن بـەڵکو لەمزگـەوت و لەگەڵ براکانیان بەدەستە جەمعی دەچنە خزمەت خوای خۆشەویست و ڕازی دڵیانی بۆ دەدرکێنن..

فەرموون خوشك و برایانی عاشقانی ئەم کاروانە مەزنـە بـابزانین گـەورە زانـاو پیـاو چاکی ئیسلام سوفیانی سەوری-ڕەحمەتی خوای لێ بێ- چۆن لەم ئایەتە قورئانی یە گەیشتووە و چۆنی لێك داوەتەوە:

* قـال الله سـبحانه وتعـالى في كتابـه العزيـز: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾،[1] قال سفيان الثوري -رحمـه الله- كـانوا يـشترون ويبيعـون ولا يـدعون الـصلوات المكتوبات فی الجماعات).[2]

واتە: لـە تەفـسیری ئـەو ئایەتـە پـیرۆزەی قورئانـدا کـە دەفـەرموێت: (پیـاوانێکی ڕاستەقینەی خوا هەن کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لە ذیکرو یـادی خوایـان ناکـات).

---

١ سورة نور (٣٧).

٢ الجامع لشعب الايمان (٥/ ٢٧٨).

سوفیانی سەوری –ڕەحمەتی خوای لێ بێ– دەفەرموێت: کڕین و فرۆشتن دەکەن بەڵام هەرگیز واز لە نوێژەکانیان ناهێنن و لەمزگەوتەکانداو بە جەماعەت ئەنجامی دەدەن.

ئازیزانم کێ هەیە پێی بڵێی فلان کارم بۆ ئەنجام بدە لەماڵەکەی خۆتدا هەزار دینارت پێ دەدەم، بەڵام ئەگەر لەماڵەکەی مندا ئەنجامی بدەیت (٢٧) هەزار دینارت پێ دەدەم! ! ئایا ژیرمەندو تێگەیشتوان کامیان هەڵدەبژێرن ئەمەش پێغەمبەرمان (ﷺ) لە فەرمودەیەکی صەحیحدا ڕوونی کردۆتەوە:

* عن ابن عمر –رضی الله عنه– ان رسول الله (ﷺ) قال: (صلاة الجماعة افضل من صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی عمر– خوای لێ ڕازی بێ– لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: نوێژێك لەمزگەوتدا و بەجەماعەت ئەنجام بدرێت (٢٧) نمرە لەوە بەرزترە کە بەتەنها ئەنجام بدرێت.

نوێژی جەماعەت یەکێکە لەو پێنج شتە گەورەیەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) (خوایان لێ ڕازی بێ) هەرگیز وازیان لێ نەهێناوە و بەڵکو لە هەموو کات و وەزعێکدا دەستیان پێوە گرتووە– دەبێ ئەو (٥) شتە کامانە بن:

* قال الامام الأوزاعي –رحمه الله– كان يقال، خمس كان عليها اصحاب رسول الله (ﷺ) والتابعون لهم باحسان: لزوم الجماعة، واتباع السنة، وعمارة المسجد وتلاوة القرآن، والجهاد في سبيل الله).[2]

واتە: پێشەوا ئەوزاعی– زانای مەزنی خاوەن مەزهەبی فیقهی تایبەت– دەفەرموێت: پێنج ڕەوشت هەیە هاوەڵان–خوایان لێ ڕازی بێ– لەگەڵ تابعین دا

١ متفق عليه، فقه السنة (١/ ١٩٢).

٢ الجامع لشعب الايمان (٥/ ٢٨٢).

هـەرگیز وازیان لـیٚ نـەهێناون، یەکـەم: نوێـژەکان بەجەماعـەت، دووەم: شـوێنکەتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) سێیەم: ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکان، چوارەم: قورئـان دەورکردنەوە، پێنجەم: جیهادو جەنگ لەپێناوی خوادا.

هەرگیز لەکاروانی صالّحاندا جێگات نابێتەوە و ناوت تۆمار ناکەن ئەگەر نوێـژەکانت بەکۆمەڵ و لەمزگەوتدا ئەنجام نەدەیت، ئەگەر هەر نەشتتوانی دەبیٚ بە پێی توانـا پـیٚ لەمزگـەوت نـەبڕیت، ئـەگینا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئـاگر دەنـیٚ بەماڵەکەتـەوەو دەیسوتێنیٚ پەنا بەخواو خانووەکەت بەسەردا دەتەپێنیٚ!!

* عن ابی هریرة –رضی الله عنه– ان رسول الله (ﷺ) قال: والذی نفسی بیـده لقـد هممت ان آمر بحطب فیحتطب، ثم آمر رجـلاً فیؤم النـاس ثـم اخـالف الی رجـال فـاحرق علیهم بیوتهم).[١]

واتـە: ئـەبو هـورەیرە–خـوای لـیٚ ڕازی بـیٚ– دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـوا فەرموویـەتی: سـوێندم بـەو کەسـەی گیـانی منـی بەدەسـتە، هـاتووە بەخەیاڵمـدا کـە فەرمان دەریکەم بڕۆن دارببڕن و بیهێنن و منیش کەسێك ڕاسپێرم بەرنوێـژی خـەڵکی بکات و خۆیشم بڕۆم– ئەو دارانە بەرم– مـاڵی ئـەو کەسـانە بـسوتێنم بەسـەریاندا کـە لەنوێژی کۆمەڵ دوا دەکەون.

براو خوشکەکانم دەخیلتـان بم تـا گـەنجن و لـەش سـاغن و مـەجالتان زۆرە نوێـژی جەماعەتی زۆر بکەن چونکە پیری و نەخۆشی و بیٚ مەجالی لەو دنیا ئاڵە پڕ لەنەشوەی ئیمانیەتان دەکات و توانای هاتوو چۆی مزگەوتتان نامێنیٚ....

سـەیری خوانـاس و صـاڵحی بەسـرە– شـەدادی مـەجزوم– بکـەن بـزانن لـەکاتی نەخۆشی گولیدا چ داخێکی دووری مزگەوتی هەیە؟!

* عن مخلد بن الحسین قال: کان بالبصرة رجل یقال له شداد المجذوم –رحمـه الله– أصابه الجذام فتقطع فدخل علیـه عـواده مـن اصـحاب الحسن البـصری– فقـال: کیـف

---

١ متفق علیه فقه السنه(١/ ١٩٣).

نجدك؟ قال بخير، اما ما فاتنى جزئي من الليل وقد سقطت ومابى الا انى لا اقدر ان أحضر صلاة الجماعة).[١]

واتە: موخەلەدی کوڕی حوسەین دەڵێ: پیاوێك هەبوو لە بەسرە-پێیان دەووت- شەدادی مەجزوم دووچاری نەخۆشی پێست بووە-گولی- ئیتر نەیتوانی تێکەڵی خەڵکی بکات..

کاتێ حەسەنی بەسری و هاوڕێکانی چوون بۆ سەردانی و پیان ووت: ئێستا حاڵت چۆنە؟ وتی: زۆر باشم، بەڵام خەفەتی ئەوەمە کە قورئان خوێندنی شەوانم لەدەست دەرچووەو ئاواش لەجێگەدا کەوتووم و شوکر ئازارم نی یە بەلأم بەداخی ئەوەم کە ناتوانم ئامادەی نوێژی جەماعەت ببم.

کاروانی صالحان کۆمەڵێ موسڵمانی وای تێدایە، نەنەخۆشی و نەپیری و تەمەن و بەسالأچون ڕێیان لێ ناگرێت لە ئامادەبوونی بەردەوامی نوێژەکان لەمزگەوتداو بەجەماعەت و لەم بوارەشدا گەورە سەرمەشقمان- ڕەبیعی کوڕی خەیسەم دەرسێکی کاریگەرمان دادەدات تا لە نوێژی کۆمەڵ خۆمان دوانەخەین‌و تەمەڵی نەکەین:

* عن أبي حيان عن أبيه قال: كان الربيع بن خيثم يقاد الى الصلاة وكان به الفالج، فقيل له: يا ابا يزيد لقد رخص لك فى ذلك، قال: اني أسمع حيّ على الصلاة، حيّ على الصلاة، فان استطعتم ان تأتوها ولو حبواً ولو زحفاً).[٢]

واتە: ئەبو حەیان لەباوکی یەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕەبیعی کوڕی خەیسەم ئیفلیج بوو بوو دووکەس دەچوونە ژێر باڵی و دەیان هێنا بۆ مزگەوت بۆ نوێژی کۆمەڵ! هاوڕێکانی پییان ووت: ئەی باوکی یەزید تۆ خوا ڕێگەی داویت لەماڵەوە نوێژ

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٤٥).

٢ الجامع لشعب الايمان (٥/ ٢٨١).

بکەیت؟! ئەویش دەیفەرموو: ئاخر خۆ ڕاستەکەن بەلاّم من گوێم لە بانگ بێژە دەڵێ: (وەرن بۆ نوێژ وەرن بۆ نوێژ)! و ئەگەر لەهەر کوێوە گوێتان لێ بوو بڕۆن بەدەمی یەوە ئیتر با لەسەر ئەژنۆکانتان بڕۆن یان بە گاگۆڵکێش بووە.

دەخیلت بم- برای موسڵمانم- لە نوێژی جەماعەت خۆت دوامەخە تا لێ دەبنەوە ئەوجا بڕۆی، چونکە دڵنیابە بەچەندێ لە جەماعەت دوا بکەویت ئەوەندە لە کاروانی صالّحان دوا دەکەویت و نایانگریتەوە ئەوان زۆر سەریع و خێران ئاگاداربە:

* اخرج الطبراني وابن خزيمة في صحيحه عن ابن عمر -رضي الله عنه- قال: كنا اذا فقدنا الرجل من الفجر والعشاء اسأنا به الظنّ).[1]

واتە: یەکێ لە- عبدالله- مەزنەکانی ئیسلام- عبدالله کوڕی عمر- خوای لێ ڕازی بێ دەفەرموێت: ئێمە هەرکەسێك لەنوێژی عیشاو بەیانیان دیار نەبوایە گومانی خراپمان پێ دەبرد- کە نەوەك بووبێت بە دوو ڕوو.

-سبحان الله- براکانم! خوشکەکانم- لەوانەیە باوەڕنەکەن ئەگەر بڵێم- عامری کوڕی عبدالله ی کوڕی زوبێر خوای لێ ڕازی بێ لەسەرەمەرگدا هاواری کرد بم بەن بۆ نوێژی کۆمەڵ!! ئایا بردیان؟

* عن مصعب بن عبدالله قال: سمع عامر بن عبدالله بن الزبير المؤذن وهو يجود بنفسه، ومنزله قريب من المسجد فقال: خذوا بيدي! فقيل له: إنك عليل فقال: أسمع داعي الله فلا اجيبه؟! فاخذوا بيده فدخل في صلاة المغرب مع الأمام ركعة ثم مات).[2]

واتە: موسعەبی کوڕی عبدالله ئەڵێ: عامری کوڕەزای زوبێری کوڕی عەوام -خوای لێ ڕازی بێ- لەسەرەمەرگدا بوو گیانی دەدا، و دراوسێ ی مزگەوت بوو، لەوکاتەدا گوێی لەبانگ بوو ووتی: هەڵم سێننەوەو دەستم بگرن بابڕۆم بۆ نوێژی جەماعەت!!

---

١ حياة الصحابه، كاند هلوي (٣/ ٤٣٥).

٢ صفه الصفوة (٢/ ٩٢).

ووتیان: بۆ خاتری خوا تۆ زۆر نەخۆشی! و ئەویش فەرمووی: یانی گوێم لە بانگ وێژی خوا بێتو نەچم بەدەمی یەوە؟! ئەوانیش ناچار بوون چوونە ژێر باڵی و بردیان بۆ مزگەوت و لە نوێژی مەغریبدا بوو لەڕیزەکاندا وەستاندیان و یەك ڕکاتی لەگەڵ ئیمامدا خوێندو پاشان گیانی بەخوای خۆی سپارد هەزاران ڕەحمەت بۆ گیانی پاکت ئەی کوڕەزا خواناسەکەی زوبێری کوڕی عەوام.

ئەمەش ئەعمەشە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) تەمەنی لە(٧٠) تێپەڕیوە کەچی تا ئەو تەمەنە(الله اکبر)ی ئیمامی لەدەست نەچووەو یەك نوێژی نەگێڕاوەتەوە:

* عن وكيع قال: كان الاعمش–رحمه الله– قريباً من سبعين سنة فما رأيته يقضي ركعة).

واتە: وەکیع –مامۆستا مەزنەکەی ئیمامی شافعی– دەڵێ: ئەعمەش–ڕەحمەتی خوای لێ بێ– تەمەنی لە حەفتا نزیك بوو بوویەوە– ئێستایش نەمدی نوێژێکی بەجەماعەت بفەوتێ و دوای بەتەنها بیکاتەوە.

ئەمەش عمری کوڕی خطابە–خوای لێ ڕازی بێ– پرۆگرامی ژیانی خواناسمان بۆ دیاری دەکات، بەوەی کە پێش ئەوەی ببیت بەکەسێکی شەو نوێژ گەر هەوڵ بدەی نوێژەکانت بەکۆمەڵ و لەمزگەوتدا ئەنجام بدەیت:

* قالت الشفاء بنت عبدالله: دخل عليّ بيتي عمر بن الخطاب –رضى الله عنه– فوجد عندى رجلين نائمتين، فقال: ماشأن هذين؟ وماشهدا معنا الصلاة؟ قلت: يا أمير المؤمنين! صليا مع الناس– وكان ذلك فى رمضان– فلم يزالا يصليان حتى أصبحا! وصليا الصبح وناما، فقال عمر: لأن اُصليَّ الصبح فى جماعة احبّ الىَّ من ان اُصليّ ليلة حتى أصبح)[1]

واتە: شیفای کچی عبداللە–بەدایکی سولەیمان– ناسرابوو ژنێکی هۆزی عەدی بوو، دەڵێ: عمری کوڕی خطاب–خوای لێ ڕازی بێ– لەدوای نوێژی بەیانی هات بۆماڵمان و

١ كنز العمال (٤/ ٢٤٣) لە کتێبی: حياة الصحابة، كاند هلوى (٣/ ٤٣٦) وەرگیراوە.

بینـی دووکـەس خـەوتوون! فـەرمووی: ئەمـە چـی یـە ئـەم دوانـە خـەوتوون؟ نوێـژی بەیانیان بەجەماعەت نەکردوە لەگەڵماندا؟ دەڵێ ووتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران! شـەو لەگـەڵ خـەڵکی نوێـژو تـەراویحیان کـردوەو مانـدو بـوون بۆیـە خۆیـان نوێـژیان کـردو خەوتن!

عمر فەرمووی: دەی من ئەگەر نوێژی بـەیانی لەمزگەوتـداو بەجەماعـەت بیکـەم زۆر لـەوە پـێم خۆشـترە کـە هـەموو شـەوەکە تـا بـەیانی شـەو نوێـژ بکـەم- واتـە نوێـژی جەماعەتی بەیانیم بفەوتێ.

باوکانی خۆشەویست- خوای گەورە بتانخاتە ناو کاروانە پیرۆزەکەی صالحانەوە- هەر بەخۆتەوە مەوەستەو هەموو کوڕەکانت لەگـەڵ خۆتـدا بـەرە بـۆ نوێـژی کۆمـەڵ و ئەگەر یەکێکتان تەمەڵی کرد یان بەشـتێکەوە خـۆی خـەریك کـرد لێـی قبـوڵ نەکـەیت چونکە لەڕیزی صالحان دەکرێتە دەرەوە.

ئەم وانەیەش عبدالعزیزی کـوڕی مـەروان- بـاوکی عمـری کـوڕی عبـدالعزیز- دامـان دەدات.. با پەندی لێ وەربگرین توخوا:

* حدث یوماً ان تأخر عمر بن عبـدالعزیز عـن الـصلاة مـع الجماعـة فقـال: صـالح بـن کیسان: ما یشغلك؟ قال: کـان مرجلتـی تـسکن شـعري، فقـال: بلـغ منـك حبـك تـسکین شعرك ان تؤثره علی الصلاة؟! فکتب الی عبدالعزیز یذکر ذلـك، فبعـث ابـوه رسـولا فلـم یکلمه حتی حلق رأسه).[1]

واتـە: عمـری کـوڕی عبـدالعزیز -منـداڵ بـوو- لەیـەکێ لـە نوێژەکانـدا لەجەماعـەت دواکەوت ئەوەش بەهۆی قژداهێنەرەکەیەوە بوو دوای خـست، کـاتێ صـالح ی کـوڕی کیسانی مامۆستای لێـی پرسـی: چـی دوای خـستی لەنوێـژی جەماعـەت؟ عمـر ووتـی: قژداهێنەرەکەم قژی چاك دەکردم لەوکاتەدا، صالح پێی فـەرموو: یـانی قـژ داهێنـانێك خۆشەویست تر بوو لەلات لە نوێژی جەماعەت!! و بۆ ئـەو مەبەسـتە نامـەی نـارد بـۆ

---

١ عمر بن عبدالعزیز، الدکتور الصّلابی (لا: ١٨).

باوکی و ئاگاداری کرد، ئەویش خێرا کەسێکی ناردو پـێ ی ووت هـیچ قسە مەکە تا سەری عمری کوڕم سفر نەکەیت!

ئەی شوێن کەوتوانی محمد (ﷺ) ئەگەر خواتان خۆش دەوێ و چاوەڕوانی کانیاو و باخەکانی بەهەشتن، بیانوو مەهێننەوە بڵێی ناپەرژێ! خەو بەرم نادا! دەوامم هەیە! میوانم زۆرە! یان نەخۆشم! یان چاوم کز بووە! یان.......... بەڵام سەیری عبدالله ی کوڕی ام مکتوم ی نابینا بکە:

* عن عمرو بن أبی مکتوم –رضی الله عنه– قال: قلت یا رسول الله! انا ضریر شاسع الدار ولی قائد لایلائمني، تجد لي رخصة ان اصلی فی بیتي؟ قال: اتسمع النداء؟ قال: نعم، قال: ما أجد لك رخصة.[1]

واتە: عەمری کوڕی ابی مەکتوم ی نابینا–خوای لێ ڕازی بێ– دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا! من کەسێکی نابینام و ماڵەکەیشم دوورە لەمزگەوتەوە و کەسێکی وایشم نی یە دەستم بگرێت، ئایا بۆم هەیە لەماڵەکەی خۆمدا نوێژەکانم بکەم؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا گوێت لە بانگە؟ ووتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی شک نابەم ڕێگات پێ بدرێت بۆ نەهاتن بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەت.

خوشکان برایان دەخیل سەد دەخیل ئاگات لە دڵە پڕ لە ئیمانەکەت بێت با دووڕوویی و نیفاق ڕووی تێ نەکات فەرموو لەگەڵ هەندێ لەو نیشانانەدا کە پێشەوای گرۆی بەشەر ڕوونی کردۆتەوە:

* عن ابی هریرة رضی الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): (ان للمنافقین علامات یعرفون بها: تحیتهم لعنة، وطعامهم نهبة، وغنیمتهم غلول، ولا یقربون المساجد الاّ هجرا ولا الصلاة الاّ دبرا، ولا یألفون ولا یؤلفون خشب باللیل، سُخبٌ بالنهار).[2]

---

١ رواه الحاکم واحمد والبیهقی وصححه ابن خزیمة (١٤٨٠).

٢ الجامع لشعب الایمان (٥/ ٢٩٩) اخرج أحمد فی المسند (٢/ ٢٩٣).

واتـە: پێغەمبـەرمان (ﷺ) ئاگادارمـان دەكـات لـە هەنـدێ نیـشانەی دووڕووان كـە ئەمانەن: سلاوكردنیشیان جنێوو نەفرەتە، خواردنیـان داگـیراو و حەرامـە، غەنیمـەیان ئەو شتانەیە لەجەنگەكاندا دەیشارنەوە، نزیكی مزگەوتەكان نابنـەوە مەگـەر بەكـەمی، نزیكی نوێژی جەماعەت نابنەوە مەگەر پاش سەلام دانـەوەی ئیمـام، نایـانكرێ لەگـەڵ خەڵكیـداو خـەڵكیش لەگـەڵیان نـایكرێ، بەشـەو تـا بـەیانی دەخـەون وەك تەختـە ڕادەكشێن، و لە ڕۆژیشدا وەك كەر دەزەڕێنن).

بەسە بۆ ئەو كەسانەی خوای گەورە چاكیان بۆ دەكات و نوێژەكانیان بەجەماعـەت دەكاتە نەسیب كە بێ ترس ئەتوانی فەتوا بدەیت كە ئیمانیان دامەزراوە و دڵیـان پـڕە لە باوەڕ:

* عن ابی سعید الخدري –رضی الله عنه– عن رسول الله (ﷺ) قال: إذا رأیتم الرَّجل یعتاد المساجد فاشهدوا له بالایمان، فان الله تعالی یقول: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾.[١]

واتە: ئەبو سەعیدی خودری –خـوای لـێ ڕازی بـێ– لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: هەركاتێ كەسێكتان بینی بەبـەردەوامی واتـە هـەر پێـنج نوێژە كەو لەهەموو سەردەم و كەش و هەواو زروفێكدا– دەهات بۆ مزگەوت بۆ ئەنجام دانـی نوێـژەكانی لەمزگەوتـداو بەجەماعـەت ئـەوە شـایەتی بـۆ بـدەن كەكەسـێكی باوەڕدارەو ئەوەنیـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: تـەنها ئـەو كەسـانەی ماڵـەكانی خـوا ئاوەدان دەكەنەوە ئەو كەسانەن كـە بـاوەڕی ڕاسـتەقینەو جـێگیری نـاو دڵیـان هەیـە بەخوای گەورەو هاتنی ڕۆژی قیامەت.

---

١ اخرج ابن خزیمة فی صحیحه (٢/ ٣٧٩) الجامع لشعب الایمان (٥/ ٢٨٧).

# بەشی شەشەم

# زانـا صالّحەكان ئابەم جۆرەن:

١- عیلم وەردەگرن بۆ كردەوە پیّكردن:

٢- لە زانستدا تیّربوونیان بۆ نیە:

٣- شەو نویّژیان بەردەوام بووە:

٤- هەست بە گرنگی كات دەكەن:

٥- ڕیّز دادەنیّن بۆ زاناكانیان:

٦- گوناه ناكەن:

٧- نابنە داردەستو مفتی كاربەدەستەكان:

٨- لە چلە پۆپەی نەرمو نیانیدان:

٩- هەمیشە دەم بە زیكرن:

١٠- بە لیّشاو مالّو سامان دەبەخشنەوە:

١١- لەغیرەتو بویّریدا كەسیان پیّ ناگات:

١٢- كارەكەیان زۆر بە گەورە سەیر دەكەن:

برای صالحم، خوشکی صالیحەم، ئەگەر بەردەوام دەخوێنیتەوەو وانەی شەرعی دەخوێنیت بۆ ئەوەی ببیت بە شارەزایەکی باش لەم ئاینە پاکەدا، کارێکی زۆر مەزنو گەورەیە.

بەڵام لە بەرنامەی ئیسلامدا زانابوون گرنگ نیە بە ئەندازەی ئەوەی کە زانایەکی صالحو خواناس بیت، ئەو کاتە گوێ بۆ وتەکانت دەگیرێتو لە لای موسڵمانان خۆشەویست دەبیتو پاشتر دەبیتە سەرمەشقو چاوت لێ دەکرێت لە هەموو هەڵسوکەوتێکتدا تەنانەت لە پێکەنینو ڕۆیشتنو هاتنو هەڵسانو دانیشتنتدا.

دەی فەرموو با پێکەوە سەردانێکی دیوەخانی زانا صالحەکان بکەینو بزانین چۆن بوونو چۆن پەرژینی زانستو زانیاریان کردووە بە کۆمەڵێ ڕەوشتی جوانو ناوازەو بە ڕاستی سیفەتی (العالم الرباني)یان بە بالای خۆیاندا بڕیبوو لەوانە:

# یەکەم

## عیلم وەردەگرن بۆ کردەوە پێکردن:

* عن جعفر ان مالك بن دينـار (رحمـه الله) قـال: إنّ العـالم اذا لم يعمـل بعلمـه زلـت موعظته عن القلوب كما تزل القطرة عن الصفا).[1]

واتە: جەعفەر دەڵێت: مالیکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفـەرمووێت: زانا ئەگەر کردەوە نەکات بەو عیلمەی پێیەتی ئەوا هەموو ئامۆژگاریو وتارو نووسینو شیعرەکانی ناڕواتە ناو دڵەکانەوەو کار لە کەس ناکات وەك چۆن تکەی ئـاو بەسەر بەردی سافەوە ناوەستێتو دەتکێتە خوارەوە.

برای زانام، ئەگەر یەکێ هات بۆ ماڵتان بۆ سەردانی کردنتو ئاسەواری قیامەتی بە ماڵو حاڵتەوە نەدی ئەوە پەنا بە خوا زانستو عیلمەکەت بە زایە داوەو ئەم وانەیەش لە لای مالیك بخوێنە زۆر باشە:

* قال مالك بن دينار – رحمه الله – انما العـالم الـذي اذا أتيتـه في بيتـه فلـم تجـده، قص عليك بيته: رأيت حصيرة للـصلاة ومـصحفة ومطهرتـه في جانـب البيـت، تـرى أثـر الآخرة.[2]

واتە: زانا خواناسەکەی شاری بەسرە مالیکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: زانای ڕاستەقینە ئەو زانایەیە کە ئەگەر ڕێت کەوتـە ماڵەکـەیو لـە مـاڵ نـەبوو، تـۆش چـاوێکت بـە ماڵەکەیـدا گێـڕاو بـەرماڵێکی داخـراوت بینـیو قورئانێـكو

---

١ صفة الصفوة (٢/١٩٠).

٢ صفة الصفوة (٢/١٩٢).

مەسینەی دەستنوێژگرتنەکەی لە گۆشەیەکی ماڵەکەیدا دانرابوو ئەوە ئاسەوارو شوێنەواری قیامەت لەو ماڵەدا بەدی دەکەیت.

زانای خواناس پێش ئەوەی قسەو ئامۆژگاریت بە وتەکانی بۆ بکات بە کردەوە جوانەکانی چەندان دەرست دادەداتو ئەمەش زانایەکی خواناس بۆمان دەردەبڕێت:

* عن عبدالله بن بشير – رحمه الله – قال: ان الرجل ربما جلس الى أيوب السختياني –رحمه الله– فيكون لما يرى منه أشد اتباعاً منه لو سمع حديثه.[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی بەشیر دەڵێ: پیاو کاتێك لە حزوری زانای خواناس – مامۆستا ئەیوبی سەختیانی – دا دەبێت، ئەوەندەی لە هەڵسوکەوتو کردەوەکانیەوە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرێت زۆر زیاترە لەوەی کە لە قسەو گوفتارەکانیەوە وەری دەگرێت.

با سەرێك لە خەلیفەی دووەمی خواناسو زانا عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت) و لە نزیك مینبەرەکەیەوە گوێی بۆ بگرین بزانین چۆن وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە وتەیان پێچەوانەی کرداریانەو ناوێکی سەیری لێ ناون:

* اخرج البيهقي وابن النجار عن ابي عثمان النهدي قال: سمعت عمر بن الخطاب – رضي الله عنه – ويقول على المنبر: اياكم والمنافق العالم! قالوا: كيف يكون المنافق عالماً؟ قال: يتكلم بالحق ويعمل بالمنكر.[2]

واتە: ئەبو عوسمانی نەهدی دەڵێ: لە عومەری کوڕی خەتابم بیست – خوای لێ ڕازی بێت – لەسەر مینبەر وتاری دەداو دەیفەرموو: دەخیلتان بم دووربن لە دووڕووی زانا! ! پێیان وت: ئاخر چۆن مرۆڤی مونافیق زانا دەبێت؟ لە وەڵامدا فەرمووی: قسەی جوانو ڕاست دەکات بەڵام کردەوەی ناشیرینو گەن دەکات.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٩٨).

٢ حياة الصحابة – كاند هلوي (٤/٩١).

برای زانام ئەم کۆڵە زانستو زانیاریەی تۆ خوای گەورە پێی بەخشیویت! دەخیلت بم کارێ مەکە لێت بسەنێتەوە! ئەزانی بەچی لێت دەسەنێتەوە؟ دەی با سەرێك بدەین لە گەورە زاناکەی کوفەو یەکێ لە عبدالله مەزنەکانی ئیسلام بزانە چیت پێ دەڵێت:

* عن ابن مسعود – رضي الله عنه – قال: انّي لاحسب الرجل ينسى العلم كان تعلمه للخطيئة يعملها.[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: من وا دەزانم ئەو کەسەی کە عیلمو زانستی بیر دەچێتەوە لەبەر هیچ شتێك نیە تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە گوناهێکی ئەنجام داوە.

ئایا گوێت لە (ابن عباس) بووە کە باسی ئەوە دەکات هەندێ لە زانایان خواو فریشتەکانو صالحان خۆشیان دەوێن؟ دەبێ کام جۆرە زانایە بن:

* اخرج ابن عبدالبر في الجامع عن سفيان بن عيينة قال: بلغنا عن ابن عباس – رضي الله عنه – قال: لو ان حملة العلم اخذوه بحقه وما ينبغي، لاحبهم الله وملائكته والصالحون ولهابهم الناس، ولكن طلبوا به الدنيا فابغضعم الله وهانوا على الناس.[2]

واتە: سوفیانی کوڕی عویەینە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لە عبدالله ی کوڕی عەباسەوە پێمان گەیشتووە (خوای لێ ڕازی بێت) کە فەرموویەتی: هەڵگرانی عیلمو عیرفان ئەگەر مافی تەواویان لە وەرگرتنو کارپێکردنو بەخشینیدا پێ بدایە وەك ئەوەی پێویستە، ئەو کات خواو فریشتەکانیو صالحانی ئومەت خۆشی دەویستنو خەڵکە عامەکەش سامو هەیبەتیان لێ دەکردن، بەڵام عیلمیان بۆ دنیاخۆری بەدەست هێنا بۆیە لە لای خوا بێزراوو لە لای خەڵکیش بێ سامو هەیبەت بوون.

---

١ اخرجه ابو نعيم في الحلية (١/١٣١).

٢ حياة الصحابة – كاند هلوي (٤/٩٦).

ئەمەش ئـامۆزا شـیرینەکەی پێغەمبـەر (ﷺ)و زاوا نازدارەکەیـەتی (خـوای لێ ڕازی بێت) لە وتەیەکی کورتو پڕ لە ماناداا باسی ئەو زانایانە دەکات کە کـردەوە ناکـەن بـە زانستەکەیانو بەڵکو پێچەوانەشی دەکەن:

* قال علي – رضي الله عنه – (قصم ظهري رجلان: عالم متهتك وجاهل متنسك).[1]

واتـە: عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: دوو جـۆر لـە خەڵکی پشتی منیان شکاندووە: یەکەم: زانایـەکی سـنوور بـەزێنی گوناهکـەرو حـەرام خۆر! دووەم: نەزانو نەشارەزایەك بیەوێت بەندایەتیو خواناسی بکات!

واتە یەکەمیان کار بە زانستەکەی ناکات سوودی نیـە بـۆ خـۆیو دووەمـیش عیلمـی پێ نیەو نازانێ بە چ شێوەیەك خواناسی ڕاستەقینە ئـەنجام بـداتو دەکەوێتـە دەیـان ناشەرعیەوەو جۆرەها بیدعەوە.

ئەمەش ئەبو دەردایە هاوەڵە زاناکەی پێغەمبەرمان (ﷺ)و مامۆسـتای وڵاتـی شـام بزانین لە ڕۆژی قیامەتدا خەمی چیەتی؟ جگە لە خەمی کردەوە نەکردن بە عیلمەکانی:

* ان ابا الزهراوية قال: قال ابو درداء – رضي الله عنه – قال: اني لا أخشى ان يقال لي يوم القيامة: يا عويمر، ماذا علمت فيما جهلت؟ ولكن أخاف ان يقال لي: مـاذا عملـت فيما علمت؟!.[2]

واتە: ئەبو دەرداء (خـوای لێ ڕازی بێـت) مامۆسـتاو پەروەردەکـەری وڵاتـی مـەزنی شام دەیەوێت تێمان بگەیەنێت کـە زانینـی بـێ کـردەوە زۆر ترسـناکەو لێپرسـینەوەی سەختی لەسەرەو دەفەرموێت: من لەوە ناترسم کە لە ڕۆژی قیامەتدا پـێم بڵـێن ئـەی عەمرە بچکۆلەکە ئایا کـردەوەت بۆچـی نـەکرد بـەو شـتانەی نەتـدەزانی، بـەڵام لـەوە دەترسم پێم بڵێن – ئـادەی بـزانین کـردەوەت کـردووە بـەو شـتانەی زانیاریـت هـەبوو پێیان؟!

---

١ صفوة التفاسير – محمد علي الصّابوني – (٢/٥٦).

٢ الجامع لشعب الايمان (٥/٤٥).

# دووەم

## لە زانستدا تێربوونیان بۆ نیە:

زانست دەریایەو هەر کەسێك بڵێ من تەواو پەیم پێ بردووەو ئیتر پێویستم بە کەس نیە تا وانەم پێ بڵێتەوەو شت نەماوە من نەیزانم، ئەوە ئەوپەڕی نەزانیو تێ نەگەیشتنی ئەو کەسە دەگەیەنێت، چونکە عیلم لە تەمەنی مرۆڤ زیاترەو دەبێت تا مردن هەوڵی وەرگرتنو دەستخستنی بدات.

ئەمەش پێغەمبەری خۆشەویستمانە (ﷺ) کە چۆن لە فەرموودەیەکدا ئەم وانەیە فێری زانایان دەکاتو دەفەرموێت:

* قال رسول الله (ﷺ): (اطلب العلم من المهد الى اللحد).

واتە: بە دوای دەستخستنی زانستو زانیاریدا بڕۆنو دەستی خۆتانی بخەن هەر لە کاتی منداڵیو ناو بێشکەوە تا کاتی پیریو قەبرەکە.

زاناو خواناسی سەرمەشق ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم فەرموودەیە لە ژیانیدا بە کردەوە دەسەلمێنێت، بزانین چۆن؟

* عن حماد بن زید قال: (کان ایوب السختیاني – رحمه الله – یطلب العلم الى ان مات).[1]

واتە: حەمادی کوڕی زەید دەڵێت: ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەتا مرد هەر هەوڵی دەستخستنو پەیداکردنی زانستی دەدا.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٩٩).

کەچی لاوانی موسڵمان هەرکە کۆلێژی تەواو کرد، یان فەقێ مۆڵەتی زانستی خستە گیرفانی ئیتر ئامادە نیە لە بوارە جیاجیاکاندا کتێب بخوێنێتەوەو گوێ بۆ کەس بگرێت شتی پێ بڵێتەوە!!!.

ئەمەش سەفیری پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆ ولاتی یەمەن- مەعازی کوڕی جەبەل-ە (خوای لێ ڕازی بێت) کە لەگەڵ پێشەوا عەلیدا (خوای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەرمان (ﷺ) ناردنی بۆ یەمەن بۆ ئەوەی بە زانستو زانیاریان ئەو ناوچەیە بەهرەمەند بکەن.

ئەم هاوەڵە مەزنە لە سەرەمەرگیشدا هەر خەمی ئەوەی بووە کە مردن ناهێڵێ ئیتر لە خزمەت زانایاندا چۆك دابداتو سوودیان لێ وەربگرێت:!

أخرج ابو نعيم في الحلية (٢٣٩/١) عن معاذ بن جبل – رضي الله عنه – انه لما حضره الموت قال: (..... اللهم انك تعلم اني لم اكن احب الدنيا وطول البقاء فيها، لجري الانهار ولا لغرس الاشجار، ولكن لظمأ الهواجر ومكابدة الساعات ومزاحمة العلماء بالركب عند حلق الذكر).[١]

واتە: مەعازی کوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێت) لە کاتی سەرەمەرگو گیان سپاردنیدا فەرمووی: ..... ئەی خوای پەروەردگارم تۆ چاك دەزانی من لەبەر ئاووجۆگە ڕاکێشانو نەمام ناشتن حەز بە دونیاو مانەوە ناکەم تیایدا بەڵکو لەبەر ڕۆژوی ڕۆژە گەرمەکانو بەکارهێنانی کاتەکان لە خواپەرستیداو چۆك دادان لە خزمەت زانایاندا لە هەڵقەی زیکرەکانیاندا حەزم لە دنیا کردووە.

برای زانای صالحم ئەگەر پێت دەکرێت تا سەرەمەرگیش هەر کتێبت پێ بێتو بیخوێنەرەوەو چاوێ لە (سەهل) بکە:

---

١ حياة الصحابة (١٠/٤).

* قال ابو بكر البصري: (دخلت على سهل بن عبدالله — رحمه الله — فقال لي: تكتب؟ قلت نعم: قال اكتب فان استطعت ان تلقى الله عز وجل ومعك المحبرة فافعل).[١]

واتە: ئەبو بەکری بەسرەیی دەڵێ: چوومە خزمەت سەهلی کوڕی عبدالله و مەرەکەبو قەڵەمم بە دەستەوە بوو، فەرمووی: چیە فەرمووده دەنووسی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر دەتوانی تا ئەو ڕۆژەی دەگەیتەوە حزوری خوا ئەم شتانەت پێ بێت وا بکە، واتە بەردەوام زانست کۆبکەرەوەو ماندوو بە.

ئەمەش گەورەو سەرمەشقی صالحانی بەغدایە (عبدالله ی کوڕی موبارەك) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کاتێك بۆ سەردان دەڕواتە بەسرە، هەواڵی زانایەك دەپرسێت تا بچێتە حزووری‌و سوودی لێ وەربگرێت!؟:

* قال محمد بن عيسى: (قدم عبدالله بن مبارك — رحمه الله — قدمة فقيل له: الى اين تريد؟ قال: الى البصرة، فقيل: من بقى؟ قال: ابن عوف آخذ من أخلاقه آخذ من آدابه).

واتە: محمدی کوڕی عیسی دەڵێت: عبدالله ی کوڕی موبارەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەردانێکی شاری بەسرەی کرد، پێیان وت: سەردانی کێ دەکەیت؟ واتە: کێ ماوە لە زاناکان کە شایانی ئەوە بێت تۆ لێی وەربگریت؟ فەرمووی: (ابن عەوف) ئەچم بۆ لای‌و لە ڕەوشتی کەڵك وەردەگرم لە هەڵسوکەوتی سوود دەبینم.

زانایان هەر بەوەوە نەوەستاون بچنە خزمەتی گەورە زانایان‌و شتیان لێوە فێر بن، بەڵکو گوێیان بۆ گەنجانێکیش گرتووە کە ئەو قسانەی ئەوان بۆیان دەکردن ئەو زووتر بیستبووی بەڵام نەیدەدا لە ڕووی:

* عن يعقوب بن عطاء قال: كان الرجل يحدث أبي بحديث كان أبي أحفظ لذلك الحديث من الرجل، قال: (فجعل ابي يصغي اليه فقلت انا للرجل: ان ابي يحفظ هذا

١ الجامع لشعب الايمان (٥/٨٣).

الحديث، قال: فصاح ابي وقال: مه يا بنيّ! فلما قـام الرجـل، قـال لـي ابـي: يـا بـنيّ لم تبغض اباك الى جليسه؟ لقد سمعت هذا الحديث قبل ان يولد أبوه).[1]

**واتە: يەعقوبی كوڕی عەتا دەڵێ: جاری وا دەبوو كەسێك فەرموودەيەكی بۆ باوكم دەگێڕايەوە كە باوكم لە ئەو باشتر لەبەری بوو، كەچی زۆر بە وردی گوێی بۆ شل دەكردو منيش خۆم پێ نەدەگيراو بە كابرام دەوت: باوكم ئەم فەرموودەيەی بيستووە! و باوكيشم هاواری كردو پێی گوتم: بێدەنگ بە كوڕی خۆم، كاتێك پياوەكە ڕۆيشت باوكم ڕووی تێ كردمو پێی گوتم: كوڕی خۆم بۆچی باوكت لەبەر چاوی ميوانەكانی دەخەيت، خۆ من ئەم فەرموودەيەم وەختێ لەبەر بوو كە باوكيشی لە دايك نەبووبوو.**

قال عكرمة مولى ابن عباس: (طلبت العلم أربعين سنة وكنت أفتي بالباب وابن عباس بالدار).[2]

**واتە: عەكريمە دەڵێ: ماوەی (٤٠) ساڵ خەريكی كۆكردنەوەی زانست بووم‌و من لەبەر دەرگا فتوام دەداو ابن عباس لە ژوورەوە دانيشتبوو.**

---

١ الجامع لشعب الايمان (٢٣/٥).

٢ عمر بن عبدالعزيز — وەرگێڕانی عمر توفيق الخطاط، بڵاوكراوەی نارين، لا: (١٧٣).

# سێیەم

## شەو نوێژیان بەردەوام بووە:

شەونوێژ كارێكی زۆر گەورەو گرانە بۆیە خوای گەورە لەسەر ئومەتی ئیسلامی فەرز نەكردووە بەڵكو سوننەتێكی گەورەو پڕ لەخێرەو نووری ناو چاوی ئیماندارە.

بەلاّم دەتوانم بڵێم بۆ زانایانو بانگخوازان زۆر زەرورەو نزیكە لەوەی لەسەریان فەرز بێت چونكە كارەكەیان زۆر قورسو گرانەو كاری قورسی پێغەمبەرانەو جێگری پێغەمبەری خوان (ﷺ) لە گەیاندنی پەیامی بەرزی ئیسلامو پێشەوایەتی كردنی لەسەر فەرز دەكات:

* قال الله سبحانه وتعالى: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾.[1]

واتە: شەوانە شەونوێژ بكەو تیایدا قورئانی زۆر بخوێنە چونكە نزیكە پەروەردگارت لە دوارۆژێكی نزیكدا پلەوپایەیەكی بەرزت پێ بدات.

ئەم ڕاستیەش لە لای زانایان زۆر ئاشكرایەو فەرموون با بچینە خزمەت پیاوصالّحو خاوەن مەزهەب ئەحمەدی كوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بزانین چی بە قوتابیەكی قورئان دەفەرمووێت؟

* عن ابي عصمة بن عصام البيهقي قال: بتُّ ليلة عند احمد بن حنبل – رحمه الله – فجاء بالماء فوضعه، فلما أصبح نظر الى الماء فاذا هو كما كان! فقال: (سبحان الله! رجل يطلب العلم لا يكون له ورد بالليل؟!!).[2]

---

١ سورة (الاسراء) اية (٧٩).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٢٣).

واتە: ئەبو عیسمەی كوڕی عیسامی بەیهەقی – كە یەكێك بوو لە فەقێكانی بەردەستی مامۆستا أحمد – خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: شەوێكیان لە خزمەت مامۆستا احمدی كوڕی حەنبەلدا مامەوەو لەوێ خەوتم، و لە پێش خەوتندا لە تەنیشتی جێگاكەمدا ئاوی دەستنوێژی بۆ دانام، و كاتێ بۆ نوێژی بەیانی هاتو سەیرێكی ئاوەكەی كرد دەبینێ بەكار نەهاتووەو وەك خۆی ماوەتەوە بۆی دەركەوت شەونوێژم نەكردووە فەرمووی: (سبحان الله) پاكو بێگەردی بۆ خوا! شتی وا دەبێت؟ كەسێك بە دوای عیلمو زانستدا بگەڕێت كەچی شەوانە لەگەڵ خودادا ڕازو نیازو وێردی نەبێت؟!.

سەرمەشقی صاڵحانی شاری بەسرە (مامۆستا حەسەنی بەسری) قوتابیانی قورئان دەترسێنێت لە گوناهكرنو دەڵێت گوناهیش دەبێتە بەربەست لە ڕێگای مرۆڤدا كە بەهرەمەند بێت بە شەونوێژ:

* وقال الحسن البصري – رحمه الله – (ان الرجل ليذنب الذنب فيحرم به قيام الليل).[1]

واتە: شێخ حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ڕوودەكات موسڵمانانو دەفەرموێت: (پیاو كە گوناهێك دەكات بەهۆی ئەو گوناهەوە خوای گەورە لە شەونوێژ مەحرومو بێ بەشی دەكات).

---

١ عمر بن عبدالعزيز للصلابي – وەرگێڕانی عمر توفيق الخطاط، بڵاوكراوەی نارین، لا: (١٩٨).

# چوارەم

## هەست بە گرنگی کات دەکەن:

کات زۆر سەریعەو خێرا تێدەپەڕێتو دەڕواتو ناگەڕێتەوە بۆیە دەبێت هەموو خوشكو برایەکی موسڵمان کات بە فیڕۆ نەداتو کات نەکوژێتو لاپەڕەکانی ڕۆژی قیامەتی بە سەیری تەلەفزیۆنو چەرەسات خواردنو ئەتاری کردنو پیاسەی ناو بازاڕ پڕ نەکاتەوە.

بەڵام بۆ عولەماو زانایانی ئیسلام زۆر شورەییە کاتەکانیان ڕێك نەخەنو بە شتی بەسوود پڕیان نەکەنەوە ئەمەش دیسان پێشەوامان (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) فێرمان دەکاتو با بزانین کاکە عبدالله ی کوڕی چۆن باسی باوکی ئازیزیمان بۆ دەکات:؟.

* عن عبدالله بن احمد بن حنبل قال: (كان أبي أصبر على الناس على الوحدة، لم يره أحد الاّ في المسجد او حضور جنازة او عيادة مريض، وكان يكره المشي في الاسواق).[1]

واتەك عبدالله ی کوڕی احمدی کوڕی حنبل دەڵێ: باوکم لە هەموو کەس زیاتر ئارامگر بوو لەسەر تەنیایی، و هەرگیز کەس نەیدیووە بێ هودە چووبێت بۆ جێیەك، مەگەر یان لە مزگەوت بینراوە یان بە دوای جەنازەیەکەوە بووە یان لە سەردانی نەخۆشێك بووبێت، و گەڕانی بازاڕی زۆر پێ ناخۆش بووە (و بە کات کوشتنی زانیووە).

هەر ئەم پیاوە صاڵحە مەزنەی گەڕەکی (أعظمية)ی بەغداد بواری نەداوە لە حەلقەو دانیشتنەکانیدا جگە لە باسی قیامەتو خۆشیو ناخۆشیەکانی هیچ شتێکی دنیایی باس بکرێت:

---

١ صفة الصفوة (٢/١٢٤).

* عن ابي داود السجستاني: كانت مجالس احمد بن حنبل (رحمه الله) مجالس الآخرة لا يذكر شيء من أمر الدنيا، ما رأيت أحمد ذكر الدنيا قط).[1]

واتە: زانا مەزنەكەی بواری فەرمووده (ئەبو داودی سجستانی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (هەڵقەو دانیشتنەكانی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل ڕەحمەتی خوای لێ بێت هەمووی باسی ڕۆژی قیامەت بوو و وانازانم هەرگیز بۆ تەنها جارێك لە هەڵقەكانیدا باسی شتی دنیایی كردبێت).

هەندێ لە خەڵكی بە تایبەت مامۆستاو مەلاو پێشەوا ئاینیەكان لە پیاسەو گەڕانو كات كوشتنن! ! كاتێك پێیان بڵێیت ئەوە چۆن كاتی ئەوەت هەیە؟ دەڵێت: ئیشەكانم كردووەو دەستم خاڵی بووە ! !.

كەچی قورئان وا نافەرموێت! بەڵكو دەفەرموێت: هەركاتێك پەرژاتانو دەستتان خاڵی بوو بچنە ناو قوڵایی خواناسیو بەندایەتیەوە وەك دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ ﴿٨﴾﴾.

شورەیحی قازیش ئەم وانەیە دەدات بە گوێی دراوسێكانیدا:

* عن الأعمش قال: (سمعتهم يذكرون عن شريح القاضي انه رأى جيراناً له يجولون، فقال: مالكم؟ قالوا: فرغنا اليوم! فقال: ما بهذا أمر الفارغ).[2]

واتە: زانای ناسراوی زمانەوانی (ئەعمەش) دەگێڕێتەوەو دەڵێت: گوێم لە زانایان بووە دەربارەی شورەیحی قازی دەیانگێڕایەوە كە جارێكیان هەندێ لە دراوسێكانی بینیبوو پیاسەیان دەكرد، ئەویش بە سەرسوڕمانەوە پێی فەرموون: ئەوە خەریكی چین؟ وتیان: مامۆستا ئیشو كارمان تەواوكردووەو پیاسە دەكەین! ئەویش فەرمووی: بەم شێوەیە فەرمانمان پێ نەدراوە كە بێكارو دەست بەتاڵەكان ئاوا بكەن.

---

١ صفة الصفوة (٢/١٢٤).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٥).

ئەمەش سەلمانی فارسیە (خوای لێ ڕازی بێت) ئامۆژگاری برایەكی هاوەڵی دەكات كە تەمەن كورتە نەكەی خۆت خەریك بكەیت بە شتی لاوەكیو ناپێویستەوە بەڵكو:

* قال سلمان الفارسي لحذيفة اليماني (رضي الله عنهما): (يا أخا بني عبس، العلم كثير والعمر قصير، فخذ من العلم ما تحتاج اليه في أمر دينك ودع ما سواه فلا تعانيه).[١]

واتە: سەلمانی فارسی (خوای لێ ڕازی بێت) ڕۆژێك دەبینێ وا حوزەیفەی یەمانی (خوای لێ ڕازی بێت) خەریكی عیلمو عیرفان دەست خستنە، ئامۆژگاری كردو پێی فەرموو: ئەی برای هۆزی – عەبسی – عیلمو زانستەكان زۆر زۆرن، بەلام لە بەرامبەردا تەمەن زۆر كورتە، بۆیە هەوڵ بدە خۆت بەو زانستانەوە خەریك بكە كە سوودی بۆ ئاینو دینداریەكەت هەیەو خۆت بە زانستی ترەوە ناڕەحەت مەكە.

(أبو درداء) هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ)و زاناو مامۆستا مەزنەكەی ولاتی پیرۆزی شام، ئامۆژگاری زانایان دەكات كە ئاگادار بن چونكە پاچێكیان بە دەستەوەیەو بەردەوام لە كەژی تەمەنی خۆیانی پێ دەڕوخێنن:

* قال ابو درداء (رضي الله عنه): (يا ابن آدم انما أنت أيام كلما ذهب يوم ذهب بعضك، ابن آدم إنك لم تزل في هدم عمرك من يوم ولدتك أمك).[٢]

واتە: (أبو درداء) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ئەی ڕۆڵەكانی ئادەم تۆ لە چەند ڕۆژێك پێك هاتوویت، لەگەڵ تێپەڕبوونی هەر ڕۆژێكدا كەمێ لە تەمەنت دەڕوات.

ئەی ڕۆڵەی ئادەم (علیه السلام) تۆ لەو كاتەوەی لە دایك بوویت خەریكی ڕووخاندنی تەمەنی خۆتی، ئاگاداربە.

عبدالله ی كوڕی مەسعود – هاوەڵی مەزنو زانای فەرموودە – (خوای لێ ڕازی بێت) زۆر ڕقی لەو كەسانە بوو كاتەكانی تەمەن دەكوژنو بە هەلی نازانن تا كردەوەی جوانی تێدا ئەنجام بدەن، وەك دەفەرمووێت:

---

١ صفة الصفوة (١/٢٨٠).

٢ صفة الصفوة (٢/٧١).

* عن مسيب بن رافع قال: قال عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه): (اني لأبغض الرجل ان اراه فارغاً ليس في شيء من عمل الدنيا ولا عمل الآخرة).[١]

واتە: عبدالله ی كوڕی مەسعود (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرموویّت: من ڕقم لە كەسێكی موسڵمان دەبێتەوە كە ببینم دەستی بەتاڵەو نە بە كارێكی بەسوودی دنیایەوە خەریكەو نە بە كاروكردەوەی ڕۆژی قیامەتەوە.

---

١ رواه الامام أحمد.

# پێنجەم

## ڕێز دادەنێن بۆ زاناكانیان:

جوانترین ڕەوشت كە زانا صاڵحەكان پێی دەناسرێنەوە ئەوەیە كە ئەوپەڕی ڕێز دابنێن بۆ هاوكارانیان، ئای كە بەڵگەی ئیمانەو ئای كە بەڵگەی دڵسافیو دوور لە حەسوودیو كینەیەو ئای كە دوور لە فیز زلیو خۆ بە گەورە زانینە، زانا خۆی بە بچووك بزانێت لە حزووری برا زاناكانی تریدا، بەڵام كەمن ئەو جۆرە زانایانە (فقلیل ماهم)!.

(ئەبو هورەیرە) (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم وانەیە فێری زانایانمان دەكات كە ئەگەر بە قەزایش بووە ڕێز بگێڕنەوە بۆ برا زاناكانیان یانی چی قەزا؟:

* عن سعيد بن ابي سعيد قال: (كنا مع ابي هريرة جلوساً، فجاء الحسن بن علي (رضي الله عنهما) فسلم علينا، فرددنا عليه وابو هريرة لا يعلم فمضى، فقلنا يا أبا هريرة هذا حسن بن علي قد سلم علينا، فقام فلحقه فقال: يا سيدي، فقلت له: تقول يا سيدي؟! قال: اني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: انه السيد).[1]

واتە: سەعیدی كوڕی ئەبی سەعید دەڵێ: لە خزمەت ئەبو هورەیرەدا دانیشتبووینو لەو كاتەدا حەسەنی كوڕی عەلی كوڕی ئەبو تالیب (خوایان لێ ڕازی بێت) هات بۆ لامانو سڵاوی لێ كردینو ئێمەش وەڵاممان دایەوە بەڵام ئەبو هورەیرە پێی نەزانی، و پاش ئەوەی حەسەن ڕۆیشت پێمان وت: ئەوە نەتزانی خۆ ئەوە حەسەن بوو هات بۆ لامان، و ئەبو هورەیرەیش بە پەلە هەستایە سەرپێو شوێنی كەوتو گرتیەوە

---

١ المستدرك (٣/١٦٩) وقال الحاكم صحيح وأقرّه الذهبي.

فـەرمووی: ئـەی سـەییدم ئـەی گـەورەم، پاشـان مـن پـێم وت: ئـەوە پێـی دەڵێیـت گـەورەم؟! ئـەویش فـەرمووی لـە پێغەمبـەری خـوام بیـستووە (ﷺ) کـە دەربـارەی حەسەن فەرموویەتی: (ئەو سەییدو گەورەیە).

(سبحان الله) کەی زانایانی موسڵمانی ئەم سەردەمە ئەم ڕەوشتە ڕەببانیـە مەزنـە دەگرنەبـەروو واز لـە خـۆ بـەدڵبوون دەهێـنن دەی بـا سـەرێك بـدەین لـە مامۆسـتاو ئامۆژگاری کارانی قورەیشو بزانین تا چ ئاستێك ڕێزیـان دانـاوە بـۆ زانایـان لـە وەرزی حەج کردندا:

* عن هشام بن سليمان المخزومي قال: (ان علي بن عبدالله بـن عبـاس كـان اذا قـدم مكة حاجاً أو معتمراً، عطلت قريش مجالسها في المسجد الحـرام وهجـرت مواضـع حلقهـا والزمت مجلس علي بن عبدالله بن عباس اعظاماً واجـلالاً وتبجـيلاً، فـان قعـد قعـدوا، وان نهض نهضوا، وان مشي مشوا جميعا حوله، لايرى لقريش في المسجد الحرام مجلس ذكر يجتمع اليه فيه حتى يخرج من الحرم).[١]

واتە: هیشامی کوڕی سولەیمانی مەخزومی دەڵێ: هەر کاتێك عەلی کـوڕی عبـدالله ی کـوڕی عـەباس (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) بهاتایەتـە مەککـەی پـیرۆز بـۆ حـەج یـان عەمرەکردن.

سەرجەم مامۆستایانی قورەیش وانەو هەڵقەکانی خۆیانیـان هەڵدەگرتو وازیـان لـە دەرس وتنەوە دەهێنا بە گورجی دەهاتنە خزمەت (مامۆسـتا عـەلی) و لـە هەڵقەکانیـدا چۆکیان دادەدا، ئەمەش لەبەر ڕێزو گەورەیی‌و حورمەتی عەلی کـوڕی عبـدالله ی کـوڕی عـەباس بـوو، ئـیتر لـەو ماوەیـەدا دانیـشتایە دادەنیـشتن‌و هەڵبـسایە هەڵدەسـان‌و بڕۆیشتایە دەڕۆیشتن بە دوایدا، بـەو جـۆرە ڕێزیـان لێ دەگـرت تـا لـە شـاری مەککـەی پیرۆز دەچووە دەرەوە.

---

١ صفة الصفوة (٢/٧١).

تەمەن زۆر گرنگە دەبێت زاناكان لەگەڵ یەكتردا بیخوێننەوەو پشتگوێی نەخەن ئەگەر تەنها یەك شەویش گەورەتر بێت!! ئەم وانەیەش لە خزمەت طلحەی كوڕی مطرفدا دەخوێنین:

* عن ليث قال: كنت أمشي مع طلحة بن مطرف (رحمه الله) فقال: (لو علمت انك أسن مني بليلة ما تقدمتك).[1]

واتە: گەورە زانای موجتەهید لەیسی كوڕی سەعد دەفەرمووێت: ڕۆژێكیان لەگەڵ تەڵحەی كوڕی موتریفدا دەڕۆیشتمو لای كردەوە بۆ لامو پێی وتم: بەس بمزانیایە یەك شەو لە من گەورەتری هەرگیز پێشت نەدەكەوتم.

زانا خراپە دنیا خۆرەكان ئەگەر هەواڵی مردنی زانایەكی برایان ببیستن خۆشحاڵ دەبن چونكە ئیتر ئەو ناوی نامێنیو خەڵكی ڕوو دەكەنەوە لای ئەمان!!

بەڵام زانا صاڵحە ڕەببانیەكان وانینو زۆر زۆر نیگەرانو دڵتەنگ دەبن بە كۆچی دوایی زانایەكی مەزنی ئیسلام، گوێ بگرە بۆ ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بزانە چی دەكات؟:

* عن سفيان بن عيينة – رحمه الله – قال: (قال ايوب السختياني – رحمه الله – انه ليبلغني موت الرجل من أهل السنة فكأنما يسقط عضو من أعضائي).[2]

واتە: سوفیانی كوڕی عویەینە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەیوبی سەختیانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: هەر كە هەواڵی مردنی زانایەك لە پەیڕەوانی ئەهلی سونەو جەماعە دەبیستم وادەزانم ئەندامێك لە ئەندامەكانی لەشم قرتاوە.

(جابری كوڕی عبدالله)یش بە مردنی (ابن عباس) خوای لێ ڕازی بێت هەمان هەڵوێستی مەردانەی زانای صاڵحو خواناسی هەبوو:

---

١ صفة الصفوة (٢/٦٢).

٢ صفة الصفوة (٢/١٩٩).

* لما بلغ جابر بن عبدالله – رضي الله عنه – وفاة ابن عباس – رضي الله عنه – صفق باحدى يديه على الاخرى وقال: (مات أعلم الناس واحلم الناس ولقد اصيبت به هذه الامة مصيبة لا ترتقي).[١]

واتە: جابری كوڕی عبدالله (خوای لێ ڕازی بێت) هەر هەواڵی كۆچی دوایی عبدالله ی كوڕی عەباس زانای مەزنی ئیسلامی بیست.. دەستەكانی كێشا بە یەكداو فەرمووی: ئای كە زاناترین كەس مرد، نەرمو نیانترین كەس مردو ئوممەتی ئیسلام تووشی نەهامەتیەك بوو بە مردنی كە چاك بوونەوەی نیە.

ئەم ڕێزو حورمەتو پێزانینە خۆ تەنها لە نێوان ئەندامانی مەزهەبێك یان حیزبێك یان وڵاتێك یان هۆزێكدا نیە بەڵكو ئەگەر لەوانەش نەبێت دەبێت هەر ڕێزی تەواوی بۆ دابنرێت چونكە خۆ خزمەتكاری ئیسلامی عەزیزمانەو ئەم وانەیەش لە خزمەت ئەبو جەعفەری صادقدا وەردەگرین كە ئیمامو پێشەوایەكی مەزنی ئەهلی سوننەو جەماعە بووە ئێستا بە داخەوە شیعەكان لە باتی ئێمە شانازی پێوە دەكەن:

* عن عروة بن عبدالله قال: (سألت ابا جعفر الصادق – محمد بن علي بن الحسين – عن حلية السيوف، فقال: لقد حلى ابو بكر الصديق سيفه، قال: فقلت: وتقول الصديق؟!. وثب واستقبل القبلة ثم قال: نعم الصديق، نعم الصديق، نعم الصديق، فمن لم يقل له الصديق فلا صدق الله له قولاً في الدنيا ولا في الاخرة).[٢]

واتە: عوروەی كوڕی عبدالله دەڵێت: لە ئەبو جەعفەری صادقم پرسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی ڕووكەشكردنی شمشێر بە ئاڵتوون، لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ دروستە كاتی خۆی ئەبو بەكری صدیق شمشێرەكەی ڕووكەشی ئاڵتوون كردووە! دەڵێ: پێم وت: تۆ پێی دەڵێیت (صدیق)؟!

١ صفة الصفوة (٣٨٤/١).

٢ صفة الصفوة (٧٨/١).

دەڵێ: پێشەوا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو پاشان ڕووی کردە قیبلەو فەرمووی: بەڵێ (الصدیق) بەڵێ (الصدیق) بەڵێ (الصدیق)و هەر کەسێك پێی نەڵێ (صدیق) خوای گەورە نە لە دنیاو نە لە قیامەتدا (صدیق)ی ناکات.

ئەمەش عمری کوڕی عبدالعزیزە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) یاسای ڕەسمی خۆی دەشکێنێت بۆ ڕێزلێگرتن لە زانایەکی موسڵمانو ڕێگەی دەدات بێتە ژوورەوە کە ڕێگەی بە کەسی تر نەداوە لە هاوەڵەکانی بچێنە ژوورەوە بۆ لای:

* قدم زیاد مولى ابن عیاش – رحمه الله – على عمر بن عبدالعزیز – وكان خلیفة انذاك – رحمه الله – واصحاب له، فأتى الباب وبه جماعة من الناس فأذن له دونهم، فدخل علیه فنسي ان یسلم علیه بالخلافة، ثم ذكر فقال: السلام علیك یا أمیر المؤمنین! فقال له عمر: (والاولى لم تضرني، ثم نزل عمر عن موضع كان علیه الى الارض وقال: اني أعظم ان اكون في موضع اعلو فیه على زیاد).[١]

واتە: زانای پایە بەرز – زیادی مەولای ابن عیاش – لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوڕێکانیدا دێتە خزمەت ئەمیری باوەڕداران عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)و لە دەرەوە لەبەر دەرگا دەوەستێتو عمریش ڕێگای ئەو دەدات بە تەنها کە بچێتە ژوورەوەو زیادیش لە خۆشیاندا بیری چوو سڵاوی لێ بکات وەکو ئەمیری باوەڕداران تەنها وتی سڵاو لە عومەری کوڕی عبدالعزیزو پاشان بیری کەوتەوەو خێرا وتی: سەلامی خوا لە ئەمیری باوەڕداران! و عومەریش فەرمووی: سڵاوەکەی یەکەم جارت زیانی نەبوو بۆم.

پاشان وەك ڕێزێك بۆ ئەو زانایە عومەر لە جێگا بەرزەکەی خۆی هاتە خوارەوەو لەسەر زەویەکە دانیشتو فەرمووی: عومەر زۆر لەوە گەورەترە کە ئەوەندە بێ ڕێز بێت لە سەرووی زیادەوە دابنیشێت.

---

١ عمر بن عبدالعزیز – للصلابي – وەرگێڕانی عمر توفیق خطاط، بڵاوکراوەی نارین، لا: (١٥١).

زانا دنیاخۆرەکان ئەوانەی چواردەورەی کورسی دەسەڵات لە لای دەسەڵاتداری نەخوێندەوار خۆیان دەکەن بە تاکانە زانای سەردەم‌و لە لای حاکمدا دەڵێن جگە لە خۆمان خەڵکی تر هەمووی فەریکە زانان‌و هیچ نازانن! بەڵام زانا ڕەبانییەکان وا نین ئەگەر بچنە چڵەپۆپەی دەسەڵاتیش برا زاناکانیان لە یادەو دان بە فەزڵ‌و زانایی‌و ژیریاندا دەنێن‌و عومەری کوڕی خەتابیش (خوای لێ ڕازی بێت) وابوو لەگەڵ عەلیدا (خوای لێ ڕازی بێت):-

* عن سعيد بن المسيب قال: كان عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) يتعوذ من معضلة ليس لها ابو الحسن).[1]

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب کە خەلیفەی موسڵمانان بوو پەنای بە پەروەردگار دەگرت لە مەسەلەیەکی قوڵی شەرعی کە باوکی حەسەنی بۆ هەڵنەکەوێ‌و چارەسەری نەکات واتە عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوای لێ ڕازی بێت).

زۆرێ لە زانا دنیاییەکان بەوە دەناسرێنەوە کە زۆر خۆشحاڵ دەبن کاتێك باسی زیرەکی‌و لێهاتوویی‌و کەم وێنەییان بکەیت‌و دەڵێت ئەی وایە من زۆرم خوێندووەو من گاڵتە نیم!! من لە ئەزهەر خوێندوومە!!

بەڵام زانا ڕەببانیەکان بە بیستنی ئەو مەدح‌و پیاهەڵدانانە قەڵس دەبن‌و یەکسەر ناوی زانایەکی تر دێنێ کە لە خۆی باشترو زیرەکترە!:

* عن خيثمة في فضائل الصحابة – رضي الله عنهم – عن زياد بن علاقة قال: رأى عمر بن الخطاب رجلاً يقول له: (ان هذا لخير الأمة بعد نبيها! فجعل عمر يضرب الرجل بالدرة ويقول: كذب، لأبوبكر خير مني ومن ابيك).[2]

---

١ صفة الصفوة (١/١٦٥).

٢ حياة الصحابة (كاندهلوي) (٣/١٢٥).

واتە: (خیثمة) لە باسی چاکی هاوەڵاندا هێناویەتی لە زیادی کوڕی عەلاقەوە کە عومەری کوڕی خەتاب گەیشت بە پیاوێكو پیاوەکەش – زۆر خۆشحاڵ بوو بە دیتنی عومەر – وتی: ئەم پیاوە مەزنە باشترین کەسی ئوممەتی ئیسلامە لە دوای پێغەمبەرەکەی!

عومەر بە دارەکەی دەستی دایگرتەوەو لێیداو فەرمووی: درۆیە، ئەبو بەکری صدیق لە منیش‌و لە باوکیشت چاکترە.

هەندێ لە زانا دنیاخۆرەکان زۆر خۆشحاڵ‌و کەیف خۆش دەبن‌و بزەی لێویان دێ کاتێ لە خزمەتیاندا بوەستن‌و پرسیاری لێ بکەن‌و داواکاری پێشکەش بکەن.

بەڵام زانا ڕەببانیەکان وا نین، زۆر ئازار دەچەژن کاتێ ئەوان دانیشن‌و خەڵکی لە حزوریاندا بوەستن‌و پێداویستیەکانیان بۆ بەرز بکەنەوە ئەمەش وانەیەکی کاریگەرەو حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب پێمان دەبەخشێت:

* ذكر صاحب كتاب (الشهب اللامعة في السياسة النافعة): إن رجلاً رفع الى الحسن بن علي – رضي الله عنهما – رقعة، فقال: (قد قرأتها وحاجتك مقضية، فقيل له: يا ابن بنت رسول الله (ﷺ) لو نظرت الى الرقعة وراجعته على حسب ما فيها، فقال: أخاف ان اسأل عن ذلّ مقامه بين يدي حتى أقرأها).[1]

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت ئەمیری باوەڕداران حەسەنی کوڕی عەلی – خوایان لێ ڕازی بێت – و وەرەقەیەکی پێدا کە پێویستیەکانی خۆی تێدا نوسیبوو، خێرا حەسەن فەرمووی: نامەکەتمان خوێندەوەو پێویستیەکانت جێبەجێیە، هاوڕێکانی پێیان وت: ئەی کچەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی بۆچی نامەکەیت نەخوێندەوە بزانی چی داوا کردووە پاشان بۆی جێبەجێ بکەیت، ئەویش فەرمووی: ترسی ئەوەم هەبوو لەو ماوەیەدا کە سەیری نامەکەی دەکەم ئەو بەرامبەرم سەرشۆڕانە بووەستایەو هەستی بە زەلیلی بکردایە!.

---

١ الحسن بن علي – للصلابي – (لاپەڕە: ٢١٦) وەرگیراوە.

زانا دنیاییەکان بە تایبەت ئەوانەی دەوروبەری قەسر، پێیان ناخۆش نیە کاتێك نەفامان غەیبەتی زانا ڕەببانییەکان دەکەن بەڵکو ئەمانیش زیاتری پێوە دەنێن‌و خۆشحاڵ دەبن.

بەڵام زانا ڕەببانیەکان یەکسەر دەمکوتی ناحەزو غەیبەتکاران دەکەن‌و چاکەو فەزڵی غەیبەتکراو باس دەکەن فەرموون وانەیەك لە عەتای خوراسانیەوە وەربگرن:

* عن عثمان بن عطاء الخراساني قال: إنطلقت مع ابي نريد هشام بن عبدالملك، فلما قربنا اذا بشيخٍ على حمار أسود عليه قميص دنس، وجبة دنسة وقلنسوة لاطئة، فضحكت منه: وقلت لأبي: من هذا الأعرابي؟

قال: (اسكت، هذا سيد فقهاء الحجاز – عطاء بن أبي الرباح – رحمه الله – فلما قرب منا نزل ابي عن بغلته ونزل هو حماره، فاعتنقا وتساءلا ثم عادا فركبا).[١]

واتە: عوسمانی کوڕی مامۆستا عەتای خۆراسانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ لەگەڵ جەنابی باوکمدا کەوتینەڕێ بەرەو پایتەخت بۆ خزمەت هشام ی کوڕی عبدالملك، لە ڕێگادا پیاوێکی بە ساڵاچوومان پێگەیشت بە سواری گوێدرێژێکەوە بوو، کراسێکی کۆنی لەبەردا بوو لەگەڵ جبەیەکی کۆن‌و مێزەرێکی شڕی بە سەرەوە بوو، و منیش پێی پێکەنیم‌و بە باوکم وت: دەبێ ئەم عەرەبە دەشتەکی یە کێ بێت؟ و باوکم وتی: وس بە ڕۆڵە، ئەمە سەرداری هەموو زانایانی حیجازە، ئەمە مامۆستا عەتای کوڕی ڕیباحە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کاتێك لێمان نزیك بوویەوە باوکم لە وڵاخەکەی دابەزی‌و ئەویش لە گوێدرێژەکەی هاتە خوارەوەو دەستیان کردە ملی یەکتری‌و هەندێ مەسەلەی شەرعیان تاوتوێ کردو پاشان سواربوونەوە.

ئەمەش زانای خواناس عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بزانە چۆن ڕێز لە زانایەکی وەك – سەعیدی کوڕی موسەیب – دەگرێت لە کاتێکدا ئەم ئەمیری باوەڕدارانەو ئەو تەنها زانایەکەو بەس:

---

١ من روائع القصص (لا: ٩٥).

* أرسل عمر بن عبدالعزيز – رحمه الله – رسولا الى سعيد بن المسيب ليسأل في مسألة وكان سعيد لايأتي اميرا ولا خليفة، فاخطأ الرسول فقال له: (الامير يدعوك فأخذ سعيد نعليه وقام إليه في وقته، فلما راه عمر قال له: عزمت عليك يا أبا محمد أن تعود الى مجلسك حتى يسألك رسولنا عن حاجتنا، فانا لم نرسله ليدعوك، لكنه أخطأ إنما ارسلناه ليسألك).[1]

واتە: جارێکیان عمری کوڕی عبدالعزیز کەسێکی نارد بۆ لای مامۆستا سەعیدی کوڕی موسەیب تا لە مەسەلەیەکدا پرسیاری شەرعی لێ بکات بەڵام پیاوەکە بە هەڵە تێگەیشتبوو پێی وت: ئەمیری باوەڕداران ناردوویەتی بە دواتا، بەڵام سەعید هەرگیز نەچووە بۆ لای ئەمیرو خەلیفەکان بەڵام بۆ عمر خێرا نەعلەکانی کردە پێی‌و کەوتەڕێ،و هەر کە عمر بینی هاواری کرد: داوات لێ دەکەم ئەی باوکی محمد بگەڕێرەوە بۆ جێگاکەی خۆت تا نێردراوەکەمان پرسیارەکەت لەوێ لێ بکات، چونکە من نەمناردووە بە دواتا، بەڵکو ئەو بە هەڵەدا چووە بەڵکو ئێمە ناردومان بۆ پرسیارێکی دادوەری.

---

١ عمر بن عبدالعزيز، دكتور صلابي، (لا: ٢٤).

# شەشەم

## گوناه ناکەن:

یەکێك لە سیما جوانو بەرزەکانی زانا ڕەببانیەکان ئەوەیە جڵەوی خۆیان دەگرنو گوناه ناکەن.. چونکە جگە لەوەی خوایان لێ دەڕەنجێو دڵیان ڕەش دەبێتەوە، لە ناو خەڵکیشدا سوكو ڕیسوا دەبنو لەوەش خراپتر خەڵکی چاویان لێ دەکاتو وا دەزانن ئەو کارە دروستە بۆیە فلان زانا دەیکات، بەو کارەش دەبن بە (قدوة السوء) سەرمەشقی خراپ بۆ موسڵمانان.

* قالت تلميذة لابي سعيد الخزاري: كنت أسأله والازار بيني وبينه مشدود فاستفزني حلاوة كلامه فنظرت في ثقب من الازار فرأيت شفته فلما وقعت عيني عليه سكت، وقال: جرى هاهنا حدث، فاخبريني ما هو؟

فعرفته اني نظرت اليه، فقال: اما علمت ان نظرك اليّ معصية وهذا العلم لا يحتمل التخليط.[1]

واتە: یەکێك لە قوتابیە کچەکانی بەردەستی زانای لەخواترس (ئەبی سەعید خەزازی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: پرسیاری شەرعیم لێ دەکردو لەو کاتەدا خۆم بە جلەکانم پێچابوویەوەو دیار نەبوو لێمەوە بەڵام شیرینی وشەکانی وای لێکردم لە کونی قۆپچەی حیجابەکەمەوە سەیرێکم کردو لێوەکانیم بینی دەیجوڵاندن، کاتێك بینی سەیرم کرد بێ دەنگ بوو فەرمووی: شتێکی ناسروشتی ڕوویدا لەم ناوەدا؟! پێم بڵێ چی بوو؟ و منیش ئاگادارم کرد کە سەیرێکم کرد لە ژێرەوە ئەویش فەرمووی:

---

١ صفة الصفوة (١/٢٨١).

ئەی خوشکی خۆم ئایا نازانی نەزەر حەرامەو ئەم زانستەی ئێمەش نابێت شتی حەرامی تێکەڵ بکرێت؟

# حەوتەم

## ئابنە داردەستو مفتی کاربەدەستەکان:

یەکێك لەو ڕەوشتە جوانو خاوێنانەی کە زانای لە خواترسو صالّحی پێ دەناسرێتەوە ئەوەیە لە کاربەدەستە زاڵمەکان نزیك نابنەوەو نابنە داردەستیانو فەتوا نادەن بە حەزو ئارەزووی سوڵتانەکان! بۆ هەموو هەڵەیەکی پادشاکان بەڵگەی دروستی ناهێننەوەو بە هەقو ناهەق نادەن بە لاملی خۆیاندا!.

لە مێژووی ئیسلامدا بەو زانایانەی کە لەبەردەمی کاربەدەستاندا زەلیلو کلّۆڵنو زانستو عیرفانیان سەرشۆڕو بێ نرخ دەکەن بۆ پارووپەك نان یان لە ترساندا، پێیان وتراوە زانایانی کۆشكو لەم سەردەمەشدا حکومەتەکان ناوی خۆش خۆشیان بۆ دۆزیونەتەوە!!.

* قال ابو حازم — رحمه الله —: (ان بني اسرائيل لما كانوا على الصواب، كانت الامراء تحتاج الى العلماء، ولكن لما كانت العلماء تصنن بالدنيا عن الامراء فاستغنت الامراء عن العلماء، واجمع القوم على المعصية، ففشلوا وانتكسوا، ولو كان علماءنا هؤلاء يصونون عملهم لها بهم الامراء).[١]

واتە: ئەبو حازم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: تا زاناکانی ناو بەنی ئیسرائیل لەسەر هەقو ڕاستی بوون، فەرمانڕەواکان پێویستیان کەوتبووە زاناکان.

بەڵام هەرکە زاناکان هەوڵی پەیداکردنی دنیایان دا لە لای فەرمانڕەواکان، ئیتر نرخیان نەما لە لایان پێویستیان پێیان نەماو دەریان کردن، و میللەتیش دەستیان

١ من روائع القصص — محمود طمعة حلبي — (لا: ٦٩).

دایە تاوانو گوناهکردن، ئیتر سەرشۆڕو تێکشکاو بوون، و ئەگەر ئەو زانایانەمان ڕێزی عیلمەکەی خۆیانیان بگرتایە بێگومان فەرمانڕەواکان هەیبەتیان لێ دەکردن.

بەڵام زانا خواناسە صالّحەکان، لە کاتی پێویستدا لە دەرگای فەرمانڕەواکان دەدەن بۆ نموونە ستەمیان لە یەکێك کردبێت ئەمان خێرا چوون بۆ کۆشکی کۆماریو لەوێ فەرمانڕەواکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە دواڕۆژی ستەمکاران:

* حبس عمر بن عبدالعزيز رجلا بالمدينة، وجاوز في حبسه القدر الذي يستحقه فكلم مزاحم –رحمه الله– عمر في أطلاقه فقال له عمر: ما أنا بمخرجه حتى أبلغ في الحيطة عليه بما هو اكثر مما حرّ، فقال مزاحم مغاضباً: (يا عمر بن عبدالعزيز اني احذرك ليلة تمخض بالقيامة وفي صيحتها تقوم الساعة يا عمر! ولقد كدت انسى اسمك مما اسمع: قال الامير! قال الامير، قال الامير! قال عمر اول من ايقضني لهذا الشأن مزاحم).[١]

واتە: عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کاتێك ئەمیری شاری مەدینە بوو، پیاوێکی کردە زیندان، لە ماوەی سروشتی خۆی زیاتری هێشتەوە لە زینداندا، و بۆیە زانای پایە بەرز چووە خزمەت عمر: داوای لێکرد بەڕەڵای بکات!

بەڵام عمر وتی: شتی وا نابێت بەری نادەم تا دڵنیا نەبم لەوەی ناگەڕێتەوە سەر کاری پێشووی، موزاحیمیش بە توڕەییەوە پێی وت: ئەی عمری کوڕی عبدالعزیز! من دەتترسێنم لە شەوێك قیامەتی پێ بێتو بەیانیەکەی ڕۆژی دوایی بێت.. من خەریکە ناوی تۆم بیر دەچێتەوە ئەوەندە وشەی ئەمیر وتی، ئەمیر فەرمووی، ئەمیر فەرمووی! دەبیستم!

عمر دەفەرموێت: بە ڕاستی موزاحیم یەکەم کەس بوو لەو بوارەدا بە ئاگای هێنامەوە.

---

١ عمر بن عبدالعزيز للصلابي (لا: ٢٥–٢٦).

فوزەیلی كوڕی عەیازیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئاگادارمان دەكاتەوە كە بۆ سامان یان شورەتو پلەوپایە لە پادشاو فەرمانڕەواكان نزیك نەبیتەوە چونكە بەخششەكانی خوا لەناو دەبات:

* قال عبدالصمد بن یزید: سمعت الفضیل بن عیاض یقول: (آفة القراء العجب، واحذر ابواب الملك فانها تزل النعم، فقیل له: یا ابا علي كیف تزل النعم؟ قال: الرجل یكون علیه من الله نعمه لیست له الی الخلق حاجة، فاذا دخل الی هؤلاء الملوك فرأى ما بسط الله لهم في الدور والخدم استصغر ماهو فیه فمن ثم تزول النعم).[1]

واتە: عبدالصمدی كوڕی یەزید دەڵێ: لە فوزەیلی كوڕی عەیازم بیست (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: (تیاچوونی هەڵگرانی قورئان لە خۆیان ڕازی بنو بە خۆیان سەرسام بن، و دەخیل نزیكی دەرگای فەرمانڕەوایان مەكەوەرەوە چونكە دەبێتە هۆی نەمانی بەخششەكان! پێیان وت: ئەی باوكی عەلی یانی چی دەبێتە لابەری بەخششەكان؟ فەرمووی: وا دەبێ مرۆڤی موسڵمان خوا بەخششی خۆی پێداوەو پێویستی بە كەس نیە، بەڵام هەركە چووە دنیای فەرمانڕەواكانەوەو بینی كە خوا چۆن بۆی ڕشتون لە جۆرەها بەخششی كۆشكو تەلارو خزمەتكار، ئیتر ئەو وەزعەی خۆی لەلا كەم دێتە بەرچاو و خوایش دوای ئەوە بەخششەكانی خۆی لێ دەسەنێتەوە.

برای هەڵگری عیلمو زانست! ئەزانی تۆ زۆر لە فەرمانڕەواو بەرپرسەكان گەورەتری؟ تۆ هەڵگری قورئانو كەشكۆڵی پێغەمبەرانی! چەند ناشیرینە، شورەییە لەبەر دەرگای پاشاو فەرمانڕەواكاندا بە سەرشۆڕی بوەستیت ئاخۆ بتكەنە ژوورەوە یان نا! ئەمەش قسەی من نیە بەڵكو وتەی پیاوصاڵحی مەزن بشری حافی یە:

* قال الحسن بن عمرو: سمعت بشراً یقول: (ما أقبح ان یطلب العالم فیقال هو بباب الأمیر)![2]

---

١ الجامع لشعب الایمان (٧٩/٤).

٢ الجامع لشعب الایمان (٧٩/٤).

واته: حەسەنی كوڕی عەمر دەڵێت: گوێم لێ بوو (بشری حافی) دەیفەرموو: چەند قێزەون و ناشیرینە هەواڵی زانایەك بپرسیت بڵێن ئەوەتا لەبەر دەرگای ئەمیردا وەستاوە !.

# هەشتەم

## لە چڵە پۆپەی نەرمو نیانیدان:

نەرمو نیانی بۆ هەموو کەسێك جوانەو کەس ناڕواتە ناو کاروانی موبارەکی صالحانەوە تا لەسەرخۆو نەرمو نیان نەبێتو جڵەوی تورەییو هەڵچوونی خۆی بگرێت! بەڵام بۆ زانایان چەند قات پێویستترە چونکە ڕەوشتی پێغەمبەرانەو پێغەمبەران لە بەرامبەر نەفاماندا وەڵامیان نەبووەو خۆیان گرتووەو صفاتی (عباد الرحمن)ەو نابێت موسڵمان لێی خاڵی بێت:-

قال الله تعالى: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ﴿٦٣﴾﴾.[1]

واتە: خوای عز وجل دەفەرمووێت: یەکێك لە ڕەوشتە مەزنەکانی (عباد الرحمن) ئەوەیە کە بە لەسەرخۆو نەرمو نیانی بەسەر زەویدا دەڕۆنو ئەگەر پێڕی نەفامانیش بە قسەی سووكو گاڵتەجاڕیەوە قسەیان لەگەڵ بکەن ئەمان دەڵێن: (سلام علیکم)و وەڵامیان نادەنەوە.

پێغەمبەری ئازیزیشمان (ﷺ) داوا لە موسڵمانان بە گشتیو زاناو پێشەواکان بە تایبەتی دەکات کە ڕەوشتی نەرمو نیانی لە دەست نەدەن چونکە خواو پێغەمبەرەکەی نەرمو نیانانیان خۆش دەوێت:

* (قال رسول الله (ﷺ) ان فيك خصلتان يحبهما الله ورسوله: الحلم والأناة).[2]

---

١ الفرقان: الآية (٦٣).

٢ متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوودەکاتە یەکێك لە هاوەڵە نەرمو نیانەکانیو پێی دەفەرمووێت: مژدەت لێ بێت دوو ڕەوشتی گەورەت تێدایە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت: نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی.

ئەی برای زانام، ئەزانی ڕەوشتی نەرمو نیانی جلوبەرگە بۆ زانستو بەبێ ئەو بەرگە عیلمو عیرفانەکەت ڕووتو قووتو بێ نرخە؟ ئەمە وتەی برات نیە بەڵکو ئامۆژگاریەکی ئاڵتوونیەو هاوڕێیەك پێشکەشی هاوڕێکەی دەکات:

* عن عبدالله بن وهب عن عمرو بن الحارث: (ان رجلاً كتب الى أخ لـه: إعلم ان الحلم لباس العلم فلا تعرينّ منه).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی وەهەب لە عەمری کوڕی حاریسەوە دەگێڕێتەوە کە هاوڕێیەك ئامۆژگاری هاوڕێیەکەی دەکاتو پێی دەڵێت: (بزانە نەرمو نیانی جلوبەرگە بۆ عیلمو زانستو قەد نەکەی ئەو جلوبەرگە لەبەر خۆت دابکەنیتو زانستەکەت ڕووت بکەیتەوە.

ئەگەر گلەیی ئەوە دەکەیت کە کەسێکی زۆر ژیرو عاقل نیتو ئیدارەی کارەکان نازانی بە ژیرانە بەڕیت بەڕێوە دەی نەرمو نیانی لەسەرخۆیی ئەو بۆشاییەت بۆ پڕدەکاتەوەو زانیاریەکانت جێی خۆیان دەگرێت ئەمەش ڕاستیەکەی لە دەمی زاناو پیاو صالحێکی فەلەستینی دەرچووە:

* قال حسن بن واقع عن ضمرة بن الربيعة الرملي الفلسطيني قال: (الحلم أرفع من العقل لان الله عز وجل تسمى به).[2]

واتە: حەسەنی کوڕی واقع دەڵێت: زەمرەی کوڕی ڕەبیعەی ڕەملی فەلەستینی دەڵێ: نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی لە عاقڵی زۆر مەزنو بەرزترە، چونکە خوای گەورە ئەو ناوەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بەڵام دووەمی بۆ خۆی هەڵنەبژاردووە.

---

١ الجامع لشعب الايمان (٧٧/٤).

٢ الجامع لشعب الايمان (٧٧/٤).

# نۆیەم

## هەمیشە دەم بە زیکرن:

وەیل بۆ ئەو زانایەی کە لە خوا غافڵەو زیکرو یادی ناکات، ئەی چۆن پەروەردەی ڕۆڵەکانی ئیسلام دەکات لەسەر زیکرو یادی خواو لە بیرنەکردنی پەروەردگار؟!.

ئەمەش مالیکی کوڕی دینارە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زاناو پیاو صالحە مەزنەکەی دەڤەری بەسرەیەو ئەزانی بچووکترین سزای خوایی بۆ ئەو زانایانەی زیکرو یادی خوا ناکات چیە، دەی گوێ بگرە بزانە چ سزایەکی دەروونی سەختی توش دەبێت:

* قال مالك بن دينار – رحمه الله – ان في بعض الكتب ان الله عز وجل يقول: (ان اهون ما أنا صانع بالعالم اذا أحب الدنيا ان اخرج حلاوة ذكري من قلبه).[1]

واتە: مالیکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: لە هەندێ لە کتێبەکانی پێشوودا هاتووە کە خوای عز وجل فەرموویەتی: سووکترین‌و کەمترین سزا بۆ ئەو زانایەی خۆشەویستی دنیاو پارەو پول‌و پلەوپایە دڵی داگیرکردووە ئەوەیە تام‌و شیرینی زیکرو یادی خۆم لەناو دڵیدا دەردێنم.

١ صفة الصفوة (٢/١٨٨).

# دەیەم

## بە لێشاو ماڵو سامان دەبەخشنەوە:

پێشتر باسی ئەوەم کرد کە ئادەمیزاد ناچێتە ناو کاروانی صالحانەوە تا بەردەوام خێر نەکاتو لە پێناوی خوا پارەو سامان بەسەر هەژاراندا نەبەخشێتەوە، بەلاّم ئەم ڕەوشتە بۆ زانایان زۆر پێویستترەو نابێت زانا بەخیلو چروك بێت، چونکە پەیامی خودا دەگەیەنێتو پەیامی بەرزیش بە خۆڕاییو بێ پارە ناگاتە خەڵکی..

ئەوە پێغەمبەرە ئازیزەکەمانە (ﷺ) کە پێشەواو سەرمەشقی زانایانی موسڵمانەو هەرگیز داوای شتێکی لێ کرابێت نەیوتووە پێم نیە! لە دەستما نیە! دەست کورتم! ئەی دەبێت چی فەرمووبێت بە داواکاران؟!.

* عن جابر – رضي الله عنه – قال: (ما سئل رسول الله (ﷺ) شيئاً قطّ فقال: لا).[1]

واتە: جابری کوڕی عبدالله (خوای لێ ڕازی بێت) زۆر لە خزمەتی پێغەمبەردا ژیاوەو شارەزای وردەکاریەکانی ژیانی بووە فەرموویەتی: هەرگیز هیچ کەسێك داوای شتێکی لە پێغەمبەری خوا نەکردووە (ﷺ) پێی بفەرمووێت: نەخێر، کەچی لە دەستما نیە، ئێمەش دەڵێین خوا بتداتێ!! ئای کە زانای صالح نین!

زانا صالحەکان پارەی گیرفانیان هەمووی بە موڵکی خۆیان نازانن، بەڵکو دەیکەن بە سێ کەرتەوەو یەك کەرتی بۆ خۆیان هەڵدەگرنو گوێ بگرە بۆ ئەم چیرۆکە سەیرو سەرسوڕهێنەرەو ببە بە زانایەکی دەست بڵاوی خێرۆمەند:

---

١ متفق عليه – البخاري – (٦٠٣٤)، مسلم (٢٣١١).

* عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: (بينما رجل يمشي بفلاة من الارض، فسمع صوتاً في سحابة، إسق حديقة فلان، فتنحى ذلك السحابة فافرغ ماءه في حرة، فاذا شرجة من تلك الشراج قد استوعبت ذلك الماء كله، فتتبع الماء، فاذا رجل قائم في حديقته يحول الماء بمسحاته، فقال له يا عبدالله ما اسمك؟ قال: فلان، للاسم الذي سمع في السحابة، فقال له يا عبدالله لم تسألني عن اسمي؟ فقال: اني سمعت صوتاً في السحاب الذي هذا ماءه يقول اسق حديقة فلان لاسمك فما تصنع فيها؟ قال: اما اذ قلت هذا فاني أنظر الى ما يخرج منها، فاتصدق بثلثه، واكل انا وعيالي ثلثا، وارد فيها ثلثه).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: جارێکیان پیاوێك بە ڕێگایەکدا تێدەپەڕی لەو کاتەدا گوێی لە دەنگێك بوو لە هەورێکەوە هاواری دەکرد: بڕۆ ئاوی باخی فلان کەس بدە، و هەورەکەش لایدا بەرەو دۆڵێکی بەردینو لەوێ باراندیو لە ڕێگای جۆگەیەکەوە هەموویو بەرەو باخێك ڕۆیشتو منیش دوای کەوتم، دەبینم پیاوێك بە خاکەنازێکەوە خەریکە ئاوەکە دەبات بەرەو درەختەکان..

چوو بۆ لایو پێی وت: ئەی بەندەی خوا ناوت چیە؟ ناوەکەی خۆی پێ وت هەمان ناو بوو کە لە هەورەکە بیستی، ئەویش وتی: ئەی بەندەی خوا ناوی منت بۆچی یە؟ وتی: گوێم لە پەڵە هەورێك بوو دەیووت بڕۆ باخی فلان کەس ئاوبدە کە ناوەکەی تۆ بوو، ئایا چی لەم باخە دەکەیت؟ ئەویش وتی: مادەم وات وت پێت دەڵێم: من بەرووبوومی ئەم باخە دەکەم بە سێ بەشەوە، بەشێکی دەکەم بە خێرو دەیبەخشم بەسەر هەژارانداو بەشێکیشی بۆ خۆموماڵو منداڵم هەڵدەگرم، بەشێکی تریشی لە باخەکەدا سەرف دەکەمەوە.

---

١ رواه مسلم ٢٩٨٤ في رياض الصالحين.

سەيری زانايەكی مەزنی وەك مەلا لەيسی كوڕی سەعد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) كە چەند پارەو سامانی كەوتۆتە دەستو هەمووی لەڕێی خوا بەخشيووەو نەيهێشتووە ساڵ پڕكاتەوە لەلایو زەكاتی لەسەر فەرز بێت ! !

ئادەی مەلا بەڕێزەكانی ئەمڕۆ ئێوە دەتوانن وا بن؟:

* قال محمد بن رمح: (كان دَخْلُ الليث بن سعد – رحمه الله – في كل سنة ثمانين الف دينار وما وجب لله تعالى عليه زكاة قط).[1]

واتە: محمدی كوڕی ڕەمح دەڵێ: دەستكەوتی ساڵانەی لەيسی كوڕی سەعد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەشتا هەزار ديناری ئاڵتون بوو، بۆ تەنها جارێك نەيدەهێشت ساڵی بەسەردا بێتو زەكاتی بكەوێت.

زانا مەزنەكەی بواری فەرموودە كە ناوی (ابو شهاب الزهری) بوو، پارەو پول لە لای زۆر بێ نرخ بووەو وەك سەنێری حوشتر بۆی ڕوانيوە:

* عن عمر بن دينار قال: (ما رأيت أحداً أهون عليه الدينار والدرهم من ابن شهاب الزهري – رحمه الله – وما كان عنده الاّ مثل البعرة).[2]

واتە: عمری كوڕی دينار دەڵێ: كەسم نەديوە ئەوەندەی ئەبو شەهابی زوهری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دينارو درهەم لەلای بێ نرخ بووبێت، وەك سەنێری حوشتر ڕوانيويەتی بۆ هەردووكيان.

سەيری محمدی كوڕی ئيدريس (الشافعی) بكە ئەی برای زانام كە خەڵكی لەناو كورددا بە مەلا ناوت دەبەن.. بزانە چۆن خێرومەندێك بووە !

نەك وەك تۆی مامۆستاو پێشەواو مەلا! كە لە وتارەكانتدا هانی موسڵمانان دەدەيت تاماڵو سامان ببەخشنو چروك نەبن كەچی بۆ تەنها جارێك خۆتيان نەبينی درهەمێك بخەيتە دەستی هەژارێك ! !

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٥٨).

٢ صفة الصفوة (١/٩٦).

قال الحميدي: (قدم الشافعي مرة من اليمن ومعه عشرون الف درهم! فضرب خيمة خارجاً من مكة فما قام حتى فرقها كلها).[١]

واتە: حومیدی دەڵێت: جارێك ئیمامی شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە یەمەنەوە بە مەبەستی حەج کردن بەرەو کەعبەی پیرۆز دەڕواتو (٢٠) هەزار دیناری ئاڵتونی پێ دەبێتو لە دەرەوەی شاری مەککەدا چادرێك دادەکوتێتو نایەتە دەرەوە لێی تا هەمووی بەسەر هەژاراندا دابەش دەکاتو هیچ بە خۆی ناهێڵێت.

١ صفة الصفوة (٢/٢٢٣).

# یانزەیەم

## لەغیرەتو بوێریدا کەسیان پیٚ ناگات:

غیرەتو ئازایەتی بەشێکە لە پەیامی زانای موسڵمان، ئەگەر تیایدا نەبێت پەنا بە خوا کەڕو لاڵ دەبێت لەبەر دەم دەسەلاتداراندا لە ترسی گیانی خۆی یان لە ترسی بڕینی تیکە نانەکەی، هەزاران ناهەقی لە وڵاتدا ببینێت، فزە ناکاتو باسی ناکات بگرە هەندیٚ لە زانایانی قەسرا! ! وەك عەرەب دەڵیٚ (یفتي بما یشتهي الملك)! و ئەو ستەمو گەندەڵکاریانەی دەستەلاتداران دەشەرعێنێت پەنا بە خوا!!

بەلام وەرن ئەی مامۆستایانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەبەر دەم سەرداری زاناکانی حیجازدا چۆك دابدەنو وانەیەك لە غیرەتو بوێری بەرامبەر ئامۆژگاری کردنی دەستەلاتداران بخوێنن!

* قال سید فقهاء الحجاز – رحمه الله – واعظاً هشام بن عبدالملك: (اتق الله في نفسك، فانك خلقت وحدك، وتموت وحدك، وتحشر وحدك، وتحاسب وحدك، ولا والله ما معك ممن ترى أحد) وهشام ینکت في الارض وهو یبکی.

فلما خرج تبعه رجل بكیس لا یدري ما فیه، فقال: ان امیر المؤمنین أمر لك بهذا، فقال: ﴿وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٠٩﴾* فوالله ماشرب عنده قطرة ماء).[1]

واتە: سەرداری زاناکانی حیجاز (طاوس) (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) ئامۆژگاری ئەمیری باوەڕداران (هشام ی کوڕی عبدالملك)ی دەکرد پێی دەوت: لە خوا بترسەو خۆت بپارێزە، چونکە تۆ بە تەنها دروست کراویت، و بە تەنهایش دەمریت، بە

---

* الشعراء: (١٠٩).

١ من روائع القصص (لا: ١٠٣–١٠٤).

تەنهایش حەشر دەکرێیت، سوێند بە خوا ئا ئەمانەی لەگەڵتدان کەسیان لەگەڵت نایەن.. و لەم کاتەدا هشام سەری داخستبوو بە چیلکەیەك زەویەکەی هەڵدەکەنی و دەگریا.

وە کاتێك مامۆستا پشتی هەڵکرد بڕواتەوە پیاوێك دوای کەوت و کیسێکی پڕ لە پارەی بۆ بردو پێی وت: ئەمیری باوەڕداران ئەمەی بۆ ناردوویت، مامۆستایش فەرمووی: من داوای پاداشت ناکەم لەسەر ئامۆژگاری بەڵکو تەنها پاداشتم لە خوا دەوێ! وەڵاهی قومێك ئاویشی نەخواردەوە لەلای ئەمیر.

# دوانزەیەم

## كارەكەیان زۆر بە گەورە سەیر دەكەن:

هەندێ لە مامۆستا ئاینییەكان هەست بە گرنگی كارەكەیان ناكەن وا دەزانن تەنها بەرنوێژی كردنو وتارێكی هەینیەو بەس!!

نەخێر، بەڵكو بۆ ئەوەی گەورەیی‌و ترسناكی كارەكەیان بۆ دەربكەوێت زۆر شیاوە سەرێك لە محمدی كوڕی مونكەدەر بدەن‌و گوێی بۆ بگرن بزانن لەم بارەیەوە چی دەفەرمووێت:

* عن سفيان بن عيينة قال: قال محمد بن المنكدر: (الفقيه يدخل بين الله – عز وجل – وبين عباده فلينظر كيف يدخل).[1]

واتە: سوفیانی كوڕی عویەینە دەڵێ: محمدی كوڕی مونكەدەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: زانای موسڵمان سەفیری نێوان خواو بەندەكانیەتی، بۆیە دەبێت زۆر ئاگادار بێت كە لەو نێوانەدا چۆن هەڵسوكەوت دەكات.

زانای موسڵمان دەبینم باسی خواو گەورەیەكەی دەكات كەچی موچڕكێك بە خۆیدا نایەت! باسی جەهەنەم دەكات! كەچی نیشانەیەكی ترس لەو سزا سەختەی پێوە بەدی ناكرێت! و ناگری!

دەی جێگای خۆیەتی وانەیەكی گرنگ لە لای زانای صاڵح‌و خواناس – هوزەلی – بخوێنن تا دڵیان نەرم ببێت‌و چاویان پڕببێت لە ئاو:

---

١ صفة الصفوة (٢/٩٩).

* عن ابي هارون قال: (كان ابن مسعود الهذلي – رحمه الله – يُحَدِّثنا ولحيته رش بالدموع).[١]

واتە: ئەبو هارون دەڵێ: زانای گەورە – ابن مەسعودی هوزەلی – (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتاری بۆ دەداین‌و قسەی بۆ دەكردین‌و لەو كاتەدا ئەوەندە دەگریاو ئاو لە چاوەكانی دەهاتە خوارەوە ڕیشی تەڕ دەبوو.

(ابن عبدالبر) باسی هەندێ لە تابعین دەكات كە شەونوێژیان بە فەرز زانیووە لەسەر بانگخوازان‌و هەڵگرانی قورئان چونكە كارەكە زۆر ترسناكە خۆسازكردنی تەواوی دەوێت:

* قال ابن عبدالبر: شذ بعض التابعين فاوجب قيام الليل ولو قدر حلب شاة، والذي عليه جماعة العلماء انه مندوب إليه، ونقل الترمذي عن اسحاق بن راهويه انه قال: (انما قيام الليل على اصحاب القرآن).[٢]

واتە: ابن عبدالبر دەربارەی هەندێ لە تابعین دەڵێ: فەتوایان دابوو كە شەونوێژ لەسەر زانایان واجبە ئیتر با زۆر كەمیش بێت بە ئەندازەی مەڕ دۆشینێك، هەرچەندە زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن كە واجب نیە بەڵكو سوننەتە.

تورمذیش لە زانای مەزنی ئیسلام –ئیسحاقی كوڕی ڕاهەوەیهیەوە– دەگێڕێتەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (لە ڕاستیدا شەونوێژ لەسەر هەڵگرانی قورئان دانراوەو لەسەر ئەوان فەرزكراوە).

زانای موسڵمان وەكو خەڵكە عامەكە نیە، كە وەك ئەوان پێ بكەنێت‌و بخەوێ‌و بگەڕێت‌و سوعبەت بكات‌و بێ خەم لە قیامەت‌و ئاگری دۆزەخ، و ئەو كاتە وتارەكانی زۆر وشك‌و بێ گیان‌و بێ كاریگەر دەبن‌و ناتوانن گوێگر ڕابچڵەكێنن.

---

١ صفة الصفوة (٢/٦٥).

٢ البحر الرائق في الزهد والرقائق (لا: ١٢٨).

زانای پیاوصالّح‌و خواناس وهەیبی کوڕی وەرد (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّت) سەرسامە لەو جۆرە زانا موسلّمانانەو دەلّیّ نابیّ وابن:

* عن محمد بن يزيد خنيس قال: قال الوهيب بن الورد — رحمه الله —: (عجباً للعالم كيف تجيبه دواعي لبه الى ارتياح الضحك وقد علم ان له في القيامة روعات و وقفات! وفرعات!؟ ثم غشي عليه).[1]

واتە: محمدی کوڕی یەزیدی خونەیس دەلّیّت: وهەیبی کوڕی وەرد (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّت) دەفەرموویّت: سەرسام دەبم لە زانایەك کە چۆن بیّ دلّی خۆی ناکات‌و پڕ بە لیّوەکانی پیّدەکەنیّت! لە کاتیّکدا دەشزانیّت کە قیامەتیّکی وای لە پیّشە کە پڕیەتی لە ترسناکی‌و لیّپرسینەوەو ڕیّگای پیّچ‌و پلوچ! ئەمەی وت لەهۆش خۆی چوو.

١ صفة الصفوة (٢/١٤٩).

# بەشی حەوتەم

## صاڵحان ( ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ) بە سێ شتی ترسناك خۆشحاڵ دەبن و پێشوازی لێ دەكەن

١- شەهیدبوون و گیان بەخشین بە پەروەردگار؛

٢- ئێش و ئازارو نەخۆشی؛

٣- مردن و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار:

# یەکەم

## شەهیدبوون‌و گیان بەخشین بە پەروەردگار:

هەر گەلێك بتوانێت وا بکات لە ئەندامانی خۆی کە خۆیان بەخت بکەن‌و لە پێناوی بەها بەرزەکانیاندا خۆیان بە کوشت بدەن.. بێگومان ئەو گەلە دەبێتە گەلێکی سامدارو سەرکەوتنیش بەشی دەبێت:

ئەمەش سەرداری مرۆڤایەتیەو خۆی ئاواتی شەهیدبوون دەخوازێت‌و بە کردەوە نیشانی هاوەڵانی دەدات وانەی گیان بەختکردن دەبێ چۆن بێت؟

* عن ابي هريرة – رضي الله عنه – قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (والذي نفسي بيده لو لا ان رجالا من المؤمنين لا تطيب أنفسهم ان يتخلفوا عني ولا أجد ما احملهم عليه، ما تخلفت عن سرية تغزو في سبيل الله).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) کە دەیفەرموو: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە لەبەر ئەوە نەبووایە کە پیاوانێکی زۆر لە موسڵمانان دڵیان نایە لەگەڵم نەیەن بۆ جیهادو ئەگەریش بێن من چەك‌و تفاقم نیە بۆیان، لەگەڵ هەموو سریەیەکدا کە لە پێناوی خودادا دەردەچن لەگەڵیان دەردەچووم..

ئەی زانای شەریعەت کە لەناو کورداندا بە (مەلا) ناسراویت: ئایا هەرگیز ئاواتت خواستووە بە شەهیدی؟ یان ئایا هاتووە بە خەیاڵتدا ڕۆژێ لە ڕۆژان وەك پێشەوایەتی بەرنوێژی موسڵمانان دەکەیت ئەی بە هەمان شێوە دەبێت پێشەوایەتی جیهادی

---

١ اخرجه البخاري، حياة الصحابة (٢/٨١).

موسڵمانان بكەیت لەگەڵیاندا چەك هەڵبگریت‌و تەقە بكەیت؟ دە گوێ بگرە بۆ پێغەمبەرەكەت (ﷺ):

* عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (والذي نفسي بيده لوددت ان أقتل في سبيل الله ثم أحيى، ثم اقتل في سبيل الله ثم أحيى، ثم أقتل في سبيل الله).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە ئاواتەخواز بووم لە پێناوی خوادا بكوژرامایەو دیسان زیندوو بكرامایەتەوە، و پاشان لە پێناوی خوا دیسان بكوژرامایەو پاشان زیندوو بكرامایەتەوە، و پاشان بكوژرامایەتەوەو دیسان زیندوو بكرامایەتەوەو دووبارە بكوژرامایەتەوە.

ئەی برای صالحم، ئەی خوشكی صالیحەم، سەرمەشقانمان زۆر حەزیان بە شەهیدی بووە نەك هەر بۆ خۆیان بەڵكو ئاواتەخوازیش بوون جگەرگۆشەكانیان لە بەرەكانی جەنگدا لە ڕیزی پێشەوەی جیهاد دا بوونایە، دەی گوێ بۆ (ئەبو وائیل) بگرە:

* عن ابي جعفر قال: قال ابو وائل – رحمه الله – : (لأن يكون لي ولد يقاتل في سبيل الله احب اليّ من مأة الف).[2]

واتە: ئەبو جەعفەر دەڵێت: (ئەبو وائل) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: كوڕێكم هەبێت‌و لە پێناوی خوادا بجەنگێت پێم خۆشترە لەوەی (١٠٠) هەزار دیناری ئاڵتونم هەبێت.

خۆ ئەگەر لە سەردەمی تۆدا جیهادو جەنگ لە پێناوی خودادا ئامادە نەبوو تا بەشداریان بكەیت خۆ هیچ نەبێت دەتوانیت لە دڵەوە حەزی لێ بكەیت‌و لەوپەڕی

---

١ رواه البخاري.

٢ الزهد للامام احمد (لا: ٣٥٠).

ڕاستگۆییەوە ئاواتی بۆ بخوازیت و لە خوا داوا بکەیت کە ئەو پلە بەرزەت پێ ببەخشێت و شەهید ببیت و ئەمەش وانەیەکە و جێنشینە مەزنەکەی دووەمی پێغەمبەرمان فێرمان دەکات:

* اخرج البخاري عن اسلم عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) قال: (اللهم ارزقني الشهادة في سبيلك واجعل موتي في بلد رسولك).[1]

واتە: ئەسلەم لە عومەری کوڕی خەتابەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە ئەم نزایەی کردووە فەرموویەتی: ئەی خوای پەروەردگارم شەهیدیم لە پێناوی خۆتدا پێ ببەخشە، و لە شاری پێغەمبەرەکەتدا گیانم بکێشە.

هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) پێشبڕکێیان کردووە لە پێناوی دەرچوون بۆ جیهادو کەس تاقەتی نەبووە لە مەدینەدا بمێنێتەوە لە ناو ژن و منداڵ و پەککەوتە و پیرەکانداو کەچی شەهیدیش بە نەسیبی براکانی تری بێت و لەم بارەیەوە پێم خۆشە گفتوگۆیەکی نێوان باوك و کوڕێك باس بکەن کە چۆن هەردووکیان حەزناکەن لە ماڵدا بمێننەوە:

* قال ابن الجوزي (رحمه الله): (لما ندب رسول الله (ﷺ) الناس الى غزوة بدر ذهب معه زيد بن خيثمة (رضي الله عنهما) قال له ابوه خيثمة: انه لابد لأحدنا ان يقيم، فآثرني بالخروج وقم مع نساءك، فأبي سعد وقال: لو كان غير الجنة لآثرتك به، اني لأرجو الشهادة في وجهي هذا).[2]

واتە: ابن جەوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسڵمانانی خستەڕێ بۆ جەنگی بەدرو لە هەموو خێزانێك فەرمووی با پیاوێك جێ بمێنێ بۆ سەرپەرشتی ماڵ و منداڵەکانیان، و زەیدی کوڕی خەیسەمە (خوای لێ ڕازی بێت) خۆی خستەڕێ بەڵام باوکی پێی وت: کوڕی خۆم با من بڕۆم تۆ لەناو ماڵ و

---

١ حياة الصحابة (٢/٨٠).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٤٢).

منداڵ‌و خێزانەکانتدا بمێنەوە، و سەعدیش شتی وای نەکردو فەرمووی: باوکە گیان ئەگەر مەسەلەکە دەستخستنی بەهەشت نەبووایە دەمبەخشی پێت بەڵام من ئاواتم شەهید بوونە‌و تکام وایە ئەم ناوچاوەم لەپێناوی خودادا بێتە خوارەوە.

لەوانەیە ناوی (حەمەمە)ت نەبیستبێت؟ دەی ئەم پیاوە یەکێك بووە لە هاوەڵە گیان لەسەر دەستەکانی سەروەرمان (ﷺ)و لە گۆڕەپانی جیهادو لە ڕزگارکردنی شاری ئەسفەهاندا لە ئێران شەهید بووە، بزانین چی فەرمووە:

* عن ابن مبارك عن حميد بن عبدالرحمن الحميدي قال: ان رجلا يقال له (حممة) من اصحاب النبي (ﷺ) غزا من اصفهان زمن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) فقال: (اللهم ان حممة يزعم انه يحب لقاءك، اللهم ان كان صادقا فاعزم له بصدقه وان كان كاذبا فاحمل عليه وان كره).[١]

واتە: حەمیدی دەڵێ: پیاوێك هەبوو پێیان دەوت حەمەمە‌و یەکێك بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا (خوای لێ ڕازی بێت) بەشداری ڕزگارکردنی ئەسفەهانی کردووە‌و بەخۆی وتووە: ئەی خوای پەروەردگارم حەمەمە وا گومان دەبات کە حەز بە لیقای تۆ دەکات.. دەی ئەگەر ڕاستەکات بەو ڕاستیەی خۆی لەگەڵ بکەیت‌و شەهیدی بکەیت‌و ئەگەر درۆیش دەکات هەر شەهیدی بکەیت با پێشی ناخۆش بێت.

صاڵحان چۆن حەز بە شەهید بوون ناکەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەو پیاوەی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەوەستێت‌و ترس دەخاتە دڵی دوژمنان چاکترین خەڵکانە لەلای پەروەردگار:

* عن مجاهد، عن أمّ مبشر تبلغ به النبي (ﷺ) قال: (خير الناس منزلة رجل على متن فرسه يخيف العدو ويخيفونه).[٢]

---

١ حياة الصحابة (٢/٨٢).

٢ الجامع لشعب الايمان، البيهقي (٧/١٢٩).

واتە: موجاهید لە دایكی موبەشیر دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: چاكترینی خەڵكی پیاوێكی موجاهیدە كە بەسەر وڵاخەكەیەوە دوژمن ئەتۆقێنێت‌و ئەوانیش ئەو دەترسێنن.

زانا بەغیرەتەكەی ئیسلام سەعیدی كوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەوەندە حەزی لە شەهیدبوون كردووە لەگەڵ هاوڕێ خۆشەویستەكانیدا پێكەوە نزایان كردووو داوای شەهیدیان لە پەروەردگار كردووە:

* عن داود بن ابي هند قال: (لما اخذ الحجاج سعيد بن الجبير (رحمه الله) قال: ما أراني الاّ مقتولاً، وسأخبركم اني كنت انا وصاحبان لي دعونا حين وجدنا حلاوة الدعاء ثم سألنا الشهادة فكلا صاحبي رزقاها وانا أنتظرها، فكأنه راى ان الاجابة عند حلاوة الدعاء).[١]

واتە: كاتێك ستەمكاری عێراق (حەجاج) زانای بە غیرەت‌و تێكۆشەری دەستگیر كردو كردیە زیندان‌و لە زیندانەدا بە هاوڕێكانی فەرموو: هەرچی سەیر دەكەم من دەكوژرێم، چونكە با بۆتان باس بكەم كە من‌و دوو هاوڕێم لە كاتی لەزەتی پاڕانەوەدا داوامان لە خوای گەورە كرد كە شەهیدیمان پێ ببەخشێت‌و دەی هەردوو هاوڕێكەم گەیشتنە ئاواتی خۆیان‌و شەهیدیان پێ بەخشرا، بەڵام من هەر چاوەڕێم، وەك بڵێی لای وابووە لە كاتی شیرینی پاڕانەوەدا دوعا گیرا دەبێت.

دیسان دەچینەوە خزمەت (ئەبو وائیل) واتە: شەقیقی كوڕی سەلەمە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زاناو تێكۆشەرو موجاهید، كە شتێكی زۆر سەرسوڕهێنەری كردووە كاتێك بانگ‌و سەدای جیهادی بیستبێت:

* عن عاصم عن ابي وائل – شقيق بن سلمة – كان له خص من قصب وكان يكون فيه هو وفرسه فاذا غزا نقضه وتصدق به واذا رجع أنشأ بناءه).[٢]

---

١ صفة الصفوة (٢/٥٠).

٢ صفة الصفوة (٢/١٧).

واتە: عاصم دەربارەی (ابی وائیل) كە ناوی شەقیق بن سەلەمەیە دەڵێت: مامۆستا شقیق خانوویەكی هەبوو لە قوڕو قامیش دروستی كردبوو كە جێگەی خۆی‌و ئەسپەكەی دەبوویەوە، هەر كاتێك بڕۆیشتایە بۆ غەزا ئەی ڕوخاندو دارو پەردووەكەی دەكرد بە خێرو كاتێك لە جەنگەكە دەگەڕایەوە وەك خۆی دووبارە دروستی دەكردەوە.

چۆن بە ئاسانی دەگەینە كاروانی صالْحان كە ئەوان بە پارەی خۆیان‌و بە نرخێكی زۆر گران تفاقی جەنگیان دەكڕی ئیتر با زۆر زۆر گرانیش بووایە چونكە شەهیدی پێ دەست دەخەن:

* عن السدي قال: اشترى عمرو بن عتبة فرساً باربعة الآف درهم فعنفوه يستغلونه، فقال: (ما خطوة يخطوها، يقدمها الى الغزو الا وهي احب اليّ من اربعة الآف درهم).[1]

واتە: سەدی دەڵێت: عەمری كوڕی عەتەبە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەسپێكی چاكی گرانبەهای كڕی بۆ جیهادكردن، كە (٤) هەزار درهەمی پێدا، كاتێك خەڵكی لێی تووڕە بوون‌و وتیان زۆر گران كڕیوتەو زۆرت پێی داوە!

ئەویش لە وەڵامدا پێی فەرموون: تەنها یەك هەنگاو كە ئەم ئەسپەم لە ڕێی خودادا هەڵی دەنێ لە لای من لە (٤) هەزار درهەم باشترە.

تەنانەت خوشكانی خواناس‌و سەرمەشقانی صالْحان بەشداری غەزاكانیان كردووە ئیتر بە شۆرینی جلوبەرگی موجاهیدەكانیش بێت!!

* عن كليب بن عيسى قال: (كان العابدة زاجلة (رحمها الله) تخرج الى الساحل فتغسل ثياب المرابطين في سبيل الله).[2]

---

١ هەمان سەرچاوە (٢/٤٤).

٢ صفة الصفوة (٢/٣٤).

واتە: كولەیبی كوڕی عیسا دەڵێ: ئافرەتێكی خواناس هەبوو ناوی (زاجلة) بوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ماڵ و حاڵی خۆی بەجێ دەهێشت و بەرەو سنوورەكانی نێوان وڵاتی ئیسلام و ڕۆمەكان لە لوبنان بۆ ئەوەی جلوبەرگی ئەو موجاهیدانە بشوات كە لە پێناوی خوداداو بۆ ئەوەی نەوەك ڕۆمەكان دزە بكەنە وڵاتی ئیسلام و زیان بدەن لە لادێ نشینەكانی ئەو ناوچە سنووریانە كە پێی دەوترێت (الرباط).

برای صاڵحم سەیری ئەم دوو برایە بكە كە چەندە حەزیان لە شەهیدبوونە و پۆشاكی ئاسنینی جەنگی ناپۆشن نەوەك نەكوژرێن و شەهیدیان بە نەسیب نەبێت!!

قال ابن عمر (رضي الله عنه) قال: عمر بن خطاب (رضي الله عنه) لأخيه زيد بن خطاب (رضي الله عنه) يوم أحد: (أقسمت عليك الا لبست درعي؟ فلبسها ثم نزعها: فقال له عمر: مالك: قال: اني اريد بنفسي ماتريده بنفسك، وفي رواية: اني اريد الشهادة كما تريد، فتركاها جميعاً).[1]

واتە: عبدالله ی كوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لە جەنگی ئوحوددا عومەری كوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) بە زەیدی برای وت: پۆشاكە جەنگیەكەی من لەبەر بكە، و ئەویش لەبەری كردو پاش كەمێك دایكەندەوە و پێی دایەوە، عومەر وتی: بۆچی نایپۆشی؟ زەیدیش وتی: منیش وەك تۆ حەز دەكەم شمشێر بمبڕێت و شەهید بم، لە ڕیوایەتێكی تردا وتی: منیش وەك تۆ حەزم لە شەهیدیە و هەردووكیان — درعەكەیان — بەجێ هێشت.

هەر ئەو عەمری كوڕی عەتەبەیەی كە ئەسپە گرانبەهاكەی كڕی وا ئەمجارە دێتەوە لامان و كۆڕێكمان بۆ دەگرێت لە وتەیەكدا لەسەر خۆشەویستی شەهیدبوون با بزانین چی دەفەرمووێت:

---

١ صفة الصفوة (١/٢٣٢).

* عن الاعمش قال: قال عمرو بن عتبة بن فرقد: سألت الله ثلاثاً فاعطاني اثنتين، وانا انتظر الثالثة، سألته ان يزهدني في الدنيا فما ابالي ما اقبل وما ادبر، وسألته يقويني على الصلاة فرزقني منها، وسألته الشهادة فانا ارجوها).[1]

واتە: ئیمام ئەعمەش دەڵێت: عەمری كوڕی عەتەبە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: سێ شتم لە خوای گەورە داواكرد، ئەویش دوانیانی بۆ هێناومەتەدی‌و چاوەڕێی سێیەمیش دەكەم، یەكەم داوام لێكرد دنیام لەبەر چاو بخات‌و دنیاپەرستی نەكەم‌و ئێستا وام لێهاتووە دنیا هەرچۆن بڕوات گوێی نادەمێ، دووەم داوام لێكرد توانای شەونوێژیم تێدا دروست بكات پێی بەخشیم، سێیەمیش داوام لێكرد شەهیدیم پێ ببەخشێت‌و تكاو ئومێدیشم هەیە ئەویش بێتەدی.

كێ هەیە ناوی (ئوەیسی قەرەنی) نەبیستبێت ئەو پیاوەزنەی كە عەشقی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بەلاّم نەیبینی! ئەو كەسەی كە برا سوفیەكانمان زۆر ڕێزی لێ دەگرن‌و ناوی دەبەن.

دەی با بزانین لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتابداو لە ئازەربایجان‌و لەناو غەزادا نەخۆش دەكەوێت‌و شەهید دەبێت:

* عن عبدالله بن سالم: غزونا آذربايجان زمن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) ومعنا اويس القرني – رحمه الله – فلما رجعنا مرض علينا فحملناه فلم يتمسك فمات).[2]

واتە: عبدالله ی كوڕی سالم دەڵێت: چووین بۆ غەزا بۆ ڕزگاركردنی ناوچەی ئازربایجان لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتابدا (خوای لێ ڕازی بێت) ئوەیسی قەرەنیشمان لەگەڵدابوو، لە كاتی گەڕانەوەماندا ئوەیس نەخۆش كەوت‌و ئێمەش هەڵمان گرت چونكە نەیدەتوانی بڕوات بەڕێوەو لە ڕێگا گیانی سپارد.

---

١ صفة الصفوة (٢/٤٣).

٢ صفة الصفوة (١/٢٤٢).

ئەمەش شمشێرە تیژەکەی پەروەردگارە -خالیدی کوڕی وەلید- (خوای لێ ڕازی بێت) کە لە دوای موسڵمان بوونیەوە بەردەوام سەرکردایەتی سوپای وڵاتی مەزنی ئیسلامی کردووە و لە هەموو غەزاکانیشدا سەرکەوتنی پێ بەخشراوە..

بزانین لە دوا ساتەکانی ژیانیدا خەفەت بۆچی دەخوات؟:

* عن عبدالله بن ابي الزخاد ان خالد بن الوليد – رضي الله عنه – لما حضرته الوفاة بكى وقال: )لقد لقيت كذا وكذا زحفاً ومافي جسدي شبرٌ الاّ وفيه ضربة بالسيف أو رمية بسهم او طعنة برمح وها انا اموت على فراشي كما يموت البعير، فلا نامت اعين الجبناء).[1]

واتە: خالیدی کوڕی وەلید (خوای لێ ڕازی بێت) لە کاتی سەرەمەرگدا ئەسەفی ئەوەی دەخواست کە بە شەهیدی ژیانی تەواو نەبووە و دەفەرمووێت: من بەشداری ئەوەندە و ئەوەندە غەزام کردووە، هەموو لەشم بستێکی نیە کە شوێنەواری شمشێرێك یان تیرێك یان ڕمێکی پێوە نەبێت – کەچی نەکوژرام – و لەسەر جێگا دەمرم وەك چۆن حوشتر ئەمرێت و دەی خوایە چاوی ترسنۆکان تێر خەو نەبێت.

عاشقانی شەهیدی – لەناو کاروانی صاڵحاندا – بێ چەن و چۆن وەردەگیرێن و – قبوڵ خاص –یان بۆ هەیە! چونکە گرانترین کاڵاو خۆشەویسترین شتیان کە گیانی شیرینیانە – دەیبەخشن بە پەروەردگاریان.

بۆیە پیاوی سەرمەشقی کاروانە موبارەکەکە – صلەی کوڕی ئەسیەم – (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە یەکێك لە غەزاکاندا کوڕەکەی لەگەڵدا دەبێت و پێی ناڵێت کوڕی خۆم تۆ شەڕ مەکە نەوەك بکوژرێیت! بەڵکو ئەی چی پێ دەڵێت؟:

أنبا ثابت البناني ان – صلة بن أثيم – رحمه الله – كان في مغزاً له ومعه ابن له فقال له: أي بني تقدم فقاتل حتى أحتسبك، فحمل فقاتل حتى قتل – رحمه الله – ثم تقدم

---

[1] صفة الصفوة (١/٢٣٢).

فقتل، فاجتمعت النساء عند امرأته – معاذة البدوية – رحمها الله – فقالت: (مرحباً ان كنتن جئتن لتهنئتي فمرحباً بكن، وان كنتن جئتن بغير ذلك فارجعن).[1]

واتە: سابت البنانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی (صلةی کوڕی ئەسیەم)ی دەکرد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە جارێك لە غەزادا لەگەڵ کوڕەکەیدا دەبێت ڕوودەکاتە کوڕەکەی و پێی دەڵێت: ئەی کوڕی خۆم بڕۆ پێشەوەی جەنگەکە بەڵکو شەهید ببیت و ئەو کاتە منیش لەسەر مردنی تۆ ئارام دەگرم و ناڕەحەتی ناکەم و پاداشتی خوایم دەست دەکەوێت.

ئەو لاوە خوێن گەرمە کردی بە شمشێرەکەیداو ڕۆیشتە ناوجەرگەی شەڕەکەو شێرانە جەنگا تا شەهید بوو، ئەرجا باوکیشی لەو لایەوە شەهید بوو.

کاتێك هەردوو جەنازەکەیان هێنایەوە بەردەستی خێزانەکەی کە ئافرەتێکی صالح و خواناس و خۆگرو بە ئارام بوو ناوی (مەعازەتولبەدەویە) بوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و ئافرەتانی موسڵمانان بۆ دڵنەوایی هاتن بۆ لای و ئەویش ڕووی تێکردن و فەرمووی:

(یاخوا بەخێر بێن ئەگەر بۆ پیرۆزبایی هاتوون لە شەهیدبوونی مێردەکەم و کوڕەکەم.. بەڵام ئەگەر بۆ مەبەستی تر هاتوون تکایە لە کوێوە هاتوون بگەڕێنەوە ! !).

---

١ صفة الصفوة (٢/١٤٥).

# دووەم

## پێشوازیان لە نەخۆشی و ئازار کردووە:

نەخۆشی زۆر ناڕەحەتە چونکە شتێك نیە بڵێی قەیناکا هیچ نیە! خانووەکەت نەمێنێت دەچیتە کرێچی، ئۆتۆمبێلەکەت لە دەست بدەیت بەپێ دەگەڕێیت، ئەگەر وەزیفەکەت لە دەست بدەیت نامریت لە برساندا! بەڵام ئەگەر مرۆڤ نەخۆش بکەوێت هەموو ئەوانەی پێشووی دەچێت و خۆیشی لەبەر چاو دەکەوێت..

بەڵام ئیسلام کاریگەریەکی سەرسوڕهێنەر بەسەر شوێنکەوتووە تێگەیشتووەکانیدا دەهێنێت و وایان لێدەکات ڕقیان لە نەخۆشی نەبێت و لێی نەترسن لە ژیان نائومێد نەبن وەك چۆن ئەوروپیەکان کە نەخۆشی ترسناك دەگرن خۆیان دەکوژن!! یان داوا لە دکتورەکەی دەکات دەرزیەکی ژەهری لێ بدات!!

بەڵکو لەم چەند لاپەڕەیەی داهاتوودا شتی وات دەکەوێتە بەر چاو کە سەرسام ببیت لەو کاریگەریە مەزنەی ئیسلام لە موسڵماناندا دروستی کردووە.

لەڕزوتا هەر کەسێك بە قورسی بیگرێت - انشاء الله - لە ئاگری دۆزەخ بەدوور دەبێت ئەمەش پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) تێمان دەگەیەنێت لە کاتی سەردانی نەخۆشێکدا:

* اخرج الطبراني في الصغير والأوسط عن عائشة - رضي الله عنها - قالت: (فقد النبي (ﷺ) رجلاً كان يجالسه فقال: (مالي فقدت فلاناً)؟ فقالوا اعتبط، فقال: قوموا حتى نعوده! فلما دخل عليه بكى الغلام، فقال له النبي (ﷺ) (لا تبك، فان جبريل أخبرني ان الحمى حظ أمتي من جهنم).[1]

---

١ حياة الصحابة (٣/٢٢٣-٢٢٤).

واتە: عائیشە دایکی -باوەڕداران- (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پیاوێکی پرسی کە جاران لەگەڵیدا دادەنیشت و فەرمووی: ئەوە چیە فلان کەس دیار نیە؟ وتیان: قوربان نەخۆشی لەرزوتای گرتووە! فەرمووی: دەی هەڵسن با سەردانی بکەین، کاتێك چوونە لای دەستی کرد بە گریان و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: مەگری ئەی لاو، چونکە جوبرەئیل پێی وتم کە لەرزوتا بەشە جەهەنەمەکەی ئومەتی منە، واتە لەوێ ناچێتە ناو ئاگرەوە و لێرە دیویانە.

صالّحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) زۆر خۆشحاڵبوون بە نەخۆشی وەك چۆن خەڵکی بە خەڵات و دیاری دڵخۆش بوون! ئەمەش پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆمان باس دەکات:

* اخرج ابن ابي ماجه وابن ابي دنيا عن ابي سعيد الخدري – رضي الله عنه – في حديث طويل.. فيها قال رسول الله (ﷺ): (ولأحدهم كان أشد فرحاً بالبلاء من أحدكم بالعطاء).[١]

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموودەیەکی درێژ لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە دەربارەی نەهامەتیەکانی نەخۆشی و لە کۆتایی فەرموودەکەیدا فەرمووی: ئەو پیاوصالّحانەی – کە خوا نەخۆشیان دەدات بەسەردا – خۆشحاڵ دەبن بەو دیاریە زۆر لە ئێوە زیاتر کە خۆشحاڵ دەبن بەوەی خەڵاتێکتان بکرێت.

خوێنەران، شتی وا سەیرتان دیوە نەخۆش بوون و ئازاریان زۆر بووە کەچی ڕازی نەبوون پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دوعای چاك بوونەوەیان بۆ بکات:

* اخرج احمد عن جابر – رضي الله عنه – قال: إستأذنت الحمى على رسول الله (ﷺ) فقال: من هذه؟ ام ملدم، فار بها الى اهل قباء، فلقوا منها ما يعلم الله، فأتوه

١ صحيح ابن ماجه في الفتن (٢٣) حديث (٢٤-٢).

فشكوا ذلك اليه، فقال: (ما شئتم ان شئتم دعوت الله فكشفها عنكم، وان شئتم أن تكون لكم طهوراً؟ قالوا: أو تفعل؟ قال: نعم، قالوا: فدعها).[1]

واتە: جابری كوڕی عبدالله (خوای لیٚ ڕازی بیٚت) دەلیٚ: لەرزوتا ڕوخسەتی خواست‌و هاتە خزمەت پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) پیٚغەمبەریش فەرمووی: ئەمە كیٚیە؟ ئەویش وتی: من دایكی چارەسەرم، پیٚغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بڕۆ ئەهلی قوباء تووش بكە بە خۆتەوە، ئیتر ئەوانیش مەگەر خوا بزانیٚت چەند ناڕەحەت بوون پیٚیەوەو تا وایان لیٚهات هاتنە خزمەت ئازیزو سكالاٚی حالٚی خۆیان كردو ئەویش پیٚی فەرموون: خۆتان سەرپشك بن ئەگەر حەز دەكەن دوعاتان بۆ دەكەم خوا شیفاتان بدات‌و ئەگەر ئەشتانەویٚت با بمیٚنیٚت‌و پاكتان بكاتەوە، وتیان بۆ پاكمان دەكاتەوە؟ فەرمووی: بەلیٚ: وتیان: دەی لیٚمان گەڕیٚ با چاك نەبینەوە.

ئەم پەروەردە ئیسلامیە جوان‌و ناوازەیە كە پیٚغەمبەر (ﷺ) هاوەلاٚنی لەسەر گۆش دەكرد، كاریگەری خۆی بەجیٚهیٚشت لەسەریان.. ئەمە (أبو درداء)ە زانا مەزنەكەی ولاٚتی پیرۆزی شام بزانین ئایا نەخۆشینی خۆش ویستووە؟ بۆچی؟

* قال أبو درداء (رضي الله عنه): (احب المرض تكفيراً لخطيئتي).[2]

واتە: –ابو درداء– (خوای لیٚ ڕازی بیٚت) دەفەرموویٚت: نەخۆشینم خۆش دەویٚت چونكە دەبیٚتە هۆی سڕینەوەی گوناهەكانم، بۆیە ئیٚمەی كوردی موسلْمانیش كاتیٚك سەردانی نەخۆشیٚك دەكەین دەلْیٚین (كەفارەتی گوناهەكانت بیٚت).

زانای مەزن‌و پیاو صالْح (عەتای كوڕی ڕیباح) ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت لە ئەبو هورەیرەوە دەگیٚڕیٚتەوە كە لەرزوتای خۆش ویستووە بزانین لەبەرچی؟:

---

١ رواه احمد ورواته رواة صحيح، حياة الصحابة (لا: ٣/٢٢٣).

٢ صفة الصفوة (١/٣٢٣).

* عن عطاء بن ابي الرباح – رحمه الله – عن ابي هريرة – رضي الله عنه – قال: ما وجع احب اليّ من الحمى، لأنها تعطي كل مفصل قصطه من الوجع وان الله تعالى يعطى كل مفصل قصطه من الأجر).[١]

واتە: عەتای كوڕی ئەبی ڕیباح دەڵێت: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: هیچ نەخۆشیەكم ئەوەندەی لەرزوتا پێ خۆش نیە، چونكە ئازارەكەی بە هەموو جومگەكاندا بڵاودەبێتەوە، و بەو بۆنەیەوە هەموو جومگەكانی لەش لە پاداشت بێبەش نابن.

بە ڕاستی سید قطب بە ڕەحمەت بێت ناوێكی جوان و شایستەی لە هاوەڵان ناوەو ناوی ناون (جیل قرآني فريد) (نەوەیەكی قورئانی ناوازە)، ئەی ئەگەر ناوازە نەبن تا ئێستا مێژوو شتی وای بە خۆیەوە دیوە؟ كە تاعون بە ڕەحمەت و بەخشش بزانن و لێی نەترسن؟!!.

دە گوێ بگرە بۆ موعازی كوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێت)لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعوندا چی دەفەرمووێت؟:

* قال عبدالله بن رافع: لما طعن زوجتا معاذ بن جبل – رضي الله عنه – وابناه بالطاعون وهلكوا، طعن هو في ابهامه فجعل يمسها بفيه ويقول: (اللهم انها صغيرة فبارك فيها، فانك تبارك في الصغير، حتى هلك ويقول: اللهم آت آل معاذ النصيب الأوفر من هذه الرحمة –اي الطاعون–).[٢]

واتە: عبدالله ی كوڕی ڕافع دەڵێ: كاتێك هەردوو خێزانەكەی و هەردوو كوڕەكەی توشی نەخۆشی تاعون بوون و بەو هۆیەوە شەهید بوون!، خۆیشی سەرەتای تاعون دای لە پەنجە گەورەی دەستی و ئەویش ئەو پەنجەیەی دەگرت و ماچی دەكردو

---

١ صفة الصفوة (١/٣٥٢).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٥٨).

دەیفەرموو: خوایە ئەمە هیچ نیە بچووکە! داوات لێدەکەم زیادی بکەیت چونکە هەر تۆی بەرەکەت دەخەیتە شتی کەم و زیادی دەکەیت، تا وردەوردە گەورە بوو تا ئەو ساتەی شەهیدی کرد هەر دەیفەرموو: ئەی خوای پەروەردگارم زۆرترین بەشی ئەم ڕەحمەتە بدە بەسەر بنەماڵەی موعازدا.

ئافرەتانی ئەم ئیسلامەش هیچیان لە پیاوان کەمتر نەبوو لە پێشوازی کردن لە نەخۆشی و دەردو بەلا! لەم بوارەدا خوشکێکی وەك (ام الاسود) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وانە بە ڕێبوارانی کاروانەکە دەڵێتەوە:

* قال وكيع حدثنا ابي عن منصور: ان ام الأسود – رحمها الله – اقعدت من رجليها، فجزعت ابنة لها، فقالت: اللهم ان كان خيراً فزد).[1]

واتە: وەکیع دەڵێت: باوکم لە مەنصورەوە بۆی گێڕامەوە کە: ئافرەتێك هەبوو بە ناوی (أم الاسود) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نەخۆشیەکی گرت و قاچەکانی ئیفلیج بوون و لە جێگەدا کەوت، کچەکەی دەستی کرد بە گریان بۆ دایکی، دایکیشی وتی: خوایەگیان ئەگەر دەزانی خێری پێوەیە ئەم نەخۆشیەم بۆمزیاد بکەیت.

خوشکێك ئەناسم لە هەڵەبجە دەژی کەمێك دڵی ئازاری هەبوو، چوو چەندان عیادەو دکتۆرو ئەمسەرو ئەوسەری کرد تا بزانێت چیەتی، دکتۆرەکان وتیان نەخۆشی دڵت هەیە! ئیتر ئەو داماوە قەڵەمی دەست و ئەژنۆی شکاو تاقەتی پێکەنین و قسەو ئیش و کارو ماڵداری نەما!! هەمیشە دەگریا! چونکە لە قوتابخانەی صاڵحاندا ئەم وانەی نەخوێندبوو زۆر بێ ئارام بوو..بەڵام ئەو خوشکەو هەموو خوشك و برایەکی تریش دەبێت بچینە خزمەت وەکیع و چۆك دابدەین و وانەیەك لەسەر خۆشەویستی نەخۆشین و نەترسان لێی بخوێنین:

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٥٨).

* قيل لربيع بن خيثم الثوري حين اصابه الفالج، لو تداويت؟: فقال: (لقد عرفت ان الدواء حق ولكنني ذكرت عاداً وثموداً وقروناً بين ذلك كثيراً، فكانت فيهم الأوجاع وكان لهم الأطباء فما بقى المداوي ولا المداوى).[1]

واتە: كاتێك ڕەبیعی كوڕی خەیسەمی سەوری قاچەكانی ئیفلیج بوون، پێیان وت: ئەی چۆنە چارەسەرێكی خۆت بكەیت؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (من ئەوە دەزانم چارەسەر شتێكی ڕاستە، بەڵام من كە بیر لە نەتەوەكانی عادو سەمودو سەردەمەكانی نێوان ئەو دوانە دەكەمەوە، كە جۆرەها ئێش و ئازارو نەخۆشییان تێدابوو، هەروەك چەندان دوكتۆرو حەكیمیان هەبوو، كەچی نە دوكتۆرەكان و نە نەخۆشەكان كەسیان نەمان و هەموو مردن)، واتە: ئیتر چارەسەر بە شتێكی خۆخەڵەتێنەر دەزانم.

ئەی برای صالحی نەخۆش و ئەی خوشكی نەخۆش، ئەگەر خوای گەورە نەخۆشیەكی دا بەسەرتدا.. ئاگاداربە لە بەندایەتی و خواناسیت نەخات و لە خواناسی ساردنەبیتەوە.. ئەگەر ئەم باسەی عورووەی كوڕی زوبێری كوڕی عەوام بخوێنیتەوە لەوانەیە سودێكی باشی لێ وەربگریت إنشاء الله:

* عن مسلمة بن محارب قال: وَقَعَتْ في رِجْلِ عروة بن الزبير – رحمه الله – الآكلة وقطعت ولم يدع تلك الليلة وردة وقطعت ولم يمسكه أحد).[2]

واتە: مەسلەمەی كوڕی موحاریب دەڵێت: قاچێكی عورووەی كوڕی زوبێر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) تووشی نەخۆشی پوچەڵی بوو، دوكتۆرەكان وتیان: پێویستە ببڕێتەوەو ئەویش ڕازی بوو بڕیانەوە بۆی، بەڵام هەر ئەو شەوە وازی لە ویردو شەونوێژو زیكرەكان نەهێناو هەر لەسەریان بەردەوام بوو، هەروەك نەیهێشت كەس بیگرێت لە كاتی بڕینەوەی قاچیدا.

---

١ صفة الصفوة (٢/٣٨).

٢ صفة الصفوة (١/٦٢).

ئەمەش پیاوێكی ترە لە پیاوصالّحە سەرمەشقەكانی مێژووی ئیسلام و ناوی عبدالله ی كوڕی عەباسەو پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ناوی نابوو – زانای ئوممەتی ئیسلام – حبر الامة – سەیر بكە چۆن ئامادە نیە چاوی نەشتەرگەری بكات و ئاوەكەی بۆ لابەن، ئەگەر لە تەنها یەك ڕكات نوێژ دوای بخات:

* عن سماك ان ابن عباس – رضي الله عنه – سقط في عينه الماء فذهب بصره، فأتاه هؤلاء الذين ينقبون العيون ويسلون الماء، فقالوا: خل بيننا وبين عينيك نسيل ماءهما ولكنك تمكث خمسة أيام لا تصلي، قال: لا والله ولا ركعة واحدة اني حدثت من ترك صلاة واحدة متعمداً لقى الله – عز وجل – وهو عليه غضبان).[1]

واتە: سەمماك دەڵێت: ئیبن عەباس (خوای لێ ڕازی بێت) ئاوی سپی هات بەسەر چاویداو توانای بینینی نەما، دكتۆرەكان ئەوانەی ئاوی چاو لادەبەن و نەشتەرگەری بۆ دەكەن هاتن بۆ لای و پێیان وت: وازمان لێ بێنە با چاوت دەستكاری بكەین و ئاوەكەی بگرین بەڵام بە مەرجێك پێنج ڕۆژ نابێت نوێژ بكەیت!

عبدالله فەرمووی: نەشتەرگەریم بۆ مەكەن چونكە من ڕازی نیم تەنها یەك ڕكاتیشم بفەوتێت چونكە من خۆم باسم كردووە بۆ خەڵكی ئەو فەرموودەیەی كە دەفەرمووێت: هەر كەسێك بە ئەنقەست یەك نوێژ نەكات ئەوە كاتێ دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای – عز وجل – دەبینێت خوا لێی تووڕەیە.

لە ئەوپەڕی چڵەپۆپەی نەخۆشیداو لە سەرەمەرگیشدا هەر خۆیان بە دوور دەگرن لە دنیاپەرستی و وەرگرتنی پارەی حەرام و ئامۆژگاری خەڵكی دەكەن واتە پیاوێكی وەك عومەری كوڕی عبدالعزیز (١٠٠) هەزار دیناری ئاڵتون وەرناگرێت تا هیچ نەبێت دابەشی بكات بەسەر كوڕو كچەكانیدا:

---

١ صفة الصفوة (٢/٢٥٨).

* قال عمر بن عبدالعزيز – رحمه الله – لابن عمه – مسلمة بن عبدالملك – وقال له عمر – وهو اشد حالات المرض – انظر يا مسلمة بايّ منزل تركتني وعلى ايّ حال اسلمتْني اليه الدنيا ! فقال له مسلمة: هذه مائة الف دينار فاوص بها بما أحببت، قال: (أوخير من ذلك يا مسلمة؟ ان تردها من حيث أخذتها، قال مسلمة: جزاك الله عنا خيراً يا أمير المؤمنين، والله لقد ألنت قلوبا قاسية، وجعلت لنا ذكراً في الصالحين).[1]

واتە: لە کاتی نەخۆشی‌و سەرەمەرگیدا عومەری کوڕی عبدالعزیز – بە مەسلەمەی ئامۆزای – وت: سەیرکە مەسلەمە گەیشتوومەتە چ حاڵێك‌و دنیا چی بەسەر هێنام.

مەسلەمەش وتی: دەی فەرموو ئەوە (١٠٠) هەزار دینارە دەیبەخشم پێت‌و تۆش بۆ کێ وەسیەتی پێ دەکەیت لە دوای خۆت بیکە! عومەر فەرمووی: ئەی مەسلەمە ئەی بۆ شتێکی لەوە باشترت پێ نەڵێم؟ لە کێت سەندووە بۆی بەرەوەو بیبەرەوە بۆ شوێنی خۆی!

مەسلەمەیش وتی: خوا لە باتی ئێمە پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەی ئەمیری باوەڕداران، بەڕاستی بەهۆی تۆوە دڵانێکی وشك‌و ڕەق نەرم بوون، و باس‌و خواسی صالّحانت لەناوماندا زیندوو کردەوە.

---

١ عمر بن عبدالعزيز للصلابي (لا: ٢٩٤) وەرگێڕانی عمر توفيق الخطاط، بڵاوکراوەی نارین.

# سێیەم

## پێشوازیان لە مردن كردووە:

مردن كارەساتێكی زۆر ترسناكە! ڕووداوێكی زۆر دەگمەنە! بیر بكەرەوە براو خوشكانم لە ماوەی چاوتروكانێكدا مرۆڤێك بەو گەورەییەی بە یەكجاری لەم دنیایە دا لەبەر چاومان ون دەبێت!!

بۆیە ژیان ئەگەر خۆشترین حاڵیشمان هەبێت مادام مردن كۆتاییەكەیەتی، بەسە كە تام‌و چێژی نەمێنێ!.

بەڵام بە لای شوێنكەوتووانی قورئانەوە مردن مانایەكی تری هەیە! زۆر مەزنترە لەوەی شوێنكەوتووانی دنیا لێی تێ دەگەن، و ئیسلام تاكە بەرنامەیەكە كە توانیویەتی ئەو كارەساتە ناخۆش‌و دژوارە لەبەر چاوی خەڵكی سووك‌و ئاسان بكات وایان لێ بكات نەك هەر لێی نەترسن، بەڵكو لە هەموو دڵێكیانەوە حەزیشی لێ بكەن!! ئەمەش گەورترین سەروەریە بۆ ئیسلام.

ئەوەتا خوای – عز وجل – زۆر بە سوك‌و بێ نرخ ئەم دنیایەمان دەخاتە بەرچاو! ئەزانی بۆچی تا پشتی پێ نەبەستین‌و دنیاپەرستی ڕوومان تێ نەكات‌و دڵی پێ خۆش نەكەین وەك دەفەرموێت:

* قال الله – عز وجل – في كتابه العزيز: ﴿إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾﴾[1].

---

١ سورة غافر: (الآية: ٣٩).

واتـە: خـوای – عـز وجـل – دەفـەرمووێت: بـە ڕاسـتی ئـەم ژیانـەی دنیـا خۆشـی‌و سەفایەکی کاتیەو ژیانی ئەو دنیاو لە بەهەشتدا ژیان‌و خۆشـی‌و کامـەرانی هەیـە بـەبێ بڕانەوەو بە بەردەوامی.

بۆیە پێشەواکەیشمان (ﷺ) ڕووی دەکـردە پـەروەردگارو داوای لێدەکرد کـە لێـی خۆش بێت‌و بیگەڕێنێتەوە بۆ لای هاوڕێ بەرزو بڵندەکەی کە پەروەردگاریەتی:

* عن عائـشة رضـي الله عنهـا قالـت: ان رسـول الله (ﷺ) في آخـر حياتـه قـال: (رب اغفرلي والحقني بالرفيق الأعلى).[1]

واتە: عائشەی کچی ئەبو بەکرو دایکی بـاوەڕداران دەربـارەی دوا سـاتەکانی ژیـانی ئازیزمـان (ﷺ) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە دواسـاتەکانی تەمەنیـدا دەیفەرموو: خوایە لێم خۆش ببەو بمگەڕێنەرەوە بمگەیەنە بە هاوڕێی بەرزو بڵندم واتە خوای پەروەردگار، دەی کەس هەیە لە چڵەپۆپەی حوکمڕانیدا ئەم داوایە لـە خـوای خۆی بکات.

بەڵێ شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) دەتوانن ئەو کارە قورسـە بکەن – وەك یوسف پێغەمبەر (علیه السلام) بن کە لە خوا پاڕایەوەو فەرمووی:

* قال الله تعالى على لسان يوسف: ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾.[2]

واتە: خوای گەورە لەسەر زمانی یوسف پێغەمبەر (علیه السلام) دەفەرمووێت: ئەی پەروەردگارم دوای ئەوەی بەرزترین دەسەڵاتت پێدام‌و توانـای خەوپەرژنیـشت پێـداوم

---

١ اخرجه البخاري ومسلم في الصحيحين.

٢ سورة يوسف (الآية: ١٠١).

دەی من دڵم بە هیچیان خۆش نیە بەڵکو حەز دەکەم بە موسڵمانەتی بمرێنی و بمگەیەنیتە پیاوصاڵحان.

با پێکەوە ئەی خوشکان و برایان ی ناو کاروانی موبارەکی صاڵحان سەرێك بدەین لە قوتابیانی یەکەمی ئەم ئیسلامەو بچینە خزمەت هاوەڵانی گیان لەسەردەستی پێغەمبەرو بزانین ئەم پەروەردە قورئانیە تا چ ئاستێك کاریگەری لەسەریان هەبووەو دنیایان لەبەر چاو بچووك بووەو حەزیان لە مردن بووە چونکە دەیانگەیەنێتەوە بە پەروەردگاری عەزیزیان و پیاو صاڵحانی پێش خۆیان:

سەرەتا دەچینە خزمەت بانگوێژەکەی پێغەمبەرمان (ﷺ) بیلالی حەبەشی (خوای لێ ڕازی بێت) بزانین لە سەرەمەرگدا چۆن سەرزەنشتی خێزانەکەی دەکات و ناهێڵێت بگری بۆی:

* لما حضرت بلال – رضي الله عنه – الوفاة، قالت إمرأته: واحزناه ! ! قال لها: بل واطرباه غداً ألقى الاحبه، محمداً وحزبه).[١]

واتە: کاتێك بیلالی کوڕی ڕیباح (خوای لێ ڕازی بێت) لە سەرەمەرگدا بوو مردنی نزیك بووبوویەوە، خێزانەکەی هاوارو سەلای لێ هەستا بۆی و بە دەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە وتی: وای کە جێگای داخ و ئەسەفە !، بیلال گیانی نەسپاردبوو لە هۆش خۆی چووبوو بۆیە چاوی هەڵبڕی و بە هاوسەرەکەی خۆی فەرموو: نەخێر، وا مەڵێ، بەڵکو وای کە جێگای سەفاو خۆشیە – کە من دەمرم – چونکە سبەینێ دەگەمە دۆست و خۆشەویستان، دەگەمەوە خزمەت محمدو هاوەڵان.

(ئەبو دەرداء)یش شەیدای مردنەو سامی لێ ناکات لەبەرچی؟ لە خۆشی چی؟ دەبێ مردن چ خۆشیەکی لەخۆ گرتبێت؟ با ئەم پرسیارانە لەو هاوەڵە مەزنەی پێغەمبەرمان (ﷺ) بکەین؟:

---

١ البحر الرائق (لا: ١٧٢).

* قال ابو درداء – رضي الله عنه –: (أحب الموت اشتياقاً الى ربي عز وجل).[١]

واتە: ئەبو دەرداء (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: مردنم خۆش دەوێت و حەزم لێیەتی چونکە حەز دەکەم بگەمە خزمەت پەروەردگارم و – لە ڕێگای مردنیشەوە ئاواتە خۆشەکەم دێتەدی.

ئەمینداری نهێنیەکانی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) هاوەڵێکی بەڕێز بوو بە ناوی (حوزەیفەی یەمانی) (خوای لێ ڕازی بێت) ئەوەندە بێ خەم بوو لە مردن لە سەرەمەرگدا بە (بەنی عەبس) فەرموو: کفنتان بۆ هانیوم؟ دەی ئەگەر هێناوتانە نامەوێ قوماشی گرانبەها بێت، سڵاوی خوات لێ بێت ئەی حوزەیفە لە سەرەمەرگیشدا ئیسراف و زیادەڕەویتان پێ ناخۆشە:

* عن ابي وائل قال: (لما ثقل حذيفة اليماني – رضي الله عنه –، اتاه ناس من بني عبس، فقال لنا: اية ساعة هذه؟ قلنا: جوف الليل! فقال: أعوذ بالله من صباح الى النار، ثم قال: أجئتم معكم بأكفان؟ قلنا: نعم، قال: فلا تغالوا باكفاني فانه ان يكن لصاحبكم عند الله خير فانه يبدل بكسوته خيراً منها والاّ سلب سلباً).[٢]

واتە: ئەبو وائل دەڵێت: کاتێك حوزەیفەی یەمانی (خوای لێ ڕازی بێت) کاتی سەرەمەرگی هاتە پێشەوە و ئێمەش لەگەڵ کۆمەڵێك لە خزمانی – بەنی عەبسدا – چووینە لای، و ئەویش لێی پرسین: ئێستا چ کاتێکە؟ وتمان: ناوجەرگەی شەوە، هاواری کرد: پەنا دەگرم بە خوا لە بەرەبەیانیەك کە بەرەو ئاگرم بەرن، پاشان فەرمووی: کفنتان بۆ هێناوم؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: کفنی گرانبەهام بۆ نەهێنن

١ صفة الصفوة (١/٣٢٣).

٢ صفة الصفوة (١/٣١٢).

چونكە ئەم هاوڕێیەتان ئەگەر لە لای خوای پەروەردگار پلەوپایەی باشی هەبێت ئەوە جلوبەرگەكەی بۆ دەگۆڕێتەوە بە جلوبەرگێكی باشتر، خۆ ئەگەر وا دەرنەچوو ئەوە كفن و مفنی لادەبەن و ڕووتی دەكەنەوە.

ئەمەش ئیبراهیمی نەخەعیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی صالحانی پێش خۆیانمان بۆ دەكات و بە ڕەوشتێكی سەیر! بە حەزێكی سەیر وەسفیان دەكات كە ئێمە لەو شتە زۆر دەترسین:

* عن منصور عن ابراهيم النخعي – رحمه الله – انه قال: (كانوا يستحبون شدة النزع).[1]

واتە: مەنسور لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە دەگێڕێتەوە كە مامۆستای ئیمامی شافعی بووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) كە فەرموویەتی: ئەوان – واتە صالحانی پێش ئەو لە هاوەڵان و تابعین و تابعی تابعین – زۆر حەزیان بە ئێش و ئازاری كاتی گیان دەرچوون بووە.

ئەی براو خوشكانم بە خوا ناگەینە تۆزی پێی صالحان تا حەز لە مردن نەكەین چونكە مردن بەربەستێكە لە نێوان ئێمەو بەهەشتدا یان ئێمەو پەروەردگاری خۆشەویستماندا! بۆ وا نەبین؟

خۆ صالحان (١٠ تا ١٥) ساڵ پێش مردنیان گۆڕیان بۆ خۆیان هەڵكەندووەو چەندان جار چوونەتە ناویەوەو بیری مردنیان كەوتۆتەوەو قورئانیان تێدا خوێندووە:

* عن شهاب الدين بن عباد قال: كان (ضرار بن مرّة) – رحمه الله – قد حفر قبره قبل موته بخمس عشرة سنة، وكان يأتيه فيختم فيه القرآن).[2]

---

١ صفة الصفوة (٥٦/١).

٢ صفة الصفوة (٧٥/٢).

واتە: شیهابەدینی کوڕی عباد دەڵێ: زیراری کوڕی موڕڕە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پانزە ساڵ پێش مردنی گۆڕەکەی خۆی هەڵکەندبوو، و هەموو جارێك دەچوو سەردانی دەکردو قورئانی تێدا دەخوێندەوەو خەتمی دەکرد.

سەرێك لە مزگەوتەکەی کوفە بدەین شارەکەی پێشەوامان عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خوای لێ ڕازی بێت)و هەواڵی ئەو پیاوە پیرە بزانین کە زانای ناودار سوفیانی سەوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی دەکات بۆمان:

* قال ايوب بن موسى: سمعت سفيان الثوري – رحمه الله – يقول: رأيت شيخاً في مسجد الكوفة يقال له – ابو سهل الترمذي – يقول: انا في هذا المسجد منذ ثلاثين سنة انتظر الموت ان ينزل بي ولو أتاني ما أمرته ولا نهيته عن شئ، ولا لي على أحد شيء ولا لاحد عندي شيء).[1]

واتە: ئەیوبی کوڕی موسا دەڵێ: لە سوفیانی سەوری م بیست (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: پیاوێکی بە ساڵاچووم بینی لە مزگەوتی کوفەو پێیان دەوت (أبو سهل الترمذي) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: من ماوەی (٣٠) ساڵە لەم مزگەوتەدا چاوەڕوانی مردن دەکەم کە پێم بگاتو هەر کاتێکیش بێت بۆم هیچی پێ ناڵێمو بەرگریشی لێ ناکەم، شوکر تا ئەم کاتە هیچم لەلای کەس نیەو کەسیش هیچی لە لام نیە.

هەیە لە مردن دەترسێت نەك هەر ئەوە بەڵکو هەیە هەر بە زیندوویی داوا دەکات لە منداڵو کەس‌و کاری کە با ببینم بزانم چۆن بۆم دەگرین! ! و لەناو کۆمەڵگە دوور لە تێگەیشتنە قورئانیەکاندا کێ زۆر بگری ئەوە خۆشەویستترو دڵسۆزترە ! ! !

کەچی مامۆستا سەعید بە جۆرێکی تر ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات:

---

١ صفة الصفوة (١/١٣٠).

* عن عمر بن سعيد قال: (دعى سعيد بن الجبير – رحمه الله – ابنه حين دعي لقتل فجعل إبنه يبكى! فقال لابنه ما يبكيك؟ ما بقاء ابيك بعد سبع وخمسين سنة).[1]

واتە: عمری كوڕی سەعید دەڵێ: كاتێك لە لایەن ستەمكاری عێراق –حەجاجی كوڕی یوسفەوە– فەرمانی پڕ لە ستەمی لە سێدارەدانی زاناو خواناسی مەزنی ئیسلام سەعیدی كوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەرچوو.. داوای كرد كوڕەكەی بۆ بانگ بكەن تا چاوی پێی بكەوێت و كاتێك كوڕەكەی هات بۆ لای باوكی بینی بەو حاڵەوە دەستی كرد بە گریان و فرمێسك ڕشتن! و باوكیشی سەرزەنشتی كردو پێی فەرموو: كوڕی خۆم ئەوە بۆچی دەگریت؟ مان و نەمانی باوكت پاش (٥٧) ساڵ تەمەن پێم ناڵێی سوودی چیە؟!

من و تۆ ئەگەر پێمان بڵێن حەزت لە چیە؟ چەندان خواردنی خۆش و ئۆتۆمبێلی مۆدیل بەرزو كۆشكی فیرعەونی و لەش ساغیمان بە خەیاڵدا دێت!! بەڵام پێشەوا صاڵحەكانمان بە پێچەوانەی ئێمەوە حەزیان لەوەیە ڕۆژێك زووتر ئەم دنیایە بەجێ بێڵن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای خۆشەویستیان.

ئەم وانەیەش خوشكێكی سەرمەشق لە بواری صاڵح بووندا پێشكەشمانی دەكات بزانین ئەو خوشكە كێیە

* حدث سلمة بن الافقم: قلت لعبيدة بنت كلاب – رحمها الله – ما تشتهين؟ قالت: (أشتهي الموت! قلت: ولم؟ قالت: لأنّي والله في كل يوم أصبح أخشى ان أجني على نفسي جناية يكون فيها عطبى ايام الآخرة).[2]

واتە: سەلەمەی كوڕی ئەفقەم دەڵێت: بە خوشكە عوبەیدەی كچی كیلابم وت: –حەز لە چی دەكەیت– ئێستا هەتبێت؟ فەرمووی: حەز دەكەم بمرم! وتم: بۆچی؟

---

١ صفة الصفوة (٢/٥١).

٢ صفة الصفوة (٢/٢٩).

فەرمووی: چونکە من سوێند بە خوا هەموو شەوێك کە ڕۆژ دەبێتەوە لەوە دەترسم ئەو ڕۆژە گوناهێك بکەم و بە هۆیەوە خۆشی و شادی ژیانی قیامەتم لە دەست دەربچێت.

ئەعمەشیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) قبووڵی نیە دکتۆرەکان بێنە سەری و چارەسەری بکەن چونکە حەزی لە مردنە، مردن!!..

* قال أبوبكر بن العياش: دخلت على – الاعمش – رحمه الله – في مرضه الذي توفي فيه، فقلت له: أدعو لك طبيباً؟ فقال: ما أصنع به!؟ فوالله لو كانت نفسي في يدي لطرحتها في الحش، اذا انا مت فلا تؤدينّ بي أحداً فاذهب بي فاطرحني في لحدي).[1]

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عەیاش دەڵێ: چووم بۆ سەردانی مامۆستا ئەعمەش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کاتی نەخۆشیەکەیدا کە بە هۆیەوە مرد، و پێم وت: قوربان چۆنە دکتۆرێکت بۆ بانگ بکەم؟ ئەویش فەرمووی: دکتۆر چی لێ بکەم؟! دە سوێند بە خوا ئەگەر گیانم لە دەستی خۆمدا بووایە تا دەستم دەگرێت تووڕم دەدایە ناو ئەو گژوگیایە، ئەگەر مردم ها! با کەس بە هۆی منەوە تووشی ئازار نەبێت! و بمبە هەڵمدەرە ناو گۆڕەکەمەوە.

برای خۆم تا من و تۆ لە مردن بترسین و لەرزمان لێ بێت بە تێپەڕبوونی تەمەنمان و سپی بوونی سەرو ڕیشمان، ناچینە کاروانی صاڵحانەوە و هەرگیز وەرمان ناگرن بە خزمەتکاری خۆیشیان!

گوێ بگرە بۆ عبدالله ی کوڕی موبارەك بزانە لە چ کاتێکدا پێکەنینی دێت!؟

* قيل: فتح عبدالله بن مبارك – رحمه الله – عينه عند الوفاة وضحك وقال: (لمثل هذا فليعمل العاملون).[2]

---

١ صفة الصفوة (٢/٧٧).

٢ صفة الصفوة (٢/٥٧٢).

واتە: دەڵێن: زانای موجاهیدو صاڵحی ئوممەت عبدالله ی کوڕی موبارەك لە کاتی سەرەمەرگداو لە کاتی گیان دەرچوونیدا چاوی کردەوەو پێکەنی‌و فەرمووی: بۆ ئەم ساتە وەختەیە کارکەران کردەوەی جوان دەکەن.

ئەڵلا ئەم ئیسلامە چەندە عەزیزە! ژن‌و پیاو فەرقی نیە! کێ ڕاست لێ بنەوێ‌و ڕێبازی خوا بە توندی لە باوەش بگرێت دەچێتە کاروانی صاڵحانەوە! نەك هەر ئەوەندە بەڵکو دەشبێتە سەرمەشقی بەرەکانی دوای خۆی‌و دەیکەنە پێشەواو مامۆستای خۆیان‌و ماجیدەی قورەیشی یەکێکە لەو خوشکە باوەڕدارە صاڵحانە:

* كانت ماجدة القريشية تقول: لو رأت عيون الزاهدين ثواب ما اعد الله لأهل الأعراض عن الدنيا لذابت أنفسهم شوقاً الى الموت لينالوا من ذلك ما املوه من تفضله تعالى).[1]

واتە: ماجیدەی قورەیشی دەفەرموێت: ئەگەر دنیا نەویست‌و زاهیدان ئەو پاداشتە گەورەیەیان دەبینی کە خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی پشت لە دنیا پەرستی دەکەن.. لە خۆشیاندا گیانیان دەردەچووە بۆ ئەوەی زووتر بمرن‌و بگەنە ئەو پاداشتە گەورەیەی پەروەردگاریان‌و ئەوەی هیوایان پێی بووە لە دنیادا.

زۆرجار وتوومە ڕێگەی صاڵحان زۆر قورس‌و پڕ لە بەرزایی‌و نزمایی‌و هەڵدێرو ئاسان نییە بە دوو کردەوەی جوان بمانەوێت پێیان بگەین بەڵکو ئەوان لەو کاروانەدا گوێ نادەنە جگەرگۆشەو ڕۆڵەکانیان بە بەرچاویانەوە بمرن خەفەتیان بۆ ناخۆن! نەك هەر ئەوە بەڵکو (مورق العجلی) لەوەش زیاتر دەڵێ! بزانین چی دەفەرموێت؟!

* قال المورق العجلي – رحمه الله –: (ما من امر يبلغني أحب اليّ من موت احب اهلي اليّ).[2]

---

١ صفة الصفوة (٦٩/٢).

٢ صفة الصفوة (١٦٧/٢).

واتە: مووەریق ی عەجەلی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)دەفەرمووێت: (هیچم ئەوەندەی ئەوە پێ خۆش نیە کە هەوالّی مردنی خۆشەویستترین‌و نزیکترین کەسم پێ بدەن.

(سبحان الله) ئەمە عومەری کوڕی عبدالعزیزە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)حەزێکی سەیری هەیە کە بەس شایانی سەرمەشقان‌و پێشەوایانی صالّحانە، و ئەوانەیشی کە بە نیازن بەرەو ئەو کاروانە موبارەکە هەنگاو هەلّبنێن‌و بچنە ڕیزی صالّحانی ئەم ئوممەتە چاکترینەوە، ئەو حەزەیش حەزکردنە لە سەکەراتی مردن واتە ئازاری گیان دەرچوون!!:

* قال عمر بن عبدالعزیز — رحمه الله —: (ما أحبّ ان یخفف عني سکرات الموت لانه آخر ما یرفع للمؤمن من الأجر).[١]

واتە: ئەمیری باوەڕداران‌و خەلیفەی چاکسازی پێنجەم (عومەری کوڕی عبدالعزیز) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: حەز ناکەم ئازاری گیان دەرچوونم لەسەر سووك بێت‌و سەکەراتم نەبێت چونکە ئەوە کۆتا ئەجرو پاداشتێکە کە باوەڕدار دەستی بکەوێت.

صالّحان لە سەرەمەرگیشدا هەر بیریان لە لای حەلاڵ‌و حەرامەو حەز ناکەن دووچاری حەرام بن! (سبحان الله)! سەیری باوەڕ لاوازەکانی ناوخۆشمان دەکەین کاتێ پێی دەلّێیت: فلاّن کار حەرامە مەیکە یان فلاّن شت حەرامە مەیخۆ! کەچی پێت دەلّێ: کوا حەلاڵ‌و حەرام ماوە بێ قەزا بیت!! پەنا بە خوا:

* ابی عمر بن عبدالعزیز — رحمه الله — الاّ أن یشتری موضع قبره من ماله الخاص، وذلك بسبب ورعه ومحاسبته الشدیدة لنفسه وقال لمن حوله — في مرض الموت: (اشتروا من الراهب موضع قبري).[٢]

١ عمر بن عبدالعزیز — دکتور الصلابي — (لا: ٢٩٥).

٢ هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

واتە: عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نەیهێشت جێگە قەبری بۆ بکڕن لە ماڵی دەوڵەت و داوای کرد لە پارەی تایبەتی خۆی بۆی بکڕن ئەمەش بە هۆی خۆ لە حەرام پارێزی و لێپرسینەوەی سەختی لەگەڵ دەروونیداو لە کاتی سەرەمەرگدا فەرمووی بە چواردەورەکەی: جێگە گۆڕەکەم بکڕن لە ڕاهیبە گاورەکە، و ئەگەر پارەی وەرنەگرت لە شوێنێکی تر بۆم بکڕن و گاورەکە وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت لێمان دوور ئەکەوێتەوە پارەمان لێ وەرنەدەگرت.

# سەرچاوەكان

١- قورئـانی پـیرۆزو تەفـسیرەكانی، في ظـلال القـران، تفـسير ابـن كـثير، صـفوة التفاسير.

٢- رياض الصالحين – ئیمامی نەوەوی.

٣- حياة الصحابة، كاندهلوی.

٤- صفة الصفوة، ابن الجوزي، چاپی دووەمی ساڵی ١٩٩٢

٥- الرقة والبكاء.

٦- الزهد، للامام أحمد، چاپی یەكەم ساڵی ٢٠٠٢.

٧- الجامع لشعب الايمان، للبيهقي.

٨- البحر الرائق في الزهد والرقائق.

٩- الرقائق، محمد احمد الراشد.

١٠ـ القبسات من تجارب الشعوب والأمم.

١١ـ تربية الاولاد في الاسلام، عبدالله ناصح علوان، چاپی یەكەم ١٩٨٤

١٢ـ حسن بن علي بن ابي طالب (رضي الله عنه)، د. علي محمد صلابي.

١٣ـ علي بن ابي طالب (رضي الله عنه)، د. علي محمد صلابي.

١٤ـ عمر بن عبدالعزيز (رضي الله عنه)، د. علي محمد صلابي.

١٥ـ ابو بكر الصديق (رضي الله عنه)، د. علي محمد صلابي.

١٦ـ عثمان بن عفان (رضي الله عنه)، د. علي محمد صلابي.

١٧ـ من روائع القصص، محمود طعمة.

١٨ـ جامع العلوم والحكم.

١٩ـ موعظة المؤمنين من أحياء علوم الدين.

ئەمانـەو كۆمـەڵێك سەرچـاوەی تـریش كـە لـە پـەراوێزی لاپـەڕەكانی ئـەم كتێبـەدا ئاماژەیان بۆ كراوە.

# بەرهەمەکانی نووسەر

١- چۆن ژیانی هاوسەریت بەختیار دەکەیت - وەرگێڕان‌و نووسین، چاپی یەکەم ١٩٩٥.

٢- هونەری هاوڕێ گرتن، وەرگێڕان‌و نووسین، چاپی یەکەم ١٩٩٤.

٣- (٥٠) هۆکار بۆ خۆپاراستن لە حەزو ئارەزووەکان، وەرگێڕان ١٩٩٨.

٤- چۆن بگەینە کاروانی صالّحان؟ نووسین، چاپی یەکەم ١٩٩٨.

٥- چەند ڕێنموونیەك بۆ مامۆستایانی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و دواناوەندی، وەرگێڕان ٢٠٠٢.

٦- ئافرەتانی صحابی ژیان‌و مردنیان بۆ ئیسلام، نووسین، ساڵی ٢٠٠٠.

٧- منداڵانی صحابی ژیان‌و مردنیان بۆ ئیسلام، نووسین.

٨- بەسەرهاتی بانگەوازو بانگەوازخوازێك - ژیاننامەی نووسەر - ١٩٩٧ ڕەشنووس.

٩- ئەبو بەکری صدیق، وەرگێڕان.

١٠- علی کوڕی ئەبو طالیب، وەرگێڕان.

١١- عومەری کوڕی عبدالعزیز، وەرگێڕان.

١٢- باخەوانێکی غەڕا، چیرۆکی قورئانی، نووسین، ڕەشنووس.

١٣- باخەوانی چروك، قورئانی، نووسین، ڕەشنووس.

١٤- جیهاد بە گەورەو بچووك نیە (فیلمی سینەمایی) نووسین، ڕەش نووس.

١٥- هاوڕێی بەهەشت، درامای تەلەفزیۆنی، وەرگێڕان، ڕەشنووس.

١٦- چارەسەری تاوان، شانۆنانە، نووسین (ڕەش نووس).

١٧- لە سورەتی یوسفدا دیومە! نووسین، چاپی یەکەم ٢٠٠٧.

١٨- دەروازەی خۆشنووسی، نووسین.

١٩- ئەم بەرهەمەی بەر دەستت، نووسین

# کورتەیەك دەربارەی نووسەر

نووسەر ناوی )عمر توفیق عبدالله)یەو نازناوی (عمر توفیق الخطاط)ی وەرگرتووە، چونکە لە هونەری خۆشنووسیدا دەستێکی بالآی هەیە، یەکێکە لە خۆشنووسە دێرینەکانی کوردستانو لەو بارەیەوە کوراسەیەکی نووسیووە لە ژێر ناوی (دەروازەی خۆشنووسی)و خاوەنی چەندان پێشانگاو خولی خۆشنووسیە لەو بوارەدا.

نووسەر لە ساڵی ١٩٦٧ی زاینی لە گەڕەکی (کانی عاشقان)ی شاری هەڵەبجەی شەهید چاوی بە دنیا هەڵهێناوەو قوتابخانەی سەرەتایی لە قوتابخانەی سەرەتایی ئایینی تەواوکردووەو پاشان دەچێتە دواناوەندی خوێندگای ئیسلامی لە شارەکەی خۆیو لە ساڵی ١٩٨٥ لە زانکۆی بەغداد لە کۆلێژی شەریعە وەردەگیرێتو پاش ساڵێك خوێندن بەهۆی کاری سیاسیو ملنەدان بۆ ڕژێمی ئەو سەردەمە لە کۆلێژ فەسڵ دەکرێتو لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨و لە پاش کیمیابارانکردنی شارەکەیان دەکەوێتە بەر لێبووردنی دەوڵەتو درێژە بەخوێندنی دەدات، تا لە ساڵی ١٩٩١ بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە شەریعەتی ئیسلامو زمانی عەرەبیدا دەهێنێتو پاش ئەوە بەردەوام بە کاری مامۆستایەتیەوە بەردەوامەو لە زۆربەی خوێندگاکانی هەڵەبجەدا وانەی وتۆتەوەو خزمەتی زانستو زانیاری کردووە.

نووسەر لە پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ەوە دەستی داوەتە نووسینو خزمەتکردنی ئایینی گەلو نەتەوەکەیو شەوی داوەتە دەمی ڕۆژ تا کۆمەڵێ نووسینو وەرگێڕان بخاتە بەردەستی گەنجو لاوی ولاتەکەیو بە فەزڵی خوا توانیویەتی سەرنجی خوێنەرانی بۆ لای نووسینە تەڕو پاراوەکانی ڕابکێشێتو ببێتە هۆی هیدایەت بۆ هەندێكو سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوی زانستیانەش بێت بۆ خوێندەوارو وتاربێژو ئامۆژگاران.

ئێستا نووسەر لە شاری هەڵەبجەی شەهید نیشتەجێیەو خاوەنی دوو کوڕو دوو کچەو بەردەوامە لەسەر کاری مامۆستایەتی‌و نووسین‌و وەرگێڕان.

بۆ هەر سەرنج‌و تێبینیەك دەتوانن پەیوەندی پێوە بکەن بەم ژمارە تەلەفۆنە:

٠٧٧٠١٩٩٨٤٧١


بڵاوکار

نارین بۆ چاپ‌و بڵاوکردنەوە

هەولێر

# ناوەڕۆك

بابەت — لاپەڕە

پێشەكی.......... ٥
بەشی یەكەم .......... ٩
ئەو پێنج خاڵەی صاڵحانی پێ ناسراوەو بە (دأب الصالحین) ناوبراوە: .......... ٩
یەكەم: (ذكر)و یادكردنی خوای (عز وجل) بە بەردەوامی .......... ١١
دووەم: گریانو فرمێسك ڕشتن لە ترسی خوای عز وجل .......... ٢٣
سێیەم: خۆشەویستی قورئان و دەوركردنەوەی بەردەوامی لە دیوانی صاڵحاندا.......... ٤١
چوارەم: شەو نوێژ... ئەی بەچێژترین و قورسترین بەندایەتی: .......... ٥٧
پێنجەم: ڕۆژووی سوننەت و ژیان لە خزمەت توێنێتی و برسێتیدا: .......... ٧٧
بەشی دووەم: صاڵحان چۆن سەیری خۆیان كردووە؟ .......... ٩٣
یەكەم: صاڵحان خۆیانیان بەدڵ نەبووە! .......... ٩٥
دووەم: خۆیان لە پلە و پایە و شورەت پاراستووە: .......... ١١٣
سێیەم: خۆیان بە نزم سەیركردووە: .......... ١٣١
چوارەم: صاڵحان خۆیان لە بیدعەكاری پاراستووە: .......... ١٥٥
پێنجەم: صاڵحان خۆیان لە ڕیابازی پاراستووە: .......... ١٧٧
شەشەم: صاڵحان خۆیانیان لە غەیبەت پاراستووە: .......... ١٩٥
بەشی سێیەم: صاڵحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لە نێوان چوار ترسدا دەژین: .......... ٢٠٣
یەكەم: ترسان لە خوای پەروەردگار لە لای صاڵحان: .......... ٢٠٥
دووەم: لە هاتنی ڕۆژی قیامەت ترساون: .......... ٢٢٧
سێیەم: لە ئاگری دۆزەخ زۆر ترساون: .......... ٢٤٥
چوارەم: صاڵحان لە فەتوادان ترساون: .......... ٢٦٧
بەشی چوارەم: چوار خۆشەویستەكەی صاڵحان: .......... ٢٧٥

یەكەم: صالحان خوایان زۆر خۆش دەوێت: ........................................ ٢٧٧
دووەم: صالحان ئەویندارى قورئانى كەریمن: ........................................ ٢٩٣
سێ یەم: خۆشەویستی پێغەمبەرى ئەكرەمی (ﷺ) لەلاى صالحان: ........................ ٣٠٧
چوارەم: صالحان موسلمانانیان خۆش دەوێت: ........................................ ٣١٩
بەشی پێنجەم: مزگەوت جێ ژوانگەى صالحان: ........................................ ٣٣٥
یەكەم: ڕیزو حورمەتی مزگەوت: ........................................ ٣٣٧
دووەم: صالحان نوێژى جماعەت بەهیچ شتێك ناگۆڕنەوە: ........................................ ٣٥١
بەشی شەشەم: زانا صالحەكان ئابەم جۆرەن: ........................................ ٣٦١
یەكەم: عیلم وەردەگرن بۆ كردەوە پێكردن: ........................................ ٣٦٣
دووەم: لە زانستدا تێربوونیان بۆ نیە: ........................................ ٣٦٧
سێیەم: شەو نوێژیان بەردەوام بووە: ........................................ ٣٧١
چوارەم: هەست بە گرنگی كات دەكەن: ........................................ ٣٧٣
پێنجەم: ڕێز دادەنێن بۆ زاناكانیان: ........................................ ٣٧٧
شەشەم: گوناه ناكەن: ........................................ ٣٨٧
حەوتەم: نابنە داردەستو مفتی كاربەدەستەكان: ........................................ ٣٨٩
هەشتەم: لە چلەپۆپەى نەرمو نیانیدان: ........................................ ٣٩٣
نۆیەم: هەمیشە دەم بە زیكرن: ........................................ ٣٩٥
دەیەم: بە لێشاو ماڵو سامان دەبەخشنەوە: ........................................ ٣٩٧
یانزەیەم: لەغیرەتو بوێریدا كەسیان پێ ناگات: ........................................ ٤٠١
دوانزەیەم: كارەكەیان زۆر بە گەورە سەیر دەكەن: ........................................ ٤٠٣
بەشی حەوتەم: صالحان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) بە سێ شتی ترسناك خۆشحاڵ دەبنو پێشوازى لێ دەكەن: ........................................ ٤٠٧
یەكەم: شەهیدبوونو گیان بەخشین بە پەروەردگار: ........................................ ٤٠٩
دووەم: پێشوازیان لە نەخۆشیو ئازار كردووە: ........................................ ٤١٩
سێیەم: پێشوازیان لە مردن كردووە: ........................................ ٤٢٧

